شوناسە بکوژەکان دروست ببن. هەندێجار ناتوانی بەرگەی کەسێکی دیکە بگریت کە لە ڕووی ئاین و زمانەوە لە تۆ جیاوازە، بۆیە سەری دەبڕی، یان لانی کەم ئاوات بە مردنی دەخوازیت.

مەعلوف دان بەوەدا دەنێت ئەو تەنها حاڵەتی لەم شێوەیە نییە، هەموو ئەو پەنابەرانەی وڵاتانی خۆیان جێهێشتووە و لە ئەوروپا نیشتەجێبوون، شوناسیان بووەتە شوناسێکی ئاوێتەیی یان دووفاقی. بۆ نموونە تورکێک لە ئەڵمانیا یان جەزائیرییەک لە فەرەنسا. زۆربەی ئەوانەی ساڵانێکی دوور و درێژە لە وڵاتانی پەنابەر دەژین، بگرە زۆربەی ئەوانەی لەوێ لەدایکبوون، ئایا تورکن یان ئەڵمان؟ ئایا ئەوانە جەزائیرین یان فەرەنسی؟ گەر بڵێین ئەڵمانین، ئەوا متمانەی وڵاتە ئەسڵییەکەی خۆیان لەدەستدەدەن و تورکیا وەک ناپاک یان وەک هەڵگەڕاوە لە ئیسلام ناویان دەبات. هەمان شت بۆ جەزائیرییەکان و مەغریبییەکان و تونسییەکان لە فەرەنسا ڕاستە و زۆرێک لەوانە لە وڵاتە ئەسڵییەکەی خۆیان بوونەتە شوێنی گومان. بەڵام گەر بڵێین ئەوان تورکن یان جەزائیرین، ئەوا وڵاتانی ئەوروپا گومانیان دەخەنە سەر و لێیان ڕازی نابن، چونکە پێیان وایە دڵسۆزی و وەلائیان بۆ وڵاتە ئەسڵییەکەی خۆیانە، نەک بۆ ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین و لە خێروبێرەکەی دەخۆن، ئەوانە تابوری پێنجەمن.

لێرەوە ئەمین مەعلوف دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە شوناس، بە پێچەوانەی ئەوەی لێی تێگەشتووین، پێدراوێکی حازربەدەست نییە، یەک جار و بۆ هەتاهەتایە درابێت. شوناس شتێکی چەقبەستوو نییە، بەڵکو شوناس شتێکە بە پێدراوی تازە دروست دەبێت و دەوڵەمەندتر دەبێت و بە درێژایی بوون لە وەرچەرخاندایە. مەعلوف پێیوایە ئەو تورکەی لە ئەڵمانیا پەنابەرە، گەر بە تەواوی هەردوو ڕەگەزە ئاوێتەییەکەی شوناسی وەربرگێت: واتە ڕەگەزی تورکی و ڕەگەزی ئەڵمانی، ئەوا نابێتە کەسێکی فێندەمێنیتاڵیستی دەمارگیر. هەمان شت بۆ جەزائیرییەکی فەرەنسی یان مەغریبییەکی فەرەنسی یاخود تونسییەکی فەرەنسی...هتد ڕاستە. تەنها گەنجە هەڵخڵەتاوەکان و فاشیلەکان، لە فەرەنسا، زۆر بە توندی ڕەگەزی دووەم، واتە ڕەگەزی ئەوروپی کە شوناسیان پێکدەهێنێت، ڕەتدەکەنەوە و دەبنە فێندەمینیتاڵیست، بگرە دەبنە جیهادییە خوێنڕێژەکان. بەڵام گەر وڵاتانی پەنابەر، هەلی کاریان بۆ برەخسێنێت و ڕێزی کەرامەتی مرۆڤانەیان بگرێت، دەبوونە خەڵکانی توندڕەو؟

دەکرێ هەمان شت سەبارەت بە کرواتییەک بڵێین کە ئافرەتێکی سربی هێناوە، ئەو ناتوانێت لە کوشت و برینەکاندا بەشداری بکات، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بەشێک لە کوشتنەکە بەر خۆشی دەکەوێت. لەوانەیە بەر خێزانە تایبەتەکەی خۆی بکەوێت، یان بەر خێزانی ژنەکەی بکەوێت، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا لە دۆڕاوەکانە. کەواتە ئیدی بۆ بەشداری لە کوشت و برینەکاندا دەکات؟ ڕەنگە هەندێک بپرسن: کرواتی مەسیحییە و سربی-ش هەر مەسیحیە، ئەی کەواتە بۆچی یەکتر دەکوژن؟ وەڵامەکەی ئەمەیە: چونکە ڕەچەڵەک و مەزهەب ئەوان لێکتر جیادەکاتەوە. ڕەچەڵەکی کرواتی هەمان ڕەچەڵەکی سربی نییە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زمانیان جیاوازە. جگە لەوە کرواتی کاسۆلیکە و سربی ئەرسەدۆکسە. ئاشکرایە دوژمنایەتی مەزهەبی لە نێوانیان

بەهێزە و هیچی لە دوژمنایەتی نێوان سونە و شیعە لە ئیسلامدا کەمتر نییە.
بەم شێوەیە دەبینین شوناس چەند ڕوخسارێکی جیاوازی هەیە نەک یەک ڕوخسار. بەڵام تێبینی دەکەین ئەو دوو ڕەگەزە سەرەکییەی کە کاریگەرییان لەسەر پێکهێنانی شوناس هەیە، بریتین لە: زمان و ئاین. مرۆڤ تا دوا سنور پەیوەستە بە دینەکەی (مەزهەبەکەی) و هەروەها بە زمانەکەیەوە. مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی لە لێکچوونە و ڕقی لە جیاوازییە، لەبەر ئەوە گەر لە دوورترین خاڵی سەر گۆی زەوی، شتێک بەسەر کەسێک لە مەزهەبەکەیدا بێت یان بەسەر کەسێکدا بێت کە بە هەمان زمانی ئەم دەدوێت، ڕاستەوخۆ هەست بە نزیکایەتی دەکات لەگەڵیدا.

## ئایا ڕاستە تەنها ئیسلام ئاینی دەمارگیرییە؟

بەشی دووەمی کتێبەکەی ئەمین مەعلوف تەرخانە بۆ ئەم پرسیارە، بگرە دەتوانین بڵێین تەواوی کتێبەکەی، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بۆ تەرخان کراوە. بگرە لەوەش زیاتر ئەو پرسیارە بووەتە خەمی هەموو خۆرئاوا و تەواوی جیهان، لە ئەمریکای باکورەوە بۆ ئەوروپای خۆرئاوا بۆ ڕووسیا و چین و هندستان... هتد. ئێمە لەو بڕوایەدابووین ئەمین مەعلوف بەو پێیەی مەسیحییەکی لوبنانییە و بە دەست هەیمەنەی ڕەهای ئیسلام بەسەر جیهانی عەرەبیدا دەناڵێنێت، ڕاستەوخۆ بە بەڵێ وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و حساباتی خۆی لەگەڵ دینی محەمەد یەکلایی دەکاتەوە! بەڵام ئەو پیاوە لەوە زیرەکترە بکەوێتە نێو قۆرتێکی لەم شێوەیە. لە ڕاستیدا پێچەوانەی ئەوە ڕوویدا.
مەعلوف گوێی بە برینەکانی و کەمینەییەکەی نەدا و هەمومانی دووچاری سەرسوڕمان و دەهشە کرد کاتی وتی ئیسلام لە جەوهەر و لە ئەسڵیدا ئاینێکی دەمارگیر نییە، زیاد لە ئاینەکانی تر. بگرە تا ئەو ئاستە ڕۆشت کە بڵێ ئیسلام بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاستی کۆن، لە مەسیحی زیاتر لێکبوردەتر بووە و بەدرێژایی سەدەکان کەمینەکانی جوولەکە و مەسیحی لە ئامێزی ئیسلامدا ژیاون. ڕاستە ئەوان هەمان ئەو مافانەیان نەبووە کە موسڵمانەکان هەیانبووە، بەڵام لە زۆر ماف بێبەش نەکراون. بە پێچەوانەی کەمینە ئیسلامییەکانی ئەوروپا کە لە ڕەگ و ڕیشەوە تەفروتونا کران، وەک ئەوەی لە ئیسپانیا و سقلییەی خواروی ئیتالیا ڕویدا. بێگومان لەم سەردەمەدا (زیمە- الذمي) چیتر شوێنی قبوڵکردن نییە، بەڵام لە سەردەمانی پێشودا، متمانە و دڵنیاییەک بووە بۆ پاراستنی مەسیحییەکان و جوولەکەکان. ڕاستە خۆرئاوا لە دوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە، واتە پاش ئەوەی مۆدێرنەی ڕۆشنگەری هەزمکرد و مافەکانی مرۆڤی گەڵاڵەکرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی کڵێسای کاسۆلیکی لە میانەی ڤاتیکانی دووەم و لە ساڵانی نێوان ١٩٦٢ بۆ ١٩٦٥ شۆڕشێکی لاهوتی گەورەی بەرپاکرد، لە ئێستادا لە جیهانی ئیسلام زیاتر لێکبوردە ترە.
لێرەوە خۆرئاوا لە ڕووی شارستانییەوە باڵیگرت و بۆڕێکی گەورەی جیهانی ئیسلامی دایەوە، هەر لێرەوە دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی، بە بەراورد بە خۆرئاوا، دەرکەوت. بەڵام ئەمە حاڵەتێکی سەرمەدی هەتاهەتایی نییە، وەک ئەوەی ڕاستڕەوی خۆرئاوا تێیگەیشتوون. ئەم واقیعە دواکەوتووە گوزارشت لە سروشتی ئیسلام یان لە

جەوهەرەکەی ناکات. ئیسلام لە تێڕوانینی ئەمین مەعلوف دا، ئاینێکی چەقبەستوو نییە، تەواو بە پێچەوانەی ئەوەی زۆرینەیەکی زۆر پێیانوایە ئیسلام ئاینێکی چەقبەستووە. ئیسلامیش دەتوانێ پێشکەوێت و گەشەبکات و شۆڕشی مۆدێرنە قبووڵ بکات، وەک ئەوەی مەسیحیەتی کاسۆلیکی، دوای ڤاتیکانی دووەم ئەنجامیدا. لێرەوە ئایندە لەبەردەم ئیسلامدا کراوەیە و لە ڕۆژانی داهاتودا دووچاری سەرسوڕمانمان دەکات. بەڵام مەسەلەکان لە حاڵی حازردا، ئەوە دەخوازێت دان بەوەدا بنێن کە بارودۆخی وڵاتانی ئیسلامی، هەرگیز جێگای دڵخۆشی نییە، بگرە بە ڕاستی جێگای نیگەرانییە. ئا لێرەدایە ئەمین مەعلوف ئەم پرسیارە یەک لە دوای یەکانە دەخاتەڕوو: ئەم هەموو حیجاب و باڵاپۆشییە بۆ؟ ئەم هەمو ڕیشە غەمبارە و هەندێجار پڕ و ترسناکە بۆ؟ ئەم هەموو وتارە ئاگراوی و بانگەشە توندانە بۆ کوشتن و سەربڕین لەپای چی؟ بۆچی لە مینبەری مزگەوتەکان و لە وتارەکانی ڕۆژانـی هەینیدا، هەموو مرۆڤایەتی تەکفیر دەکرێت؟ ئایا بە ڕاست ئیسلام، بە پێچەوانەی ئاینی مەسیحی، ئاینێکە ناتوانێت لەگەڵ مۆدێرنەدا ئاشتبێتەوە؟ ئایا بە ڕاست ئیسلام بە سروشتی خۆی و لە جەوهەریدا، دژ بە ئازادی و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی ژنان و ڕۆحی سەدەکانی مۆدێرنەیە؟

نووسەری مەسیحی ئەمین مەعلوف، بە (نەخێر) ێکی گـەورە وەڵامـی هـەمـوو ئـەو پرسیارانە دەداتــەوە. بگرە کۆمەڵێ پرسیاری پێچەوانە دەخاتە ڕوو: ئایا مەسیحییەت لە جەوهەردا ئاینی لێکبوردەیی و دیموکراسی و ڕێزگرتنی ئازادییە فەردییەکانە؟ بە (نەخێر)ێکی ڕوون و ئاشکرا وەڵامدەداتەوە. بۆچی بەو شێوەیە وەڵامدەداتەوە؟

لەبەر ئەوەی هێندە بەسە پەنا بەرینە بەر کتێبە مێژووییەکان تا لەوە تێبگەین مەسیحییەکان بە درێژایی بیست سەدەی ڕابردوو، بە ناوی ئاینەوە ئەشکەنجە و چەوسانەوە و کوشتارگای گەورەیان ئەنجامداوە. هەروەها بۆ ئەوەی تێبگەین باڵاترین دەسەڵاتەکانی کڵێسا، لەگەڵ بەشی هەرە زۆری ئیماندارە دیندارەکان، هەرگیز نـاڕازی نەبوون لە بازرگانیکردن بە کۆیلە ڕەشەکان و بە سوک تەماشاکردنی ئافرەت. بگرە بە تەواوی ڕاهاتبوون لەگەڵ دزێوترین ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان، وەک ڕژێمی فرانکۆ و سالازار و بینۆشییە. هەروەها بە ناوی مەسیحییەتەوە دزێوترین جۆری دادگاکانی پشکنینیان دامەزراند و ئازادی بیروڕا و ویژدانیان قەدەغە کرد. هەروەها چەندین جەنگی ناوخۆیی خوێناویان بەرپاکرد و یەکتریان تەکفیر دەکرد.

بڕوانە جەنگەکانی کاسۆلیک/پرۆستانت کە لە سەدەکانی شانزەهەم و بە تایبەت حەڤدەهەم، سەرتاپای ئەوروپای گرتبووەوە. بەڵام ئایا هەموو ئەوانە مانای وایـە مەسیحییەت لە جەوهەردا ستمگەرە و دژ بە ڕەشپێستەکان ڕەگەزپەرستە و دواکـەوتـووە و دەمارگیرە؟ نەخێر هەرگیز. هێندە بەسە تەماشایەکی چوار دەوری خۆمان بکەین، تـا ببینین مەسیحییەت لـە دەوڵـەتـە پێشکەوتووەکاندا بـە تـەواوی لـەگـەڵ ئـازادی بیرکردنەوە و گوزارشتکردن و مافەکانی مرۆڤ و دیموکراتی ئاشتبووەتەوە و دژ بە ڕەگەزپەرستی و تایفەگەرییە. ئایا پێویستە لەوەوە ئەنجامگیری بکەین و بڵێین جەوهەری مەسیحییەت بەم دواییانە گۆڕاوە یان ڕاستکراوەتەوە؟ یان بڵێین (ڕۆحی دیموکراتی) کە لە مەسیحییەتدا هەیە، بە درێژایی نۆزدە سەدە کرابوو بە ژێرەوە و داپۆشرابوو، تەنها لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە دەرکەوت؟

دواتر ئەمین مەعلوف بەردەوام دەبێت و دەڵێ: لەوانەیە پرسیارەکە بە شێوەیەکی هەڵە خرابێتە ڕوو، باشترە بەم شێوەیە بیخەینە ڕوو: ئایا دیموکراتی بە درێژایی مێژووی جیهانی مەسیحی، داواکارییەکی هەنووکەیی لەڕادەبەدەر بووە؟ بێگومان وەڵامەکە نەخێرە. بەڵام ئایا سەرەڕای ئەوە، دیموکراتی توانی لەو جیهانەدا کە کەلتوورەکەی مەسیحییە، جێگیرببێت و ڕەگداکوتێ؟ بێگومان وەڵامەکە بەڵێیە. ئەم پێشکەوتنە چۆن ڕوویدا؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە چەندین کتێبە! من تەنها ئەمە دەڵێم: گەر بە شێوەیەکی گشتی تەماشای مێژووی کۆمەڵگاکانی ئەوروپا بکەین، دەبینین دروستبوونی کۆمەڵگایەکی ئەورپی ڕێز لە ئازادییە دیموکراتییەکان بگرێت، وردە وردە هاتووەتە ئارا و بە تەواوی و بە یەکجار نەهاتووە، بەڵکو زۆر درەنگ هاتووە. هەروەها دەڵێم: گەر کڵێساکانی مەسیحی بەم پێشکەوتنە ڕازیبون، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی کڵێساکان بێ حەز و ویستی خۆیان پەیوەندیان بە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانەوە کردووە و کڵێساکان دەستیان نەبووە لە بەرپاکردنی ئەو بزوتنەوانەدا، بەڵکو بە ناچاری دوایان کەوتبوون. تەماشا بکە کڵێسای کاسۆلیکی بە درێژایی چەندین سەدە، تەکفیری مۆدێرنەی لیبرالیزمی کردووە. ئەو تەکفیرکردنە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، یان بۆ ئەوەی وردتربین تا سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمی خایاندووە. سەرەڕای ئەوە مەشخەڵی ڕزگاریخوازی لەلایەن خەڵکانێکەوە بەرزکرابوەوە کە دیندار نەبوون، یان زۆرجار لە دەرەوەی چوارچێوەی فیکری دینی بوون. بەشی هەرە زۆری فەیلەسوفانی مۆدێرنە دیندار نەبوون، بە مانا تەقلیدییەکەی وشەکە.

پاشان ئەمین مەعلوف دەڵێ:



ئەمین مەعلوف

لەوانەیە ئەم قسانەم بە دڵی ئەوانە بێت کە بە شێوەیەکی گشتی ڕقیان لە ئاینەکانە. بەڵام پێویستە لەسەرم بیریان بخەمەوە، لە سەدەی بیستەمدا، گەورەترین کارەسات و دەرد و بەڵاکان، لەلایەن دەمارگیری ئاینییەوە نەهات، بەڵکو لە لایەنێکی دیکەوە هات کە پەیوەندی بە ئاینەوە نییە. لەلایەن ئەو کەس و ئایدۆلۆژیایانەوە هات کە بە تـەواوی نەیاری ئاین بوون. مەبەستمان لەوە هێتلەر و ستالین-ە: واتە نازیزم و کۆمۆنیزم. دەکرێ مۆسۆلۆنی و فاشییەکانی دیکەشی بخەینە سەر. ئەو تاوانانە دەیان ملیۆن مرۆڤیان لەناوبرد. بەڵام لێرەدا دەبێ دان بەوەدابنێین لە سەرەتای حەفتاکانی سـەدەی بیستەمەوە، دەمارگیر کوێرانەی ئاین، ئەوە لە جیهانی هاوچەرخماندا تا ئێستاش، بەربڵاو و باڵادەستە.

## ئایا بەڕاست مەسیحییەت لە ئیسلام باشترە؟

بەشێوەیەکی گشتی خـۆرئـاوایـیـەکـان پێیان وایـە مەسیحییەت لە ئیسلام باشترە، بگرە ئـەوان پێیان سەیرە لە بنەڕەتەوە پرسیاری لـەو جـۆرە بکرێت و پێیان وایـە وەڵامـی ئەو پرسیارە پێویست بە چەندوچوون ناکات. بگرە بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی عـەرەب، ئەوانەیان بەشێوەیەکی ڕوکـەش و فشۆڵ مۆدێرنیستن، هەمان بیروڕایان هەیە. بەڵام ئەمین مەعلوف وا نییە، بلیمەتییەکەی و تایبەتمەندی کتێبەکەشی ئا لێرەدایە. ئەو بۆ سەلماندنی تێزەکەی کە دەڵێ هەموو ئاینەکان دەکرێ بە ڕێگای دەمارگیری یان بە ڕێگای لێکبوردەیی دا بڕۆن، ئەمەش بە پێی بارودۆخ و وەرچەرخانەکان، وەک بینیمان مەعلوف بۆ سەلماندنی ئەو تێزە، توێژینەوەیەکی بەراوردکاری لە نێوان ئیسلام و مەسیحییەتدا دەکات. ئەو پێیوایە مەسیحییەت لە سەدەکانی یەکەمەوە، لە قوربانییەوە گۆڕا بۆ جەلاد، ئەمە دوای ئەوەی لە سەردەمی حوکمڕانی قوستەنتین و دواتـر، بوو بە ئاینی فەرمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. بەڵێ مەسیحییەکان دوای ئەوەی بوونە خاوەنی دەسەڵات و هێز، لە قوربانییەوە بوون بە جەلاد. بە بیانوی بتپەرستی ئاینی کۆنی ڕۆمانی- یان قەدەغەکرد و کەوتنە دوای شوێنکەوتوانی ئەو ئاینە و کەسیان لێ نەهێشتەوە.

کەچی ئیسلام لە سەردەمی زێڕینی خۆی، واتە ئەو کاتەی بەغداد دواتر قورتوبە، بە ڕووناکی زانست و فەلسەفە و ئەدەبەکەیان، جیهانیان ڕووناک دەکردەوە، ئاینێکی لێکبوردە بوو. بەڵام بە چی دەچێ ئێمە گۆرانی بە شان و باڵی باو و باپیران و نەمرییە کۆنەکاندا هەڵدەین، کەچی ئێستامان تاریک و نووتەک بێت؟ کێ باوەڕمان پێدەکات ئیسلام ئاینێکی لێکبوردەیە، گەر ڕاهیبەکان لەلایەن فێندەمێنتاڵیستەکانەوە گۆشاوگۆش سەرببڕێن؟ بگرە بینیمان خـودی ڕۆشنبیرانی جەزائیر هەندێجار لەبەر چاوی منداڵەکانیان، دراونەتە بەر چەقۆ! کێ باوەڕ بەو وێنە نەمرەی ئیسلام دەکات، گەر گەشتیارەکان لە میسر و لە غەیری میسر، بدرێنە بەر دەستڕێژی کلاشینکۆف و بکوژرێن؟ لەبەر ئەم هۆکارەیە، بەم دواییانە چەمکی دەمارگیری کوێرانە، تەنها پەیوەست بووە بە ئیسلامەوە و خەڵکی ئەوەیان لەبیرکردووە کە مەسیحی لە ڕابردوودا چی کردووە. لێرەوە گەر کێشەکە لە نێو چوارچێوەیەکی مێژوویی بەر فراواندا نەبینین، ئەوا لە حەقیقەتی مەسەلەکان تێناگەین.

بەشێوەیەکی گشتی ڕۆشنبیرانی عەرەب ئەمەیان نییە: هەستی مێژوویی. ڕۆشنبیرانی عەرەب بە خێرایی حوکم بەسەر مەسەلەکاندا دەدەن و توانای ئەوەیان نییە مەسەلەکان بخەنە نێو دیدگایەکی بەراوردکاری دوور مەودا. بەڵام ئەمین مەعلوف، لەگەڵ ئەو هەموو هەڵچوون و تەقینەوە ئوسوڵی و ئیسلامییە هاوچەرخە، کەچی تەسلیم بە غەریزە خێڵەکییەکانی نابێت، بەڵکو پێمان دەڵێ: بە درێژایی هەموو ژیانم دژ بەو بیرۆکەیە تێدەکۆشم کە دەڵێ مەسیحی ئاینی لێکبوردەییە و ئیسلام ئاینی دەمارگیرییە. هەرگیز ئەوە ڕاست نییە مەسیحییەت ئاینی مۆدێرنە و ئازادی و دیموکراتییە و ئیسلام ئاینی کۆیلایەتی و ستمگەری و تاریکبینییە، ئەمە بە هیچ شێوەیەک ڕاست نییە. ئەم بیرۆکەیە هەڵەیە و مەترسیدارە، چونکە دەرگـای ئایندە لانـی کـەم، لـەبـەردەم ملیارێک موسڵماندا دادەخات.

بە مانایەکی تر مەعلوف خۆی لە نێو ئەم قەفەزە ئایدۆلۆژییە ئەزەلییەی نەیار بە ئیسلام، بەند ناکات، وەک ئەوەی کۆنزەرڤاتیڤە تازەکانی خۆرئاوا دەیکەن. تایبەتمەندی کەسێتی ئەمین مەعلوف ئا لێرەدایە، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی خۆرئاوا لە میانەی پاریسەوە، هەموو دەرگاکانی خۆی بۆ کردووەتەوە، دەکرا مەعلوف تەسلیمی مەیلی هێرشکردنە سەر ئیسلام ببێت کە لە خۆرئاوادا بەربڵاوە، بە تایبەت لە دوای ١١ سێپتێمبەرەوە، بەڵام مەعلوف ئەوەی نەکرد. فەرەنسا بەرزترین خەڵاتە ئەدەبییەکەی خـۆی پێبەخشی: خەڵاتی گۆنکۆر. بگرە بەم دواییانە بووە ئەندامی کۆڕبەندی نەمرەکان، واتە بووە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا. کەچی لەگەڵ ئەوشدا ڕازی نییە قسە بە ئیسلام بڵێت. وای چ کوڕێکی یاخییە.

ئـەو بە ڕاستی فەرەنسای خۆشدەوێت و بە بەشێکی دانەبڕاو لە شوناسی دادەنێت، ئەی چۆن ئەوە نییە بە زمانەکەی، (واتە زمانی فەرنسی)، شاکارە ئەدەبی و فیکرییەکانی دەنووسێت؟ ئەی چۆن ئـەوە نییە ئاو و شەرابە کۆنەکەی دەخـواتــەوە؟ ئـەوە نییە خـۆی لە کەلتوور و ئەدەبەکەی و فەلسەفەکەی هەڵهێنجاوە. بەڵام ڕەچەڵەکە عەرەبییەکەی خۆی لەبیر نەکردووە، چونکە عەرەبی زمانی دایکە و جیهانی عەرەبیش بەشەکەی دیکەی شوناسەکەیەتی، نەک بە تەنها لوبنان. ئەو لوبنانی، فەرەنسی، عەرەبییە. ئەو بە یەکجار هەموو ئەوانەیە. ئەو بە دوو زمان و دوو کەلتور خۆی دەوڵەمەند دەکات و هەست بە هیچ کێشەیەکیش ناکات. ئەو دوو کەسە لە یەک کەسدا.

لە ڕاستیدا ئەمین مەعلوف ڕازی نابێت بە ڕەهایی سەرکۆنەی ئیسلام بکرێت، وەک ئەوەی بەشی زۆری ڕۆشنبیرانی خۆرئاوا دەیکەن. ئەو بە ویژدانە و دادپەروەری خۆشدەوێت. ویژدان پێمان دەڵێت عەقیدەیەک نییە خۆی لە خۆیدا باش بێت و عەقیدەیەکی دیکە خۆی لە خۆیدا خراپ بێت. هەموو عەقیدەیەک لە ساتێک لە ساتە مێژووییەکانیدا، لە ڕێگای ڕاست لایداوە و خراپترین تـاوان و کــردەوەی توندوتیژی ئەنجامداوە. یان بڵێ شوێنکەوتوانی ئەو کارانەیان ئەنجامداوە. ئەمە وەک چۆن بەسەر ئیسلامدا جێبەجێ دەکرێت، ئاواش بەسەر مەسیحییەتدا جێبەجێ دەکرێت، بگرە بەسەر ئەوانەی کە پێیان دەوترێت ئاینە عەلمانییەکان، وەک کۆمۆنیزم و نازیزم و فاشیزم، بگرە تەنانەت لیبرالیزمیش، جێبەجێ دەکرێت. بۆمبە ئەتۆمییەکان چیان بە هێرۆشیما و ناکازاکی کرد؟ بۆمبە ئەمریکییەکان

چیان بە ڤێتنام کرد؟...هتد. جیاوازی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت ئەوەیە مەسیحییەت بەم دواییانە لەگەڵ مۆدێرنەدا ئاشتبووەتەوە، کەچی ئیسلام جارێ هێشتا ئاشتنەبووەتەوە. بەڵام وەک ئەمین مەعلوف دەڵێ لەسەر ڕێگای ئاشتبوونەوەدایە. ئەو شتێکی ئاوامان پێدەڵێ: مەترسن، ڕۆژێک دێت ئیسلام لەگەڵ مۆدێرنەدا ئاشتدەبێتەوە.

دواتر دانەری کتێبەکە پێداگری لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکات: ئیسلام بە تەنها بەرپرس نییە لەو توندوتیژی و تیرۆر و کارەساتانەی لە ئێستادا ڕوودەدەن. لە سەردەمانی دادگاکانی پشکنین و جەنگە ناوخۆییە بێ ئامانەکان، هەمان شتیان بە مەسیحییەت دەووت. جگە لە دین چەندین فاکتەری دیکە ڕۆڵیان هەیە. لەوانە فاکتەری سیاسی و ئابوری و دیمۆگرافی. لەوانە گەلانی عەرەب بەرامبەر بە خۆرئاوا خۆیان بە بچووک دادەنێن. لەوانە خراپی گەشەکردن و هەژارییەکی کوشندە کە گەلانی عەرەبی و بەشێوەیەکی گشتی ئیسلامی بە دەستیانەوە دەناڵێنن.

پاشان ئەمین مەعلوف پێمان دەڵێ: زۆرجار ڕۆشنبیران بایەخ بە کاریگەری ئاین لەسەر میللەتان و مێژووەکەیان و ژیانە کۆمەڵایەتییەکەیان دەدەن، بەڵام وەک پێویست بایەخ بە کاریگەری میللەتان و مێژوو لەسەر ئاین نادەن. ڕاستە دین کۆمەڵگا ڕەنگرێژ دەکات، بەڵام کۆمەڵگاش دین ڕەنگرێژ دەکات. ئەم بیرۆکەیە لە ڕۆژگاری زانای کۆمەڵناسی فەرەنسی «ئەمیل دۆرکهایم»ەوە سەلمێنراوە. مەسەلەکە گەشتووەتە ئەو ئاستەی دۆرکهایم بڵێ: دین کۆمەڵگایە. بە مانای ئەوەی گەر کۆمەڵگایەک بڕوای بە فیکرەیەک هێنا، ئەوا ئەو فیکرەیە لە ڕێگەی ڕەزامەندییەکی ڕەهاوە خۆی دەسەپێنێت، وەک ئەوەی ئەو فیکرەیە دینێک بێت گفتوگۆی لەسەر ناکرێت و دەستی لێوەنادرێت. لە هەموو ئەوانەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە کۆمەڵگای پێشکەوتووی ڕۆشن، بە ڕووناکی زانست و فەلسەفە، بە شێوازێکی میهرەبان و لێکبوردەیی لە دین تێدەگات. کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی نقوومبوو لە عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست و نەهامەتی و هەژاری کوشندە و زۆربوونی گەورەی دانیشتوان، بە شێوازێکی تاریکی ترسناک، لە دین تێدەگات. نوقتە سەری دێڕ.

## ئایا لە پێکهێنانی شوناسدا دین گرنگترە لە زمان یا بە پێچەوانەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، ئەمین مەعلوف شتێکی ئاوامان پێدەڵێ: لە پێکهێنانی شوناسدا، دوو ڕەگەزی سەرەکی هەیە کە کێبڕکێی یەکتر دەکەن، ئەوانیش: زمان و دین-ە. بێگومان گەر ئەو دوو ڕەگەزە پێکەوە کۆبوونەوە، ئەوا شوناسەکە بەهێز دەبێت و کێبڕکی یان ململانێ نابێت لە نێوانیاندا. بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پێکەوە کۆنابنەوە. ئیدی لەو کاتەوە کێشەکان دەستپێدەکات.

بۆ سەلماندنی ئەوەی دین بە تەنها بەس نییە بۆ پێکهێنانی شوناس، ئەم نموونەیە دێنینەوە: ئێمە هەموومان دەزانین بەشی هەرە زۆری عەرەب و تورک و کورد و ئێرانییەکان، سەر بە یەک ئاینن، ئەویش ئاینی ئیسلام-ە. بەڵام ئایا هەمان شوناسیان هەیە؟ بێگومان نەخێر. بۆچی؟ چونکە زمانیان یەک نییە و زمان لێکیان جیادەکاتەوە، هەروەها ناکۆکییە نەتەوەییەکانیش لێکیان

جیادەکاتەوە. گەر ئەوە نەبوایە، ئەوا بۆ نموونە ڕووباری خوێن لە نێوان تورکەکان و کوردەکان دا نەدەڕژا. ئەوانە هەموویان سەر بە ئاینی ئیسلامن، بگرە زۆربەی زۆریان ئیسلامی سونی-ین، بەڵام بە هۆی زمانەوە ڕقیان لەیەکە. کوردەکان وەک هەموو بونەوەرەکانی خودا زمانی دایکی خۆیان خۆشدەوێت و دەیانەوێت تورکیا دادنی پێدا بنێت و وەک زمانی تورکی لە قوتابخانەکاندا بخوێنرێت و فێریببن. بەڵام تورکیا نایەوێت زمانی کوردی هاوشانی زمانی تورکی دابنێت. هەمان شت بۆ عەرەب و ئێرانییەکان ڕاستە، گەورەیی کێشەی کورد ئا لێرەدایە.

لە بەرامبەردا زمان هەرچەندە گرنگ و بایەخدارە، بەڵام بەس نییە بۆ پێکهێنانی شوناس. بۆ نموونە لە بۆسنا هەموان بە هەمان زمان قسە دەکەن، چ سربییە ئەردەدۆکسییەکان یان کرواتییە کاسۆلیکییەکان یاخود موسڵمانەکان. بەڵام هەست ناکەن یەک نەتەوە پێکدەهێنن. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئاین یان مەزهەب لێکیان جیادەکاتەوە. هەمان شت بۆ عەرەبەکانیش ڕاستە، گەرچی مەسەلەکە لای عەرەب تۆزێک سوکترە.

عەرەبەکان هەموویان بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن و وەک زمانی دایک خۆشیاندەوێت. بەڵام کێشە ئاینی یان مەزهەبییەکان لێکیان جیادەکاتەوە. بگرە هەندێجار لە نێوانیاندا جەنگی ناوخۆیی بێ ئامان بەرپا دەبێت. تەماشای جەنگی ناوخۆی لوبنان و کوشتوبڕی نێوان موسڵمانە عەرەبەکان و مەسیحییە عەرەبەکان بکە. یان حاڵی حازر تەماشای ململانێی نێوان سونە و شیعە بکە کە خەریکە تەواوی ناوچەکە دەسوتێنێت. گەرچی ئەوانە هەموویان سەر بە هەمان زمان و هەمان قورئان و هەمان پێغەمبەر و هەمان ئەدەبی عەرەبی لە سەردەمی جاهیلییەوە تا ئەمڕۆن، بەڵام ناکۆکییە مەزهەبییەکانیان تا ئێستا ڕێگرە لە دروستکردنی یەکێتییەکی نەتەوەیی تۆکمە و پتەو، چ لە عێراق یان سوریا یاخود لوبنان یا سعودییە یا کوێت یا بەحرێن...هتد

دواجار بۆ دەرخستنی خەسڵەتی گرفتئامێز و دژیەکی شوناس، ئەم چیرۆکەی خوارەوە دەگێڕینەوە: دەڵێن لە ساڵانی پەنجاکاندا، لە ناوەندی ئیخوان موسلمین، ئەم دروشمە باوبووە: موسڵمانێکی پاکستان نەک مەسیحییەکی لوبنان!، واتە موسڵمانێکی پاکستانی لێمانەوە نزیکترە تا مەسیحییەکی لوبنانی. بەڵام دەکرا لەسەر دەستی موسڵمانە مۆدێرنەکان یان لەسەر دەستی قەومییەکانی عەرەب، دروشمێکی پێچەوانە باوبوایە: مەسیحییەکی لوبنانی نەک موسڵمانێکی پاکستانی! بۆچی؟ چونکە مەسیحییەکی لوبنانی هەمان زمانی دایک-ی هەیە و هەمان مەیلی قەومیانەی عەرەبی هەیە. کەچی موسڵمانە پاکستانییەکە، بۆ ئەوەی لێی تێبگەین یان قسەی لەگەڵدا بکەین، پێویستمان بە وەرگێڕە. بەم شێوەیە وەک دەبینن مەسەلەی شوناس زیاد لە پێویست ئاڵۆزە. پاشان گەر ئێمە لە سەردەمی مۆدێرنە یان لە عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاستدا بژین، ئەوا مەسەلەی شوناس بە شێوەی جیاواز دەخرێتە ڕوو.

**سەرچاوە:**

الاوان، ٢٠١٤/٢/٦

# میر و میری مۆدێرن

## خوێندنەوەیەکی پراکتیکی
## لەبارەی بیروڕاکانی مەکیاڤیلی و گرامشی

نووسینی: حمید عضدانلو
و. لە فارسییەوە: ب. ئاژان



مەکیاڤیلی

«لێگەڕێن هەموو حکومەتەکان بزانن کە ناتوانن بۆ هەمیشە پەیرەوی لە سیاسەتێکی جێی متمانە بکەن و بی ئاوارتن ئەبێت گومان لە هەموویان بکرێت»

مەکیاڤیلی

بەراوردی گشتی بیروڕاکانی مەکیاڤیلی و گرامشی پێویستی بەکات و شوێنیکی تر هەیە و لەم کورتەیەدا جێی نابێتەوە. لەبەرئەوە لێرەدا تەنها بەراوردی نووسینە بەناوبانگەکەی مەکیاڤیلی واتە میر (The prince) و یەکێک لە نوسینە بەناوبانگەکانی گرامشی واتە (میری مۆدێرن) (The Modern Prince) ئەکەین.

مەکیاڤیلی و گرامشی وەک زۆرێک لە سیما بەناوبانگەکانی بیری سیاسی، وتوێژی زۆریان وروژاند. هەندێک بڕوایان وایە مەکیاڤیلی شۆڕشێکی لە بیری سیاسیدا بەرپا کردووە، هەندێکی دی تەنیا بە دووبارەکەرەوەی ڕوانینە سیاسیەکانی سەردەمی دێرینی ئەزانن، بەڵام بە زمانێکی تر، هەندێکی تریش بڕوایان وایە مەکیاڤیلی لەبەر بەکارهێنانی چەمکەکان و میتۆدی تازە لە باسەکانیدا، نەک هەر سیمایەکی شۆڕشگێڕانەیە، بەڵکو شۆڕشێکیشی لە مێژووی فکری سیاسی و ئەخلاقیدا بەرپا کردووە. جیمز برنهام بڕوای وایە مەسەلەی سەرەکی لە سەردەمی یۆنانی دێرینەوە تا سەردەمی مەکیاڤیلی، جیانەبونەوەی تیورە سیاسیەکان لە تیورە ئەخلاقیەکان بووە. یەکێک لە تەفسیرەکان ئەوەیە مەکیاڤیلی هەوڵی جیاکردنەوەی ئەم دوانەی داوە. لای ڤیلاری «ئامانجی سەرەکی لێکۆڵینەوە و باسە زانستیەکانی مەکیاڤیلی پیشاندانی ئەو ڕێ و ڕیسایانەیە کە پەیوەندیان بە کار و ڕەفتارە سیاسیەکانەوە هەیە... ماهیەتی تێزەکانی مەکیاڤیلی پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی زانستی دەوڵەتداری بووە بۆ دروستکردنی گوڕانکاریەکی ڕاستەقینە لە کردارە سیاسیەکانی سەردەمی خۆیدا» .

مەکیاڤیلی شێوەی دەوڵەتداری سەردەمی خۆی ڕیسوا ئەکرد. هۆی ئەم بەکەم تەماشاکردنە، ئەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی بێ سەروبەر و خراپی ئیتاڵیای ئەو سەردەمە. گەرچی لە ڕوانینی مەکیاڤیلیدا «بەخت و چارەنوس فەرمانڕەوای نیوەی کردارەکانی ئێمەیە» . بەڵام «زۆرێک لەو کارەساتانەی ڕوبەڕوی جیهان ئەبێتەوە، بەرهەمی نا وریایی و بێهودەی و خراپی بەڕێوبردنی شتەکانە» .

لەنێوان مەکیاڤیلی و گرامشیدا جیاوازیەکی سەرەکی و بنەڕەتی لە هەڵسەنگاندن و ڕوانینیاندا بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن هەیە. سەرەکیترین ئەم جیاوازیانە لە جیهانبینی و شیوازی لێکۆڵینەوەی هەردووکیاندا بەدی ئەکرێت. گرامشی کە بیروڕاکانی سەرچاوەیەکی مارکسیان هەیە، لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا میتۆدی دیالکتیکی مارکس، واتە پەیوەندی دیالەکتیکی خود و بابەت، ناکۆکی چینایەتی، دترمنیزم و پراگماتیزم بەکار ئەهێنێت، کە نەک هەر قوتابخانەیەکی فکریە، بەڵکو قوتابخانەیەکی پراکتیکیشە. «پراکتیک بۆ گۆڕینی بونیادی کۆمەڵگای سەرمایەداری و هەروەها بۆ ئازادی مرۆڤ لە کۆتوبەندی وەبەرهێنان و نامۆبوون... بەڵام پێئەچێت مەکیاڤیلی هیچ ئاشنایەتیەکی لەگەڵ چەمکی وەک (وەبەرهێنان) و (ناکۆکی چینایەتی) نەبێت. مەکیاڤیلی ئامانجی سیاسی هەبوو، هەموو هەوڵیشی بۆ ئەوە بوو بەم ئامانجانە بگات. پایەوپلەی سەرەکی مەکیاڤیلی لە بیرکردنەوەی سیاسیدا ئەوەیە، هەوڵیداوە لێکۆڵینەوە لە سیاسەت بۆ خودی سیاسەت بکات. خاڵی دەرچونی مەکیاڤیلی لە کتێبی (میر) دا پاراستن و پارێزگاریکردنە لە جێگەی میر. ئەوەی مەکیاڤیلی بە دوایدا ئەگەڕێت دەرهێنانی ئەو بنەمایانەیە لە مێژووی ڕۆم کە ئەتوانێت ڕێنمایمان بکات بۆ تێگەیشتن لە بواری سیاسەت

له زەمەنی خۆمان یـان لەهەر زەمەنێکی تر.
مەکیاڤیلی بۆ گەیشتن بەم ئامانجە سەرنج لە ئـازادی گشتی نـادات و بـەدوای تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەی بـیـروڕای کەسانی تـردا نیە. بە دەربڕینێکی تر «میتودەکەی مەکیاڤیلی هەڵگری ئەو میتودانە نیە کە کۆمەڵناسانی ڕەفتارگەری مۆدێرن بە وردی پێناسیان کـردووە. مەکیاڤیلی هیچ تاقیگەیەک بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆی دروست ناکات، هیچ پرسیارنامەیەکی ئامادە نەکردووە، بە شێوەیەکی سیستماتیک وتوێژی لەگەڵ هیچ سیاسەتمەدارێکدا نەکردووە» . لێرەوە ئەکرێت ئەو ئەنجامگیریە بکرێت کە مەکیاڤیلی بەمانای وشەی ئەمرۆ، زانا یان بیریارێک نیە کە سودی لە میتۆدە «زانستیەکان» وەرگرتبێت.
هەموو هەوڵی مەکیاڤیلی ئـەوەیـە (ئەخلاقی گـشـتـی) (general , morality) لە (ئەخلاقی دەوڵەت یان حکومەت) (morality of state) جیابکاتەوە. مەکیاڤیلی لە زۆربەی لێکۆڵینەوەکانیدا بەتایبەتی لە میردا باسی (ئەخلاقی دەوڵـەتـی) ئەکات نـەک (ئەخلاقی گشتی). لەلایەکەوە هەوڵئەدات بواری سیاسەت لەو بوارانەی تر جیابکاتەوە کە پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە، و لەلایەکی ترەوە هەوڵئەدات یاسا و ڕێسا دەرونیەکانی سیاسەت بدۆزێتەوە کە بە بڕوای ئەو جیاوازە لە هونەر، مەزهەب، ئەخلاق و ئابوری. «مەکیاڤیلی بـەدوای شتێکەوەیە کە ئەمڕۆ ناوی ئەنێن سیاسەتی پەتی، و ئەیەوێت بنەماکانی تا ئەو شوێنەی ئەکرێت، لە دەرونی خودی سیاسەتەوە دەربهێنێت» . ئەگەر مەبەستی ئێمە لە ڕێبازی زانستی ئەمە بێت، ئەوا بەڕاستی ئەکرێت مەکیاڤیلی بە یەکێک لە گەورەترین بیریاران دابنیین کە سودیان لە میتۆدی زانستی وەرگرتووە.
لای مەکیاڤیلی سیاسەت ئەخلاقی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەو (سیستەمی ئەخلاقی گشتی) ڕەدناکاتەوە، بەڵام بڕوای وایە ئەخلاقی سیاسی خاوەنی خەسڵەتی تایبەت بە خۆیەتی. ئەوەی بۆ پاراستن و پاریزگاریکردن لە دەوڵەت پێویستە، هەر ئەم ئەخلاقە سیاسیەیە. پێئەچێت مەبەستی مەکیاڤیلی لە نووسینی (میر) جیاکردنەوەی بواری سیاسەت بێت لە سیماکانی تری ژیانی مرۆڤ.
مەکیاڤیلی لە شیکردنەوە سیاسیەکانی خۆیدا دوو پرسیاری سەرەکی ئەهێنێتە پێشێ: یەکەم چ شێوازێک بۆ پاراستنی جێگەی میر کاریگەرە؟ دووهەم ئەبێت چۆن ئەم بنەمایانە لە سیاسەتدا بەشێوەیەکی گشتی بەکاربهێنین؟. مەکیاڤیلی ئەو پرسیارانەش ناکات کە ئەمڕۆ لە پرسیارە سەرکیەکانی سیاسەتن: چ جـۆرە حکومەتێک بە گشتی گونجاوترە؟ چ پەیوەندیەک لە نێوان ئەخلاق و سیاسەتدا هەیە؟ حکومەتەکان ئەبێت چ شـێـوازێـک بـۆ خـۆشـگـوزەرانـی کۆمەڵایەتی بگرنەبەر؟ لە ناوەڕۆکی نووسینەکانی مەکیاڤیلیەوە بەدەست دێنین کە ئەو ئارەزوی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی دوای نەبووە، تەنیا بەدوای دۆزینەوەی بنەما پەتیەکانی سیاسەت و تێگەیشتن لە دنیای سیاسەت بۆ خودی سیاسەت بووە.
هەر قوناغێکی مێژووی مرۆڤ، خاوەنی بیروڕا و تێڕوانینی گشتی خۆی بـووە: پەیوەندی نێوان بیروڕا و تێڕوانینە گشتیەکانی مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو، باس و وتووێژەکانی هەر قۆناغێک، بەشێک لە دیبەیتی مێژووی بیرکردنەوە سیاسیەکانی پیکهێناوە.
لەم چەند دەیەی دواییدا دیبەیتی زۆر لەسەر ئەو مەسەلەیە بووە کە ئایا ئەبێت تیورەیەکی سیاسی

بەشێوەیەکی سەربەخۆ و لە چوارچێوەی شوێن و کاتی خۆیدا بخوێنینەوە، یان ئەبێت لە چوارچێوەی تێڕوانینە بەرجەستەکانی شوێن و کاتی هەنوکەدا بخوێنینەوە. مەبەستی من لێرەدا هەڵسەنگاندنی هیچ یەک لەم دوو ڕوانینە نیە، بەڵکو تەنیا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەم کە گرامشی کتێبی (میر) ی لەچوارچێوەی بیروڕا و تێڕوانینەکانی خۆیدا خوێندۆتەوە.

بە بڕوای گرامشی (میر) وتارێکی زیندووە لە زەمەندا کە «تیایدا ئایدۆلۆژیای سیاسی و زانستی سیاسەت بەشێوەیەکی دراماتیک ئاوێزان بوون و ئەفسانەیەکیان دروستکردووە... ڕەگەزی عەقڵانی ئەم ئەفسانەیە لە کەسایەتی سەرکردەی سوپادا (condottiere) بەرجەستە ئەبێت کە ئەویش وەک شێوەیەکی قاڵبی و نیمچە مرۆیی (anthropomorphic). سمبولی خواستی گشتی (collective will)ە» . ئەم (خواستە گشتیە) هەمان ئەو هۆکارەیە کە گرامشی بوونی بۆ زەمەنی خۆی بە پێویست ئەزانێت. بەڵام جیاوازی لەگەڵ مەکیاڤیلیدا ئەوەیە کە مەکیاڤیلی ئەم هۆکارەی بۆ یەکگرتنی ئیتاڵیا بە پێویست ئەزانێت و گرامشیش بۆ یەکگرتنی (چینی ڕەوا)، واتە چینی کرێکار. «جەختکردنی گرامشی نەک هەر لەسەر بەدەستهێنانی دەسەڵات، بەمانا لینینیەکەی، بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر پەیوەندی ڕەوایەتی بە ئامانجێکی ئەخلاقیەوە، ئامانجێک کە ئەرکی پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی لە ڕووی مێژووییەوە لە ئەستۆی چینی کرێکاردایە. واتە چینێک کە ئەگەرچی لە ڕووی کۆمەڵناسیەوە گەردونی نیە، بەڵام بۆ بەها گەردونیەکان تێئەکوشێت» .

تەفسیری گرامشی بۆ میری مەکیاڤیلی لەو تەفسیرە ئەچێت کە ویتفیڵد بۆی ئەکات. ویتفیڵد بڕوای وایە چەمکی (زەرورەت) کلیلی سەرەکی وتاری میر پێکئەهێنێت. لە دیدی ویتفڵدا ئەوە ڕێکەوت نیە کە مەکیاڤیلی نۆجار چەمکی زەرورەتی لە دوا سێ پەڕەی فەسڵی هەژدەدا لەژێر ناونیشانی «چۆن میرەکان بەڵێنەکانی خۆیان ئەپارێزن؟» بەکارهێناوە. ویتفیڵد بڕوای وایە ئەو خەسڵەتە زەرورانەی کە میرێک ئەبێت خاوەنی بێت، ئەو ئامرازانەن کە مەکیاڤیلی بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی، واتە یەکێتی ئیتاڵیا، بەکاری ئەهێنێت.

«وتاری میر دابەشبەکەن بۆ دوو بابەتی دەرەکی و ناوخۆی، ئەوکاتە ئەبینن ئەوەی لە هەموو شتیک زیاتر شایستەی سەرزەنشتە، پەیوەندی بە مەسەلە دەرەکیەکانەوە هەیە. ئەمە بەو مانایە نیە کە مەکیاڤیلی پێویستی ئەمەی بە دیدێکی شەیتانیانە دەرککردووە. ئەگەر ئەمانەوێت لە مەبەستی ڕاستەقینەی میر بگەین، ئەبێت وەک بانگەشەیەک تەماشای بکەین بۆ میرێکی ناوچەیی ئیتاڵیا بۆ ڕزگارکردنی» .

مەکیاڤیلی شکات لە نایەکبوون و پارچە پارچەیی ئیتاڵیا ئەکات. ئیتاڵیای سەردەمی ئەو لەبەردەم مەترسی یاخیبون و شۆرش و گۆڕانکاری بونیادی و خاوەن سوپایەکی لاواز بوو. «ئێوە ئەبێ لەوە تێبگەن کە لەم سەردەمانەی دواییدا پاش ئەوەی لە ئیتاڵیادا خەڵکی نکوڵیان لە ئیمپڕاتۆری کرد و پاپا جێگەیەکی زیاتری لە مەسەلە دنیایەکاندا بەدەستهێنا، ئیتاڵیا دابەشبوو بۆ چەندان دەوڵەت» . لای وتفیڵد «دەوڵەتی ئیتاڵیا لەبەردەم مەترسی هێرشێکدا بوو کە توانای ڕوبەڕوبونەوەی نەبوو، نەیئەتوانی لە بەرامبەریدا یەکبگرێت. فەرمانڕەوایەک نەبوو کە توانای ڕوبەڕوبونەوە پاشای ئیسپانیا یا ئیمپڕاتۆر یان تەنانەت پاشای فەڕەنسای هەبێت...» .

مەکیاڤیلی بە ڕوونـکـردنـەوەی واقعی زەمەنی خۆی، وێنەی سەرکردەیەک دروستئەکات کە بە بە دەسەڵاتی پێویستەوە توانای ڕوبەڕوبونەوەی دوژمنانی دەرەکی و یەکخستنی ئیتاڵیای هەبێت. بـە بـڕوای ماکس لرنر ئـەوکـارەی مەکیاڤیلی ئەنجامیدا «بەکارهێنانی واقعبینانەی دەسەڵاتە لە ناوەندەوە، شیوازێک کە بەهۆیەوە ئیتاڵیا ئەیتوانی یەکێتی خۆی بەدەست بێنێتەوە» .
ئەگەرچی لای هەندێک تەفسیرکار مەکیاڤیلی مامۆستای گەندەڵیە، بەڵام «تێڕوانینی گرامشی بۆ هەمان کتێب لە چوارچێوەی دیارکراوی مێژوویی خۆیدا، ئاشکراکەری ئەو ڕاستیەیە کە بناغەی شێوازی بە ڕوکـەش نائەخلاقیانەی مەکیاڤیلی، بۆ خوێندنەوەی واقعی سیاسی، لەسەر ماهیەتی هەوڵی ڕەوای مەکیاڤیلی ڕاوەسـتـاوە لەپێناوی یەکیتی ئیتاڵیادا» .

بە پێچەوانەی هەندێک تەفسیرەوە کە بڕوایان وایە دوا بەشی میر، بەشێک نەبووە لە بینای سەرەکی کتێبەکە و پاشان بۆی زیادکراوە، گرامشی بڕوای وایە کە «... دوا قسەی میر شتێکی لاوەکی، پەراوێزی یان جۆرێک درێژدادڕی نیە کە لە دەرەوە پەیوەست بێت پێوەی، بەڵکو ئەبێت بە بەشێکی پێویستی کتێبەکە دابنرێت... بەشێک کە تیشک ئەخاتە سەر هەموو کتێبەکە و وائەکات وەک (مانیفێستێکی سیاسی) دەرکەوێت» .
گرامشی وتاری میری مەکیاڤیلی وەک (ئەفسانەیەک) ئەخوێنێتەوە نەک وەک یۆتۆپیایەکی بێ ڕۆح یان تیزێکی عەقڵانی، بەڵکو وەک فانتازیایەکی واقعی و نا ئەبستراکت پێشکەش کراوە کە ئامانجی بریتیە لە ڕێکخستنی (خواستی گشتی) و وروژاندنی خەڵکێکی پەرشوبڵاو و دابڕاو» .
گـەرچـی مـیـری مەکیاڤیلی وەک (واقعێکی



گرامشی

مێژوویی) بوونی نەبووە، بەڵام مەکیاڤیلی لە دیدی گرامشیدا «فێرکارێکی زیهنی، سیمای ڕابەرێک، و سەرکردەیەکی ئایدیالە، بەڵام لە کۆتایدا ئەو ڕەگەزە هەستیار و ئەفسانەیانەی لە سەرتاسەری ئەم کتێبە بچوکەدا هەیە، هاوکات لەگەڵ کاریگەریەکی بزوێنەر و وروژێنەردا، سەرلەنوێ گەشە ئەکەن و وەک میرێکی (واقعی) ژیان بە بەرگیاندا ئەچێت» .

گرامشی هەوڵئەدات بەم تەفسیرەوە بۆ کتێبی میر، مەکیاڤیلی لەناو هەلومەرجێکی مێژوویی دیاریکراودا دەربهێنێت و بیگوێزێتەوە بۆ سەردەمی ئێستا. گرامشی هەوڵ ئەدات بە ڕەچاونەکردنی ئامانجی سەرەکی مەکیاڤیلی، هەمان (ئایدۆلۆژی ـ ئەفسانە) بۆ ئامانجێکی تەواو جیاواز بەکاربهێنێت. هەرچەند گرامشی گرنگیەکی زۆر بە هەلومەرجی مێژوویی زەمەنی مەکیاڤیلی نادات. بەڵام ناتوانێت بەتەواوی لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. مەگەر نەئەوەی هەلومەرجی مێژوویی مەکیاڤیلی کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی داناوە و باوەڕ بە پێویستی ئیتاڵیایەکی یەکگرتووی «خواستی گشتی لە تەفسیری گرامشیدا» لە دەرونی مەکیاڤیلیدا گەورە کردووە؟ ئەگەر ئیتاڵیا لەو سەردەمەدا یەکگرتوو بوو، پێویستی بە نووسینی کتێبی (میر) نەئەکرد و هەروەها پێویستی بە بانگهێشتکردن بۆ (میرێکی واقعی) کە ڕەمزی خواستی گشتی بێت، نە ئەبینرا. بۆ بەدەستهێنانی پیناسێکی گشتی بەمانای ئەمڕۆیی وشە لە (خواستی گشتی) و (خواستی سیاسی) «خواست وەک هوشیاریەک بەرامبەر بە زەرورەتی مێژوویی وەک دیاریکەری سەرەکی شانۆگەریەکی واقعی و کاریگەری مێژووی «، گرامشی چەندان پرسیاری مێژوویی ئەهێنێتە ئاراوە: «چ کاتێک ئەتوانرێت بگوترێت هەلومەرجێک بۆ گەشەکردن و پەرەسەندنی خواستی گشتی خەڵکی ـ نەتەوەیی بونی هەیە؟» یان «بۆچی لەسەردەمی مەکیاڤیلیدا دەسەڵاتیکی رەها لە ئیتاڵیادا نەبووە؟» بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە گرامشی ئەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەی هەلومەرجی مێژوویی. «لەمڕوەوە ئەبێت شیکردنەوەیەکی مێژوویی (ئابوری) لە بونیادی ئەو وڵاتەی جێی باسە، لەگەڵ پیشاندانی ئەو هەوڵانەی کە بەدرێژایی سەدەکان بۆ وروژاندنی ئەم خواستە ئەنجامدراوە و هەروەها ئەو هۆیانەی کە بۆتە هۆی تێکشکانی، بەدەستەوە بدرێت» .

وەک ئەبینین گرامشی خۆی سنوردار ئەکات بە هەلومەرجی مێژوویی. بەڵام جیاوازی سەرەکی گرامشی لەگەڵ زۆرێکی تردا ئەوەیە کە هەوڵئەدات زنجیرەکانی خۆی بپچڕێنێت و ئازادی خۆی لەبەرامبەر هەلومەرجی مێژوویدا بێسنور بکات. ئەو هەوڵئەدات ئازارە مێژوویەکان فەرامۆشبکات، و ئەیەوێت بونیادێکی تازە لە جێگەیەکی تردا ( لەزەمەنی خۆیدا و لەگەڵ هەلومەرجی خۆیدا) بونیاد بنێت و ئازادانە لەناویدا بژی. تەنیا شتێک کە گرامشی هوشیارانە هەوڵنادات خۆی لێ رزگار بکات، ئەو وانەیەیە کە لە مێژووەوە فێری بووە: بڕیاردان لەبارەی بونیادی تازەوە کە هەوڵی دروستکردنی ئەدات، لە ئەستۆی میری مۆدێرن واتە حیزبی شۆرشگێڕە، حیزبێک کە گرامشی خۆی یەکێکە کە داڕێژەران و دروستکەرانی (بەپێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە تەنها داڕێژەر و دروستکەری بیناکەی بوو).

بەپێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە لای گرامشی تەنیا «دواجار... خۆی بە بەشیک لە خەڵک ئەزانێت و لەگەڵیاندا ئەبێت بە یەک...» ، گرامشی هەر لەسەرەتاوە خۆی بە بەشیک لە چینی کرێکار ئەزانێت، و لەگەڵیاندا ئەبێت بە یەکێک و تا

دواسات لەگەڵیاندا ئەمێنێتەوە (چینی کرێکارێک کە لای گرامشی بە تاکە گروپێکی کۆمەڵایەتی ڕەوا ئەژمێرێت). هەروەها بەپێچەوانەی ئەو شیوازەی مەکیاڤیلی هەڵیئەبژێرێت بۆ ڕێکخستنی ئەم (خواستە گشتیە) و پیشاندانی کۆتاییەکی لەپێشەوە دیاریکراوی سیاسی، ئەوا شێوازی گرامشی شیوازێکی لێکۆڵینەوەیە لەسەر بناغەی ڕێسا و بنەماکان، پێوەرەکانی پۆلێنکردن و شێوەی کار دامەزراوە (کارێک کە بناغەکەی لەسەر خەسڵەت و ئەرک و پێداویستیەکانی تاکێک دامەزراوە). گرامشی کارەکەی خۆی لەسەر بناغەی خەسڵەت و ئەرک و پێداویستیەکانی چینی کرێکار ئەباتە پێشەوە.

بناغەی میری مۆدێرن بەپێچەوانەوەی (خواستی گشتی) مەکیاڤیلیەوە کە لەسەر بناغەی تاکێکی واقعی بونیادنراوە، چینی کرێکارە. لەلای گرامشی ئەم چینە نەک تەنها لە ڕووی چۆنایەتیەوە، بەڵکو لە ڕووی چەندیاتیشەوە تەنیا چینی ڕەوای کۆمەڵگایە، چونکە چالاکانە بەشداری لە ڕەوتی بەرهەمهێناندا ئەکات. میری مۆدێرن ناتوانێت کەسێکی هەقیقی یان کەسێکی واقعی بێت. ئەو ئۆرگانیزمێکە، ڕەگەزیکی ئاڵۆزی کۆمەڵگایە.»ئەم ئۆرگانیزمە هەمان حیزبی سیاسیە کە لە ژێر تیشکی پەرەسەندن و گەشەکردنی مێژوویدا ئامادە و پۆشتە و پەرداخ بووە» جیاوازی ئەفسانەی گرامشی و ئەفسانەی سورێل لەوەدایە کە گرامشی بە خولقاندنی میری مۆدێرن، چینی کرێکاری سنوردار ناکات بە مانگرتنێکی گشتی بۆ گەیشتن بە (خواستێکی گشتی) هەنوکەیی، بەڵکو میری مۆدێرن ئامرازێکە کە ئەو ئەیخاتە بەردەم چینی کرێکار و ڕێنماییان ئەکات کە بۆ بەدەستهێنانی باڵادەستی ئابوری و کۆمەڵایەتی سودی لێوەربگرن.

گرامشی ئەفسانەیەکی جیاواز لە ئەفسانەی مەکیاڤیلی دروستئەکات. ئامانجی دروستکردنی ئەم ئەفسانەیە نەک یەکێتی ئیتاڵیا، و نە یەکێتی هیچ نەتەوەیەکی ترە، بەڵکو یەکگرتنی چینێکی «ڕەوا و گەردونیە»، واتە چینی کرێکار. گرامشی هەوڵئەدات کارەکە بە ئامرازی هوشیاری و وروژاندنی سۆز و هەژان ئەنجامبدات. «سۆز و هەژان کە بەرهەمی بیرکردنەوەیە لەبارەی خودەوە، ئەگۆڕێت بۆ هەست و ئەنگێزە و دەمارگیری بۆ کار» . (خواستی گشتی) مەکیاڤیلی کە پاش شکڵوەرگرتنی سەرەتایی یەکسەر لەناو ئەچێت، لەسەر بناغەی خواستی یەک کەس دامەزراوە، و لەو شیکردنەوەیە دورە کە بناغەکەی چینە. بەڵام (خواستی گشتی) گرامشی بە بەستنی پەیمان لەنێوان خواستە هاوبەشەکاندا دروستبووە. لە دیدی گرامشیەوە پەیمانێکی وا «خواستی گشتی لە قۆناغە سەرەتایەکانی دروستبونیدا بەجێناهێڵێت» .

لای مەکیاڤیلی دەوڵەتێک کە بیناکەی خێرایە، «وەک هەموو ئەو شتانەی کە بە خێرایی گەشەیان کردووە، ناتوانێت بە قوڵی ڕەگ دابکوتێت و لقوپۆپی لێبێتەوە. لەمڕووەوە بە یەکەم تۆفان لەناو ئەچێت و خراپ ئەبێت» . مەکیاڤیلی بۆ پاراستنی دەوڵەتێکی لەم چەشنە پشت بە لێهاتوویی میرێک ئەبەستێت کە بتوانێت هەنگاوی پێویست بۆ پارێزگاریکردن لە شتێک هەڵهێنێت کە بەخت و چارەنوس خستوێتیە بەردەمی. بەڵام گرامشی لەبری پەنابردن بۆ یەک کەس و دەسەڵاتی بەخت و چارەنوس، پشت بە ئۆرگانیزمێک، واتە حیزب ئەبەستێت. گرامشی هەوڵئەدات بەم ئامرازە بەربەست و ڕێگر لەبەردەم ڕێگەی بەخت و چارەنوسدا دروستبکات و دەسەڵات و نفوزی

کەمبکاتەوە. گرامشی بە دامەزراندنی حیزبێکی لەم چەشنە، لەبری سپاردنی ئێمە بە تاکە کەسێک یان بەخت و چارەنوس، هەوڵئەدات هوشیارمان بکاتەوە. گرامشی هەوڵئەدات تێمانبگەیەنێت کە ئێمە ئەتوانین کۆنترۆڵێ چارەنوسی خۆمان، لە ڕێگەی عەقڵانیەوە و بێ ئەوەی پێویستمان بە بەخت و چارەنوس هەبێت، بەدەستەوە بگرین. ئەمە بەو مانایە نیە کە مەکیاڤیلی چارەنوسی ئێمە بە بەخت و چارەنوس ئەسپیرێت، ئەو بڕوای وایە کە «ئەو میرەی هەموو شتێکی خۆی بۆ بەخت و چارەنوس دابنیت، ئەوکاتەی بەخت و چارەنوس گۆڕرا، گەندەڵ ئەبێت و لەناو ئەچێت».

مێژوو شایەتی زۆر نمونەی ئەو (خواستی گشتی) ە بووە کە ماکیاڤیلی مەبەستی بوو. نەتەوەکان پاش پەرشوبڵاوبونەوە لەبەر هەر هۆیەک، هەست بەو پێوستیە ئەکەن کە ئەبێت یەکسەر یەکبگرن. بەڵام ئەزمونە مێژوویەکانی پیشانیان داوە کە ئەمجۆرە یەکێتیانە ئەوەندە بەردەوام نەبووە و هەر ئەوەندەی چینە باڵاترەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، لەناوئەچێت. بە بڕوای گرامشی « ئەبێ بۆ هۆی شکستە یەک لەدوای یەکەکانی هەوڵدان بۆ دروستکردنی (خواستێکی گشتی) نەتەوەییجەماوەی، لە بونی چینی جیاوازی کۆمەڵایەتیدا بدۆزینەوە...» . بۆ ڕێگری لە ناسەقامگیری ئەم یەکێتیانە، گرامشیش وەک مارکسیەکانی تر هەوڵئەدات کۆمەڵگا لە دەست گروپە کۆمەڵایەتیە نەگونجاو و ناچونیەکەکان ڕزگار بکات و کۆمەڵگایەکی بێ چین ڕێکبخات کە تیاییدا هەموان یەکسانن. گرامشی بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پێشنیاری چەندان ڕێگە ئەکات کە لای ئەو و مارکسیەکانی تریش لەگەڵ ئامانجدا گونجاو و لێکچووە. یەکێک لەو ڕێگایانەی پێشنیاری ئەکات گواستنەوەی دەسەڵاتە لە دەستەکانی تاک یان گروپە (نارەواکانەوە)، بۆ (دەستە بەهێز و ڕەواکانی) چینی کرێکار. لە دیدی گرامشیەوە ئەم گواستنەوەی دەسەڵاتە تەنها لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی میری مۆدێرن، واتە حیزبی شۆڕشگێڕەوە مومکینە. لەڕاستیدا گرامشی ئەیەوێت بڵێت کە (حیزبی شۆڕشگێڕ) هەمان میری مەکیاڤیلیە لەسەردەمی مۆدێرندا.

گرامشی بە پێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە لانیکەم لە وتاری میردا چەندان ئامراز ئەخاتە بەردەست میر بۆ پاراستن و دەسەڵاتی، هەوڵ بۆ دروستکردنی سیستەم و ڕێکخستنیکی کرێکاری ئەدات کە ڕەگوڕیشەی لە هوشیاری چینی کرێکاردایە.

بۆ تێگەیشتنی باشتر لە شیوازی شیکردنەوەی مەکیاڤیلی، ئەبێت لێکۆڵینەوە لەو مەسەلە و گرفتانە بکەین کە لەسەردەمی ئەودا هەبوون. لەسەردەمی مەکیاڤیلیدا پێکدادان و دوژمنایەتیەکی زۆر لەنێوان گروپە جیاوازەکانی کەنیسادا هەبوو. لەنێوان ساڵەکانی ١٤٩٨ تا ١٥١٢ میلادی خێزانی میدچی لەدەرەوەی سنوری دەسەڵات بوون. ئەم ساڵانە کاریگەریەکی گرنگیان لەسەر شێوەی بیرکردنەوەی مەکیاڤیلی دانا. لەم قۆناغەدا بەهۆی زیادبونی توندوتیژی لە کۆمەڵگای ئیتاڵیادا، تاکگەری زۆر بەهێزبوو. پەرەسەندنی کەسایەتی تاکەکان، ئازادی دەربڕین، هەوڵدان بۆ گەیشتن بە خواستە تاکەکەسیەکان و بەکورتی زۆرێک لە خەسڵەتەکانی تاکگەری، لە ئایدیالەکانی ئیتاڵیای سەردەمی ڕێنسانس بوو. ئەمجۆرە سروشتە باوە پەیوەندیەکی نزیکی بەوەوە هەیە کە مەکیاڤیلی ناوی ئەنێت فەزیڵەت. لەدیدی مەکیاڤیلیەوە فەزیڵەتی هەر کەسێک تا ڕادەیەک لە دەسەڵاتی دیاریکردن و جیاکاریدا، لە هەستی

بەرپرسیارێتی، کارکردن و دواجار لە دەسەڵاتی دەرخستنی خواستەکانی خوددا شاراوەیە. لێرەوە لە ڕێنسانی ئیتاڵیادا و لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی تاکگەرییەوە، ڕۆحێکی شاراوە هەیە کە لە مێژووی مرۆڤدا بێوێنەیە: تامەزرۆیەکی مەزن لانیکەم لای ژمارەیەک بۆ ژیان، ئارەزوی دەرخستنی خواستە تاکگەرییەکان، و تاڕادەیەک پچڕانی پەیوەندی بە ڕابردووەوە، واتە نەریتی پەتی. دیارە نابێت ئەو خاڵەش فەرامۆشبکەین کە لە ڕوویەکی تری ئەم دیمەنەدا، ئێمە شایەتی توندوتیژی، دوودڵـی، چاوەروانی نەریتی و ئەم شتانەین.

بە دەستپێکردنی ڕێنسانس لە ئیتاڵیا، ئارەزوو بـۆ جـیـاکـردنـەوەی بــواری گشتی و تایبەتی مەسەلە ئەخلاقیەکان، لە یەکەم تیورە سیاسیە مۆدێرنەکانیشدا دەسـت پێئەکات. ئەمە خۆی دەریئەخات کە هەلومەرجی مێژوویی دیاریکراو و هەروەها ئەو ڕوداوانەی لە ئیتاڵیای سەردەمی ڕێنسانسدا ڕویدابوو، کاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر بیروڕا و تیورە سیاسیەکانی مەکیاڤیلی.

خاڵێکی تـر کـە بـۆ تێگەیشتن لـە تـاوتـوێ و شیکردنەوەکانی مەکیاڤلی پێویستە، تێگەیشتنە لە تێڕوانینی ئەو بۆ چەمکی «بەخت». مەکیاڤیلی بەخت و چارەنوس بە «ڕووبارێکی بێ پـەروا» ئەچوێنێت کە «کاتێک شەپۆل ئـەدات هەموو زەویـە سافەکان بە ئـاو ئەپۆشێت، درەخـت و بیناکان لەناو ئەبات و زەوی خاکوخۆل ئەهێنیت و ئەبات... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک بێدەنگ و ئارامە، مرۆڤ ئەتوانێت بە دروستکردنی بەنداو و دیوار، خۆی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئامادە بکات. کەوابوو ئەگەر ڕووبارەکە بخرۆشێت، ئاوەکەی بۆ ئەو کەناڵانە ئـەڕوات کە بۆی ئامادەکراوە یان هێرشەکەی هێندە مەترسیدار نابێت» . کەوابوو لای مەکیاڤیلی بوونی مرۆڤ پێکهاتووە لە کردار و هەڵچون لە نێوان فەزیڵەت و بەخت و ئارەزودا. بە خوێندنەوەی نوسینەکانی مەکیاڤیلی بەتایبەتی وتــاری میر، ئەکرێت بـەو ئەنجامە بگەین کە مەبەستی پیشاندانی کارکردنی ئەمجۆرە کردار و هەڵچونانەیە (فعل و ئینفعال).

لـەسـەردەمـی گرامشیدا بەپێچەوانەی زەمەنی مەکیاڤیلی و سەرەتای سەردەمی ڕێنسانس ئیتاڵیا، جەختێکی زۆر لەسەر سروشتە چینایەتیەکان ئەکرا. لەژێر کاریگەری ئـەم سروشتانەدا بوو کە گرامشی تیورە سیاسیەکەی خۆی پەرەپێدا و فراوانی کرد. بە بـڕوای گرامشی «تاکگەری، دژی سیاسی بوونی ئاژەڵی، و گروپگەری، دژی سیاسەتە، و ئەگەر ڕاستیش سەرنج بدەین ئەبینین کە گروپگەری شێوەیەکی سەرپەرشتیاری تایبەتیە و لەڕاستیدا بێ بوونی ڕۆحی حیزبە، واتە بێ بوونی هەمان ڕەگـەزی سەرەکی ڕۆحی گشتیە» . لەم سەردەمەدا بە پێچەوانەی سەردەمی مەکیاڤیلیەوە کە پشت بە فەزیلەتی تاکەکەسی ئەبەسترا، تاڕادەیەک فەزیڵەتی چینایەتی گرنگی پەیداکرد بوو - جیاوازی چینایەتی، هەستی بەرپرسیاری چینایەتی، کارکردنی چینایەتیانە و دواجار ئەوەی کە چین، نەک تـاک، خۆی بەرجەستە ئەکات. «ئـەم ئۆرگانیزمە (چـیـن) بـە پەردەسەندنی مێژوویی دروستبووە و نوێنەرەکەی هەمان حیزبی سیاسیە: یەکەم خانەی بریتیە لە ڕەگوریشەی خواستە گشتیەکان کە هەوڵئەدات گەردونی و ڕەها بێت» . لە سەردەمی گرامشیدا جەختێکی زۆر لەسەر گەشەکردن و پەرەسەندنی خەسڵەتە چینایەتیەکان (دیارە زۆرتر لای مارکسیەکان)، گەشەکردنی هوشیاری چینایەتی، هەوڵدان بۆ گەیشتن بە خواستە چینایەتیەکان، و بەکورتی

زۆرێکی تر لە خەسڵەتە چینایەتیەکان ئەکرا.
مەکیاڤیلی بڕوای وابوو ئەبێت قەبوڵی بکەین کە هەموو مرۆڤەکان لەناوەڕۆکدا خراپن. لای مەکیاڤیلی هەموو حکومەتەکان، تەنانەت حکومەتە (باشەکانیش) درەنگ یان زوو ڕوو لە داڕمان ئەکەن و ئەڕوخێن. «لێگەڕێ هەموو حکومەتەکان بزانن کە ناتوانن بۆ هەمیشە سیاسەتێکی جێی دڵنیایی پەیڕەوی بکەن و بێ ئاوارتن ئەبێت گومان لە هەمووان بکرێت» . پێدەچێت ئامانجی مەکیاڤیلی لە نووسینی وتاری میر بریتی بێت لە دواخستنی ڕوخانی هەموو ڕژێمە (چ ڕەوا یان ناڕەوا)کان.
مەکیاڤیلی بە دوای ڕژێمێکەوەیە کە سەقامگیر و خۆڕاگر بێت. بە بڕوای ئەو سەقامگیری ئەبێتە هۆی دروستبونی ڕێکخستن و یەکێتی لە کۆمەڵگادا و ئەرکناسی و ئاشتی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ماکس لرنەر بڕوای وایە «سەردەمێک کە مەکیاڤیلی میری ئەنووسی، ئەبوو ئەو هەستەی هەبێت کە یەکیتی، دیموکراسیش بەدوا خۆیدا دێنێت» .
لای گرامشی بە پێچەوانەی دیدی مەسیحیەتی کلاسیکی و مەکیاڤیلیەوە، «... سروشتی مرۆڤ بە هۆی پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و مێژوویەکانەوە دروست بووە» .
وەک ئەبینین خاڵی دەرچونی مەکیاڤیلی و گرامشی بۆ لێکۆڵینەوە و تێگەیشتن لە سیاسەت، جیاوازیەکی بنەڕەتی هەیە. گرامشی زانستی سیاسەت بە «سروشتیکی ڕوو لە پەرەسەندن» ئەزانێت.
بە بڕوای گرامشی یەکێک لە کەموکورییەکانی لێکۆڵینەوەکانی مەکیاڤیلی ئەوەیە سیاسەت وەک کردارێکی سەربەخۆ بە بێ ڕەچاوکردنی مەسەلە ئەخلاقی و مەزهەبیەکان تاوتوێ ئەکات. بەڵام گرامشی بڕوای وایە «یەکێک لەکارە گرنگەکانی میری مۆدێرن ئەبێت ئەوە بێت سەرقاڵی مەسەلە



مەکیاڤیلی

ڕۆشنبیریەکان و پاکژی ئەخلاقی یان مەسەلە مەزهەبی یان جیهانبینیەکان بێت... میری مۆدێرن نە ئەتوانێت و نە ئەبێت شتێکی تر بێت جگە لە ئاموژگاریکەر و ڕێکخەری ڕیفۆرمی ڕۆشنبیری و ئەخلاقی» .

گرامشی بە پێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە بۆ گەیشتن بە (خواستی گشتی) واتـە یەکیتی ئیتاڵیا، تەنها پشت بە بڕیارەکانی میرێکی بە فەزیلەت ئەبەستێت، بـڕوای وایـە کە خواستی گشتی ـ نەتەوەیی ـ جەماوەری و پاکژی ئەخلاقی و ڕۆشنبیری، «ئەبێت بەشێوەیەکی دراماتیکی لە گوتارەوە سەرچاوە بگرێت و تەنها دەربڕینیکی لۆژیکی خۆبادان نەبێت» . لەو ڕووەوە کە تاکەکانی ژێـر کۆنتڕۆڵی میری مەکیاڤیلی توانایەکیان بۆ زیادکردنی دەسەڵاتی میر یان بۆ نەیارێتی لەگەڵیدا نیە، گرامشی ئەم دەسەڵاتەی (هەرچەند ئەفسانەئامیز) ئەخاتە دەست چینێکی (ڕەوا)وە، بۆ ئەوەی بتوانێت هەم دەسەڵاتی میر زیاد بکات و هەم لەکاتی پێویستدا بە گژیدا بچێتەوە.

تەفسیری گرامشی بۆ بیرکردنەوەی مەکیاڤیلی ئەوەیە کە ڕێگەیەک ناخاتە بەردەم ئەو کەسانەی لە پێشەوە ئەزانن چۆن دۆخی خۆیان بپارێزن، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕێگە بە کەسانێک پیشان ئەدات کە نازانن و ئەبێت هەندێک ئامرازی پێویست بۆ دەستگەیشتن بە هەندێک ئامانج بناسنەوە. لە دیدی گرامشیدا ئەم هەڵوێستەی مەکیاڤیلی لە مارکسیزمیشدا دووبارە بۆتەوە. لێرەوە وەک مارکسیەک (تیورە و شێوەیەکی سیاسەت) پەرەپێئەدات کە «ئەتوانێت یارمەتی هــەردولای ململانێکە بـدات، بـەڵام دواجـار زۆرتر یارمەتی ئەو لایەنە ئەدات کە نەیزانیووە، چونکە لایەکەی تری ململانێکە، هێزەکانی پێشەڕەوی مێژوو (واتە چینی کرێکار) هەیە» .

بـە پێچەوانەی سـەردەمـی مەکیاڤیلیەوە کە ناسیۆنالیزم بە ئایدۆلۆژیای پێشرەو ئەزانرا و مەکیاڤیلیش هەوڵی گەشەکردنی ئەدا، لەسەردەمی گرامشیدا هێزی پێشرەوی مێژوو پرۆلیتاریا بـوو. ئەگەر مەکیاڤیلی سەرقاڵی ئامادەکردنی ئامرازێک بوو بۆ هوشیارکردنەوەی هێزەکانی ڕێنسانس، گرامشی هەوڵێئەدا ئامرازێک نەک هەر بۆ هوشیارکردنەوەی هێزە پێشرەوەکان، بەڵکو بۆ پرۆژەی مێژوو دەستەبەر بکات. لەکاتێکدا بۆ مەکیاڤیلی بەدەستهێنانی حکومەت و پرۆسەی پاراستن و پاریزگاریکردن لێی (بە هەر نرخێک) دوو ڕووی یـەک شت بـوون، ئـەوا بۆ گرامشی دەسەڵاتگرتنە دەسـت و پـروسـەی ڕەوایـەتـی بەخشین پێی، بە دوو سیمای یەک واقعیەتی ئاشکرا ئەژمێران.

هەم مەکیاڤیلی و هەم گرامشی بە باشی ئەزانن کە لەنێوان فەرمانڕەوایان و فەرمانبەران و ڕابەران و پەیڕەویکەراندا ماوەیەک هەیە. گرامشی هـەوڵـئـەدات «هەلومەرجێک بێتە ئـاراوە کە پێویستی ئەم ماوەیە لەناوبچێت». بۆ گرامشی مـاوەیـەکـی لەمچەشنە «تەنها هەقیقەتێکی مێژووییە کە وەڵامدەرەوەی هەندێک هەلومەرجە» . پێدەچێت مەکیاڤیلی نە ئارەزوی ئەوەی هەبوو بێت ڕەگوڕیشەی ئەم ماوەیە بدۆزێتەوە و نە بەئارستەی دۆزینەوەی نهێنیەکانی هیچ جوڵەیەکی کـردووە. بـەڵام لای گرامشی «...ئـەم ماوەیە بەرهەمی دابەشبونی کـارە، واتە هەقیقەتێکی تەکنیکیە» گرامشی بڕوای وایە کە بەشداری خەڵک لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بەستراوە بـە پـەرەسـەنـدن و گەشەکردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە. ئەم پەرەسەندن و گەشەکردنە خۆی لەو هۆکارانەیە کە خەڵک ناچار بە بەشداری

لەم پرۆسەیەدا ئەكەن. بە دەربڕینێكی تر ئەم پرۆسەیە بەشێكە لە ژێرخانی ئابوری.

گرامشی وەک ماركسیەک بــڕوای بــەوە هەیە «دابەشكردنی كار بەشێوەیەكی شاراوە دەربڕی ئـەو ڕاستیەیە كە چالاكیە فكری و مادیەكان (كـار و گەمەكردن، بەرهەمهێنان و مەسرەف) بە تاكی جیاواز سپێراوە و تەنها كارێكی شیاو بۆ ڕێگرتن لە دروستبونی دژایەتی لەنێوانیاندا، نەفیكردنی گۆڕانی دابەشكردنی كارە» . بە بڕوای گرامشی تەنانەت شێوە جیاوازەكانی موڵكایەتیش لەڕێگەی بڵاوبوونەوە و گەشەكردنی دابەشكردنی كـارەوە دروستئەبن. بۆ نموونە بۆ دۆزینەوەی سنوری گەشەكردنی هێزەكانی بەرهەمهێنانی نــەتــەوەیــەک، ئەبێت پـلـەی دابـەشـكـردن لەو كۆمەڵگایەدا بدۆزینەوە. لای گرامشی پەیوەندی مـرۆڤ و سروشت و هەروەها پەیوەندی مرۆڤ و بەرهەمهێنان، بە هۆی دابەشكردنی كـارەوە دیاریئەكرێت. ئەویش وەک ماركس بڕوای وابوو «دابەشكردنی كار لەو ساتەوە دەستپیئەكات كە دابەشكردنی كاری فكری و مادی پەیدا ئەبێت» . ئەوەی گرامشی هەوڵ ئەدات بیدۆزێتەوە ئەو هۆیانەیە كە ئەبنە هۆی دروستبونی ماوە لە نێوان فەرمانڕەوایان و فەرمانبەران، و لەنێوان ڕابەران و پەیڕەوانیاندا. بە پێچەوانەی زۆرێک لە بیریاران و ڕەنگە بە پێچەوانەی مەكیاڤیلیەوە، گرامشی بڕوای بەوە نیە «لەگەڵ دروستبونی گروپ و یاساكانیدا، ملكەچیش خۆبەخۆ و بە بێ ئەوەی پێویست بە زەرورەت و عەقڵانیەتی هەبێت، یان بە بێ ئەوەی پێویستی بە لێكۆڵینەوە و وتوێژ هەبێت، دروست ئەبێت» .

گرامشی بە پێچەوانەی مەكیاڤیلیەوە كە تاڕادەیەک سەرزەنشتی بەخت و چارەنوس بۆ دروستبونی ئەم ماوەیە ئەكات، هەوڵئەدات سەرچاوە و دەور و گرنگی ئەم ماوەیە، بە پێی گوڕانە ئابوری - مێژووییەكان بدۆزێتەوە. ئەو سیستەمەی گرامشی ئەیەوێت بیناسێنێت، سیستەمێكی یەكپارچەیە كە ناكریت بەشێكی لە بەشەكانی تر جیابكرێتەوە. بۆ نموونە چەمكەكانی وەک وەبەرهێنان، خواستە چینایەتیەكان و زێدەبایی (كە بۆ مەكیاڤیلی هەستپێكراو نیە)، بە جیا لە دابەشكردنی كار و ماوەی نێوان فەرمانڕەوایان و فەرمانبەران نیە. لەو ڕووەوە كە گرامشی سەبارەت بە شێوەی مەسەلەكە و نەخشەكەی، هوشیاریەكی زیاتری هەیە، ئەكرێت وا چــاوەڕوان بكرێت كە بۆ چارەسەركردنی، هوشیارانەتر هەنگاو بنێت. لە دیدی گرامشیدا مرۆڤ بونەوەرێكی مێژوویە و لە پروسەی دروستبوندایە. لەبەرئەوە زانین، واقعیەت و بابەتیبونی ئەم ماوە و دابەشبونی كارە، هەمیشە یەكسان نامێنێتەوە. ئەمە بە ناچار بەو مانایە نیە كە گرامشی چاوەڕی ئەكات ئەم گۆڕانە دەرئەنجامی سروشتی ڕوداوە سروشتیەكان بێت، بە پێچەوانەوە، گرامشی بڕوای وایە لەناوبردنی ئەم ماوەیە، بەرهەمی هەوڵ و بەرنامەڕێژی هوشیارانەی مرۆڤە. گەرچی ڕەنگە ڕاست بێت كە «پەیڕەوی كردن لە كەسانی تر كاریكی سادە و ئاسانە، بەڵام فەرمانرەوایەتی بەسەر چارەنوسی خوددا كارێكی زەحمەتە» . بەڵام لای گرامشی ئەم شتە پەیوەندی بە هوشیاربوونی خەڵكەوە هەیە بەرامبەر ئەو هەلومەرجەی لەناویدا ئەژین. گرامشی بە ناساندنی میری مۆدێرن وەک ڕێگەچارەیەک بە ستایشكردنی پرۆسەی لەزەت بەخشی فەرمانرەوایەتیكردن بەسەر خـوددا، (هەرچەند بەگران) هەوڵ بۆ هوشیاركردنەوەی چینێک ئەدات كە بە بڕوای ئەو ڕەوایە.

پێشنیارەكەی گرامشی بەپێچەوانەوە مەكیاڤیلیەوە

کە پێئەچێت پێشنیارەکانی بۆ هەموو حکومەت و دەوڵەتێک یەک شت بێت، ئەوەیە «کە میری مۆدێرن ناتوانێت یەک کەس بێت، بەڵکو ئەبێت حیزبێکی سیاسی بێت، واتە حیزبێکی تایبەت کە لەسەردەمی جیاواز و لە پەیوەندیە دەرونیە جیاوازەکانی نەتەوە جیاوازەکاندا، ئامانجی (کە لەڕووی مێژوویی و عەقڵانیەوە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دروست بووە)، دۆزینەوەی دەوڵەتیکی تازە بێت» . بە پێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە لە پرۆسەی دامەزراندنی دەوڵەتیکدا ئەو ئامرازانە ئەخاتە بەردەست کە بە زەرورەت لە پەیوەندیدا نین بە ئامانجەوە، لای گرامشی ئامرازەکان و ڕێگەکانی هەڵبژاردنیان بۆ گەیشتن بە ئامانج، دەستنیشانکەر و گۆڕانکاری پێکەری ئامانجن. لە دیدی مەکیاڤیلیەوە خەڵک، ئەرستۆکراتەکان، سوپا و ئەوانی دی تەنها ئامرازێکن کە بە هۆی میرەوە بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە حکومەت بەکار ئەهێنرێن، و لەبەرئەوەی ئەم ئامرازانە خەسڵەتی جیاوازیان هەیە، پێشنیارەکانی مەکیاڤیلی بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە تەنها لە ڕووی تەکنیکەیەوە جیاوازە: «میرێک کە بە یارمەتی ئەرستۆکراتەکانەوە بە میری بگات، بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتی خۆی کێشەی زۆرتری ئەبێت، تا ئەو میرەی بە هۆی خەڵکەوە بە دەسەڵات گەیشتبێت» . خەڵک هەم بۆ مەکیاڤلی و هەم بۆ گرامشی گرنگیان هەیە. بەڵام ئەم گرنگیە لای مەکیاڤیلی زۆرتر ڕەهەندێکی چەندایەتی هەیە. «بە هۆی گرنگی چەندایەتیانەوە هەرگیز میر ناتوانێت لەبەرامبەر ئاپۆرەی خەڵکدا کە دژی ئەون، خۆی زامن بکات» . بە پێچەوانەوە ئەو گرنگیەی گرامشی بە خەڵک (بەتایبەتی چینی کرێکار)ی ئەدات جگە لە ڕەهەندی چەندایەتی، ڕەهەندی چۆنایەتیشی هەیە، ئەمەش تەنها لەبەر بەشداری چالاکانەیانە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا. بە دەربڕینیکی تر ئەو ڕەوایەتیە باڵایەی مەکیاڤیلی بە خودی میری ئەدات و دەوڵەتی لەسەر بونیاد ئەنێت، گرامشی ئەیخاتە ئەستۆی حیزبی شۆڕشگێڕ.

وەک لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، ئامانجی سەرەکی مەکیاڤیلی پاراستن و پارێزگاریکردنە لە میر. مەکیاڤیلی بناغەی دەوڵەت لەسەر خودی میر دائەمەزرێنێت و هەموو ئامرازەکان بۆ ئامانجی خۆی بەکار ئەهێنێت. لای مەکیاڤیلی هەرشتێک لەم زەمینەیەدا سودمەند بێت، ڕەوایە و پاساوی هەیە. میری مەکیاڤیلی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، ئەبێت سوپایەکی زۆر دیسپلینکراو و وەفادار دروست بکات. ئەمە یەکێکە لە کاریگەرترین ئامرازەکان کە مەکیاڤیلی ئەیخاتە بەردەست میر. تەنها پاش دامەزراندنی سوپایەکی وایە کە یاسا (باشەکان) وردە وردە دروست ئەبن، چونکە «لە جێگەیەک کە تەجیهیزاتی سەربازی باش نەبێت، یاسای باش بوونی نابێت و لەو شوێنەشدا کە تەجهیزاتی سەربازی باش هەیە، بە ناچار یاسای باش بەدوای خۆیدا ئەهێنێت» . لای مەکیاڤیلی یاسا و زۆر دوو شێوەی جەنگکردنن کە «یەکەمیان شێوەی مرۆیی و دوهەمیان شێوەی ئاژەڵی هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی شێوەی یەکەم بە شێوەیەکی ئاسایی ناکاریگەرە، ناچار و لە پێویستیدا ئەبێت پشت بە شێوەی دوهەم ببەسترێت. لێرەوە بۆ میرێک پێویستە کە بەکارهێنانی هەردوو شێوەکە بە باشی بزانێت، هەم شێوەی مرۆیی و هەم شێوەی ئاژەڵی» .

لەو ئامرازە کاریگەرانەی تر کە میری مەکیاڤیلی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی بەکاری دێنێت، فێڵە. بۆ میری مەکیاڤیلی پێویستە کە «فێر بێت

چۆن باش نەبێت» . ئەو ئەبێت بزانێت کە چۆن ئەتوانرێت ببێت بە ئاژەڵێک، کرادر و ڕەفتارەکانی لە پەیوەندیدا بە هەلومەرجەکاندا، ئەبێت وەک ڕێوی یان شێرێک بێت. کەوابوو بۆ میر، زۆر و فیڵ دوو ڕووی یەک کردارن. ئەو ناتوانێت یەکێکیانی بێ ئەوی تر هەبێت.

وەک ئەبینین یاسای زۆر و فێڵ ئامرازیکن کە لەلایەن میرەوە بەکار ئەهێنرێن بۆ سەقامگیرکردنی ڕێکخستن و ئاشتی لە کۆمەڵگادا. بەڵام ئەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە ئەمجۆرە ڕێکخستن و ئاشتیە نابێتە هۆی بەختیاری خەڵک و تەنها ئەبێتە هۆی بەختیاری میر. میر ڕێگەپێدراوە یاساکان بە ئارەزوی خۆی بگۆڕێت. ئەو ئەتوانێت گەر ویستی بەرپرسیارە فەرمیە حکومەتیەکان لەسەر کار لاببات و کەسی تر لەبریان دابنێت. میر تەنانەت ئەتوانێت بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی و حکومەتەکەی، خەڵک بکوژێت. «...کاتێک ناچار ئەبێت کەسێک بکوژێت، وازی لی بێنن، بە مەرجێک هۆیەکی ڕوونی بۆ ئەنجامدانی ئەمکارە هەبێت» . یەکێک لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی میری مەکیاڤیلی ئەبێت ڕەچاوی بکات، بەدەستهێنانی خۆشەویستی خەڵکە. «بۆ میر گرنگە خۆشەویستی خەڵک بەدەست بهێنێت، چونکە جگە لەمە ناتوانێت لە هەلومەرجی گرفتئامێز و بەدبەختیدا پەنایان بۆ بەرێت» . بەدەستهینانی ئەم خۆشەویستیە بەمانای ئەوە نیە میر وەفادارە بۆ خەڵک یان ئەبێت وەفادار بێت، بەپێچەوانەوە ئەو تەنیا سود لە خەڵکی وەک ئامرازێک وەرئەگرێت، بۆ گەیشتن بە خواستەکانی خۆی. «فەرمانڕەوایەکی وریا کاتێک خەڵکەکەی بە ئاراستەی گەیشتن بە ئامانجەکانی ناجوڵێنەوە، نابیت وەفادار بێت بە بەڵێنەکانی» .

میری مەکیاڤیلی زۆر ئاگای لە دەسەڵاتی خەڵک هەیە. ئەزانیت گەر خەڵک هەست بە دەسەڵاتی خۆیان بکەن، هیچ شتێک ناتوانێت ڕێگەیان لێبگرێت، لێرەوە هیچ ئومێدێکیش بۆ پاراستنی پێگەی بەرزتری میر نامێنێتەوە. لەبەرئەوە ئەرکی میری مەکیاڤیلی بێ ئاگاکردنی خەڵکە لە دەسەڵاتەکەیان. بۆ ئەمکارە میر سود لە هەموو ئامرازە هەبوەکان و بەتایبەتی هێزی سەربازی وەرئەگرێت، بۆئەوەی خۆی بە ڕەوا پیشان بدات. وەک ئەبینین لای مەکیاڤیلی خەڵک تەنها کۆمەڵێک ئامرازێک بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە میر و پێگەکەی، سودبەخشن. بە بڕوای مەکیاڤیلی بۆ پاراستنی پێگەی میر هەموو کاریک ڕێگەپێدراوە چونکە «...ئامانج پاساو بۆ ئامراز ئەهێنیتەوە» . گرامشی بە پێچەوانەی مەکیاڤیلیەوە کە دەوڵەت و حکومەت بە ئامانج دائەنێت، دەوڵەت بە ئامرازێک زیاتر نابینێت. گرامشی بناغەی حکومەت لەسەر چینی کریکار دائەنیت و بڕوای وایە کە «دەوڵەت ئامرازێکە بۆ پاساوهێنانەوە» . ئەو ئامرازەی گرامشی بەکاری ئەهێنیت حیزبی شۆڕشگێڕە. میری مۆدێرن وەک حیزبەکانی تر کە تەنیا نوێنەری یەک گروپی کۆمەڵایەتین، نوێنەری خواستەکانی پرۆلیتاریا واتە «ڕەواترین گروپی کۆمەڵایەتی لە هەموو کۆمەڵگاکان»ە. بە پێچەوانەی میری مەکیاڤیلیەوە، ئەرکی سەرەکی میری مۆدێرن «...لەناوبردن و سڕینەوەی ماوەی چینایەتیە» لەبەرئەوە «ئەنجام و خاڵی کامڵبونی (واتە دەوڵەت) لەوەدایە کە بوونی خۆی لەدەست بدات، چونکە چیتر چینەکان و نوێنەرەکانیان بوونی نابێت» .

جیاوازەی سەرەکی گرامشی و مەکیاڤیلی لەوەدایە کە گرامشی پەیوەندیەکی تەنگاوتەنگ و ئاڵۆز لە

نێوان ئامراز و ئامانج (حیزبی شۆڕشگێڕ و خەڵکی کرێکار)دا دروست ئەکات. هەم ئامراز و هەم ئامانجی گرامشی لە خەڵکی (ڕەوا-چینی کرێکار) پێکدێت. گرامشی لەلایەکەوە، حیزبی شۆڕشگێڕ کە نوێنەری ئەم چینەیە وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی هەڵئەبژێرێت، و لەلایەکی ترەوە ئەم ئامرازە بەئاراستەی ئامانجێک پەیوەندیدار بە خۆیەوە، واتە بەدەستهێنانی سەرکەوتنیکی (ڕەوا) بۆ خەڵکێکی (ڕەوا) ئەجوڵێنێت. بە دەربڕینێکی تر میری مۆدێرنی گرامشی ئەگەرچی بە شێوەیەکی ئەفسانە ئامیز، لە خەڵکی کرێکار پێکدێت. لێرەوە گرامشی هەوڵئەدات بە ئایدۆلۆژیا - ئەفسانەی خۆی ماوەی نێوان ئامانج و ئامراز لەناو بەریت. ئامانج خەڵکە و ئامرازی گەیشتن بەم ئامانجەش هەر خەڵکە. گەرچی لـەڕووی مێژووییەوە ئەم ماوەیە هەرگیز لەناو نەچووە، بەڵام لای گرامشی وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد «حەماسەت و هەژانی بەرهەمهاتوی بیرکردنەوە لەبارەی خودەوە، ئەگۆڕێت بۆ هەست و پاڵنەر و دەمارگیری بۆ کارکردن»

گرامشی بەهیچ شێوەیەک نیازی نیە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا، بکاتە جێنشینی دیکتاتۆری میری مەکیاڤیلی. دیکتاتۆری پرۆلیتاریا لای گرامشی تەنها ئامرازێکە بۆ لەناوبردنی ماوەی چینایەتی. گرامشیش هـەم ئاگای لـەو خاڵە هەیە و هەم مەترسی ئەوەی هەیە «... بە شۆرشی پرۆلیتاریا بەسەر سەرمایەداریدا، ئەو مەترسیە بێتە پێشێ کە چینێکی بیرۆکراتی ئولیگارشی لەژێر ناوی پرۆلیتاریادا دروست ببێت» . هەر لەبەرئەمەشە گرامشی زۆر جەخت لەوە ئەکات میری مۆدێرن لە پرۆسەی پەرەسەندنی خۆیدا، خۆی تەرخان بکات بۆ ڕێکخستنی خەڵک و هوشیارکردنەوەیان بەو دەسەڵاتەی کە هەیانە. ئەگەر چینی کرێکار هوشیار بێت بە دەسەڵاتی بەهێز و ڕەوای خۆی و لە لەزەتی کۆنترۆڵی چارەنوسی خۆی تێبگات، هیچ میرێک ناتوانێت فەرامۆشیان بکات. ئەمە ڕێک بەپێچەوانەی تێڕوانینی مەکیاڤیلیەوەیە کە بڕوای وایە «...کەسێک کە فەرامۆش ئەکات، هەمیشە ئـەو کەسانە ئەدۆزێتەوە کە ڕێگەی پێئەدەن فەرامۆشیان بکات» . ئەگەر چینی کرێکار هوشیار بێت بە دەسەڵاتی خـۆی، نە ڕێگە بە دەوڵـەت ئەدات کە خۆی لێی جیا بکاتەوە و نە ڕێگە ئەدات چینێکی بیرۆکراتی ئۆلیگارشی بەسەریدا زال بێت. گرامشی وەک مارکسیەک بڕوای وایە کە «مرۆڤ بەشێوەیەکی ناچاریانە ئەو مەسەلانە بۆ خۆی ئەهێنێتە پێشێ، کە توانای چارەسەرکردنیانی هەیە» . ئەو مەسەلەیەی گرامشی ئەیخاتە پێش خـۆی، دروستکردنی حیزبێکی شۆڕشگێڕە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی پرۆلیتاری. لای گرامشی دروستکردنی حیزبێکی لەمچەشنە نەک موعجیزە نیە، بەڵکو پرۆسەیەکی گەشەکردن و پەرەسەندنە. «ئەمە خۆی هەڵگری سەردەمێکی ئامادەکاریە کە ڕێکخستن و پڕوپاگەندە لەخۆ ئەگرێت»

لای گرامشی ڕیفۆرمی کلتوری و فکری بێ نرخترین گروپی کۆمەڵایەتی، ناتوانێت «بێ ریفۆرمی ئابوری» ئەنجامبدرێت. گەرچی ڕیفۆرمی کلتوری و فکری خۆی لە ڕیفۆرمی ئابوریەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام پەیوەندیەکی دیالەکتیکی لەنێوانیاندا هەیە، لە شوێنێکدا کە یەکسانی هەلەکان نیە، چۆن چینی (رەوا)ی کرێکار ئەتوانێت کلتوری خۆی گەشە پێبدات؟ لە جێگەیەکدا کە تەنها ژمارەیەکی کەمی خەڵک هەموو ئامرازەکانی بەرهەمهێنانیان کۆنترۆڵ کردبێت و موڵکایەتی تایبەتی لەدەست ژمارەیەکی کەمدا بێت کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن، کارێکی

گومڕاهکەرانەیە کە بڵێین ئەتوانین بە (خواستێکی گشتی) هەمیشەیی بگەین. ئایا ئەکرێت گەشەکردنی کلتوری و ڕۆشنبیری چینی کرێکار، بە بێ بوونی دادی کۆمەڵایەتی و یەکسانی ئابوری وێنا بکریت؟ لە جێگەیەکدا کە کەمایەتیەکی بچوک بەسەر زۆرینەیەکی (ڕەوا)دا باڵادەستە، ئایا ئەکرێت چاوەڕێی (خواستیکی گشتی) بنەرەتی بکرێت؟ گرامشی بە هێنانە ئارای پرسیاری لەمجۆرە، باڵابوونی ڕوکەشانەی شارستانێتی گروپی بێنرخی کۆمەڵگا ڕەد ئەکاتەوە. سەرنجدان لەو خاڵە گرنگە کە ئامانجی میری مۆدێرن نەک هەر باڵادەستی ئابوری، بەڵکو «باڵادەستی سیاسی - ئەخلاقی چینی کرێکارە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا و دەسەڵاتگرتن بەسەر دەوڵەتدا» .

میری مۆدێرنی گرامشی وەک میری مەکیاڤیلی لە پرۆسەی گەشەکردنیدا ئەبێت دەستبکات بە دروستکردنی هێزێکی سەربازی. بەڵام بە پێچەوانەی سوپای میری مەکیاڤیلیەوە کە ئامانجی سەرکوتکردنی هێزە زیندوەکانی کۆمەڵگایە بۆ پاراستنی میر و دەوڵەتەکەی، ئامانجی سوپای میری مۆدێرن «ڕاگرتنی هێزە کۆنەپەرستەکانە لە چوارچێوەی یاسادا و پێشخستنی جەماوەرە دواکەتووەکە بۆ ئاستیکی یاسایی تازە» . پۆلیسی میر تەنیا بەکارهێنانێکی جێبەجێکاری هەیە، بەڵام کارکردنی پۆلیسی میری مۆدێرن ئیداری و بیرمەندانەیە.

گرامشی وەک مارکسیەک ئەزانێت «هەر حکومەتێک دیکتاتۆری چینێکە بەسەر چینەکانی تردا». گرامشی ئەزانێت تا ئەوکاتەی بوونی حکومەتێک پێویست دەرکەوێت، کۆنترۆلی مرۆڤیش لەڕووی مێژووییەوە پێویستە، و تا ئەوکاتەی مرۆڤ پێویستی بەوەیە کۆنترۆڵ بکرێت، ئەو پێویستیەش هەیە کە ڕابەر یان ڕابەرانێک هەبن. مەسەلەی سەرەکی لای گرامشی بەرجەستەکردنی فیزیایی کاری فەرمانڕەوایەتی نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بیر لە سروشتی پەیوەندی نێوان ڕابەران و حیزبی کرێکاری ئەکاتەوە. بەپێچەوانەی کاری فەرمانڕەوایەتی میری مەکیاڤیلیەوە کە بە سروشتێکی سەربازیانە ئەناسرێتەوە، کاری میری مۆدێرن سروشتێکی مێژوویی و ئۆرگانی هەیە. ئەبێت گروپی ڕابەرایەتی میری مۆدێرن لە بەشیکی چینی کرێکار دروست ببێت. ئەوان ئەبێت نوێنەری قوڵترین خواستەکانی ئەم چینە بن.

لە کۆتایدا و بەکورتی ئەکریت ئەو ئەنجامە وەرگرین کە گرامشی بە سودوەرگرتن لە ئەفسانەی میری مەکیاڤیلی و تەفسیرکردنی، هەوڵیدا ئەفسانەیەکی تر دروستبکات کە لەگەڵ هەلومەرجی مێژووی سەردەمی مۆدێرندا هاوئاهەنگ بێت و بگونجێت. گرامشی بۆ ئەمکارە لەلایەک وتاری میر وەک ئامرازێک بەکار ئەهێنێت، و لەلایەکی ترەوە هەوڵ بۆ ئاوەژووکردنەوەی ئەدات. لە دیدی گرامشیەوە ئاوەژووکردنەوەی تیورەی سیاسی مەکیاڤیلی پێویستی بە لەناوبردنی هەلومەرجی زیهنی و بابەتی دەوڵەتە دروستکراوەکەیەتی و گۆڕینی لەڕێگەی دروستکردنی هەلومەرجی زیهنی و بابەتی تازەوە، بۆ خاڵی دەستپێکردنی (مێژووی ڕاستەقینە) بۆ مرۆڤ.

---

**سەرچاوە:**

حمید عضدانلو: گفتمان و جامعه. تهران. نشر نی، چاپ اول ۱۳۸۰

# شیعر و لەدایکبوون و مەرگی زمان

**نووسینی: عەلی محمد حەق شناس**
**و. لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار**

مەرگی زمانەکان مەرگێکی ڕەمزی و لەدایکبوونیشیان، لەدایکبوونێکی سەرسووڕهێنەرە. زاوزێی زمانەکان بە ئاشکرا و خێرا و لەناکاو ڕووئەدات بە چەشنێک هەموان سەریان سووڕئەمێنێ و لە چاوتروکانێکدا، زمانێک لەدایک ئەبێت و جێگە بە زمانێکی تر لێژ ئەکات، زمانێک کە چیتر جگە لە مردن چارێکی دیکەی نیە. بە پێچەوانەوە مردنی زمانەکان بە نهێنی و درێژخایەنە و سەدان ساڵ پێش لەدایکبوونی زمانی تازە، هێشتا هەر گیان بە دەستەوە نادات و پەلەقاژە ئەکات. کاتێکیش کە ئەمرێ، دوای تێپەڕبوونی دەیان ساڵ خەڵک لە مردنی ئاگادار ئەبن و ئەم مەرگە هەموویان ئەفسون ئەکا و ئەیانکاتە خەو و کاتێکیش چاو هەڵدێنن کە کار لە کار ترازاوە و زمانەکە مردووە. بەڕاستیی کێ ئەزانێ زمانی لاتین کەی مرد؟ زمانی سانسکریت و فارسی کۆن و پەهلەوی و هاوەڵەکانیان کەی ئاخر هەناسەیان هەڵکێشا و سەریان نایەوە؟ هەرچەند نەتوانین ساڵی مەرگی زمانەکان دیاری بکەین بەڵام ئەتوانین ڕازی مەرگ و نهێنی لەدایکبوونیان ڕوون بکەینەوە. من لام وایە ڕازی مەرگی زمانەکان لە ڕۆچوون و نەزۆکی شیعری ئەو زمانەدا و بە کورتیی لە مەرگی شیعردایە. زمان ئەوکاتەی ئەمرێ کە شاعیرەکەی مردبێ و مردنی شیعر و شاعیر پێکەوە ئەوکاتەی لە زمانێکدا ڕووئەدات کە ئەم دوانە لەبەر هەر هۆیەک بێ، لە ژیانی سەردەمی خۆیان دابڕابێتن. لە خۆشی و ناخۆشی خەڵکەکەی خۆیان دوورکەوتبێتنەوە یا خۆیان بە شتێکەوە سەرگەرم کردبێ کە هیچ فرێکی بە ژیانی خەڵکەوە نەبووبێ و ئەم ڕووداوە خۆی هاوکاتە لەگەڵ لەدایکبوونی شیعرێکی دیکە بە دەستی شاعیرێکی نوێ لە زمانێکی نوێدا. کەوابوو ڕازی بوونی هەر زمانێک بەستراوە



# ئەرستو

بە بوونی شیعرەوە. هەربۆیە ئەتوانین بە ڕاشکاوی بڵێین: هەر زمانێک کاتێ لەدایک ئەبی کە یەکەمین شاعیرەکەی دێتە دونیا. لەم ڕەوتەدا، مەرگی شیعر و زمانی کۆن دەیان و سەدانساڵ پاش لەدایکبوونی زمانی نوێ و شاعیرەکەی درێژە ئەکێشێت.

پێش هێنانی هەر چەشنە بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە ئەبێ بڵێم کە مەبەستی من لە شیعر لەم نامیلکەیەدا، هەموو شوێنەوار و بەرهەمە ئەدەبیەکانە لە زمانێکدا. واتە هەموو لایەنەکانی هونەری کەلامی (verbal art)یە. چ پەخشان و چ نەزم، چ حەماسە بێ و چ لە شێوەی تراژیدی و حیکایەت و ڕۆمان و... شانۆدا. مەبەست شتێکە کە لە شێوەی بوتیقای ئەرەستو (poetica) و هەموو ئەوانە کە لە گەوهەری هونەرن و بە زمان خۆیان نیشان ئەدەن و ئەگەر وشەی ئەدەب بەکارناهێنم لەو ڕوانگەوەیە کە ئەدەب بەشێکی بریتییە لە پیشەسازی و تەکنیکی ئەدەبی کە لە باسەکەی ئێمەدا ناگونجێن. هەروەها مەبەستی من لە شیعر، هەر بەرهەمێکە کە بە زمانی زیندووی خەڵکی سەردەمی شاعیر نووسرابێت و لە ژیانی ئەوان بدوێت و لە دڵی ئەوانەوە هەڵقوڵیبێت و ئاوێنەی دەرد و ڕەنجی خەڵکەکە بێت بە جۆرێک لە زامی هێرشی خەم و پەژارەدا، خەڵک وەکو هەتوانێک چاویان لەو شیعرە کردبێ. مەبەست ئەو شیعرانە نیە کە چەند کەسێک بۆ تاقی کردنەوەی دەسەلاتی خۆیان لەسەر بناغەی زمانێکی کۆن و بە زمانێکی مردوو- شتێکیان نووسیبێت کە بەری بێ لە ڕەنج و پەژارەی خەڵکەکە و تەنیا لەبەرئەوە گوتراوە کە خاوەنەکەی هەست بکا سەرێکە لەناو سەراندا. ئەم چەشنە شیعرە، نەک تەنیا شیعری زمانی زیندووی خەڵک نیە بەڵکو شیعرێکە بە زمانی مردووەکان گوتراوە و خودی شیعرەکەش پای لە لێوار گۆڕدایە و ئەگەر بە تەواویی نەمردوە، لەبەرئەوەیە کە شیعرێکی نوێ و زمانێکی نوێ هێشتا پێیان نەناوەتە دونیاوە. ئێستا کاتێ ئەوە هاتووە بە بەڵگە نیشانی بدەین کە شووشەی[1] تەمەنی هەر زمانێک لە دەستی شاعیرانی ئەو زمانەدایە و هەر زمانێک ئاوی ژیان لە شووشەی شیعرێک ئەنۆشێ کە تەنیا لە دەستی شاعیرانی ئەو زمانەدایە.

زمانی لاتین چۆن مرد؟ لاتین زمانی بەشی

١- شووشە لێرەدا بە مانای گۆزە یان بتڵە.

ڕۆژئاوای ئیمپراتۆری ڕۆم بوو. تەنانەت ئەوکاتەی ئیمپراتۆریەکە بوو بە دوو کەرتەوە زمانی لاتین وەکو زمانی بەشی ڕۆمی ڕۆژئاوایی هەر بەردەوام بوو و پێش هاتنی سەدەکانی تاریکی و سەدەکانی ناوەڕاست، ئەم زمانە سێ سەردەمی پڕ لە شانازی بردۆتە سەر. یەکەم دەورەی سەرەتایی کە دەورەی دروست بوونی زمان و ئەدەبی لاتین بوو بە ناوی لی وی یۆس ئاندرێ نیکۆزی شاعیرەوە دەست پێ ئەکات (Livius Andronicus) ئەم شاعیرە، لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا ژیاوە و لە ئێسپارتادا بە دیل گیراوە. شاعیرانی دیکەی هاوچەرخی ئەو ئێسکیپیۆسی لاو بوو (Scipio the younger) کە لە ساڵەکانی ١٨٥ - ١٣٩ پێش زاییندا ژیاوە، و هەروەها کراتیس (Crates)


ییتس

لە سەدەی دووهەمی پێش زاییندا، لە ڕۆمدا ژیاوە و ماوەیەکی درێژ بە وانەی ڕێزمانی لاتینەوە خەریک بووە. سەردەمی دووهەم یادەوەری زێڕینی زمانی لاتین دەورەی پەرەسەندنی ئەم زمانەبوو. ئەوکاتەی کە سیسرۆن (١٠٦- ٤٣ پ.ز) درەوشایەوە و ڤێرژیل (Virgil) (٧٠ - ٩پ.ز) شکۆ و جەلالی پێ دا و هۆراس (Horas) (٦٥- ٨ پ.ز) و ئۆیلەر (٤٣- ١٧ پ.ز) و سێنێکا (Seneca) (٤- ٦٥ زاینی) هەرکام بە جۆرێک بوونە هۆی گەشە و برەوی ئەم زمانە. زۆربەی ئەمانە شاعیر بوون و زمانی لاتین، لە شیرینی زمانی ئەمانەوە چێژی وەردەگرت.
سەدەمی سێهەمی لاتین کە بە دەورانی زیوین (Silver age) ناوی دەرکردوە دەورەی پێش ئاوابوونی ئەم زمانە بوو. لەم دەورانەدا تاسیتۆس (Tacitus) (٥٥- ١١٧ز) و یۆونالّ (Invenal) (٦٠ - ١٤٠ز) و چەن ناودارێکی تر خەریکی هۆنینەوەی شیعر بوون و هێستا بازاری لاتین هەرا و هەنگامەیەکی تێدابوو.
لە پاش هێرشی خێڵەکانی ژێرمەن و داگیرکردنی ئەم وڵاتە، ژێرمەنەکان پاپی گەورەیان لە جێگەی ئیمپراتۆر دامەزراند و بە جۆرێک گەورە و پیرۆزیان کردبوو کە جگە لە پاپ کەسیان بە مەسیحی (گاور) بڕوادار نەدەزانی و جگە لە کەنیسە و گوتار و بۆچوونی خۆیان، ڕیگەیان بە هیچ شتێکی دیکە نەدا. کەنیسەش هەموو ئاسەوار و بەرهەمی ئەدەبی و فەلسەفی یۆنان و ڕۆمی بە کفر دانا و بوو بە هۆی ئەوەی خەڵک لێی دوورکەونەوە و کەس نەیدەوێرا ئەو کتێبە شەیتانیانە بخوێنێتەوە. تەنانەت کار بەو جێگە گەیشت کە ژرۆمی ئاسمانی (St.Jerome) لە کاتی خۆیدا تۆبەی کرد و داوای لێبوردنی لە خودا کرد، کە بەهۆی نەفامیەوە لەکاتی لاویدا لە جێگەی ئینجیل کتێبی شیعری سیسرۆنی خوێندۆتەوە. سەیر




ئەوەبوو کە ژرۆم بۆ خۆی مامۆستای ئەدەب و زمانی لاتین بوو. ئەمانە هەموو مشتێکن لەو خەروارەی کە بوونە هۆی ئاوابوونی زمانی لاتین. زمانی لاتین و شیعرەکەی ڕەش هەڵگەڕان و بەرەبەرە ساردبوونەوە و مردن. پاشان زمانی لاتین بوو بە زمانی کەنیسە و فەلسەفە لە چوارچێوەی قوتابخانەکاندا بە دیلی مایەوە و ئەگەر شیعرێکیش دواتر بەم زمانە گوترا، ئەوە شیعرێکی ڕەسمی بوو کە زمانی دەسەڵات بوو نەک خەڵک، هەربۆیە خەڵک پشتیان تێکرد و ڕوویان کردە زمانە ناوچەییەکان و بە زمانی خۆیان شیعریان گوت. زمانی لاتین هێدی هێدی بەرەو مردن ئەچوو بەڵام هێشتا کەس ئاگادارنەبوو و هەروەها دانتەش نەهاتبووە مەیدانەوە تا بە زمانی ئیتاڵی شیعر بڵێ و زەنگی مەرگی زمانی لاتین لێبدات. دواتر سەرەڕای ئەوەی کە دەیان کتێبی فەلسەفە و ئایین بەم زمانە نووسرا، بەڵام ئەمانە نەیانتوانی ئەو خوێن و هەستەی کە شیعر بەو زمانەی دابوو، بیدەنێ و نەیانتوانی تەپ و تۆزی مەرگ لە ڕووخساری زمانی لاتین دابماڵن.

## مەرگی زمانی سانسکریت:

زمانی سانسکریتیش هەر بەو دەردەی لاتین مرد. هەرچەند کە ئەم مەرگە زۆر زووتر ڕوویدا و هەر بۆیە ناتوانین بە ئاسانی باسی لێ بکەین. سانسکریت زمانی ئەو ئاریایانەبوو کە لە نیوەی هەزارەی دووهەمی پێش زایین، لەگەڵ خۆیاندا بردیان بۆ هیند. ئەوان بەم زمانە قسەیان دەکرد و بەو زمانە ئەژیان و شیعریان دەگوت و هەزاران ساڵ درێژەی کێشا و گەلێ شاعیری هەڵکەوتوو شیعری حەماسیان بەم زمانە داناوە کە ئێستا بە ڤێدا (Vedas) ناسراوون وەکو: ڕیگ ڤێدا (Rig-Veda)، یاجور

ڤێدا (Yajur-Veda)، ساما ڤێدا (Sama-Veda) و ڤاییرۆ ڤێدا (Vayur-Veda) هەروەها ئۆپانیشادەکان (Upanishads) گەردونەی گەردون لە گەڕاندابوو تا لەناکاو کۆلکە خوێندەوارەکان و زرەـزاناکان تێگەیین کە زمانی سانسکریت گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئیدی ئەم زمانە هەر ئەو زمانەی نیە کە خەڵکی قسەی پێدەکەن. یاخود خەڵکەکە گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو و بە زمانی ڤێداکان قسەیان نەدەکرد. ئەم ڕووداوە ترسی خستە دڵی زرەـزاناکانەوە و بوە هۆی ئەوە کە باسکی لێ هەڵبماڵن و کارێک بکەن، بەڵام نە بۆ خەڵکی، بەڵکو بۆ زمانە ڕوو لە مەرگەکە. ئاخر ئەوان پەژارەی ڕابردوویان لە ئێستا زۆرتربوو و دڵیان بۆ مردوو زۆرتر لێی ئەدا تا بۆ خەڵکە زیندووەکە. هەر بۆیە هەوڵیان ئەدا بە سڵسڵە و پڵپڵە بیپارێزننەوە بە جۆرێک خەڵکی ڕووی تێبکەن و فەرامۆشی نەکەن. دواتر لەم بوارەدا دەستیان کرد بە نووسینی ڕێزمان بۆ سانسکریت و ویستیان خەڵک ناچاربکەن هەر بەو زمانە بدوێن و بنووسن. بەمجۆرە کەس بە زمانی زیندوو قسەی نەکرد و هەتا پێنجسەد ساڵ پێش زایین ئەم زمانە زمانی نووسین و ئاخافتنی زۆرەملێ بوو دواتر خەڵکی هیند ڕێگەی خۆیان لەو زمانە مردووە جیاکردەوە کە هەر شیاوی کتێب پێ نووسین بوو نەک ژیان. ئیدی هیچ منداڵێک بەو زمانە گڕوگاڵی نەکرد و هیچ دایکێک بەو زمانە گۆرانی بەر بیشکەی بۆ منداڵەکەی نەگوت. بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستیە قسەکانی بوودایە (Buda) کە بە وریایی تێگەیشت سانسکریت پەلەقاژەی مەرگیەتی، هەربۆیە بە لایەنگرانی خۆی گوت کە وتەکانی ئەو بە سانسکریت نەنووسن، بەڵکو بەو زمانە زیندووەی کە قسەی پێ دەکەن و گۆرانی پێ دەڵێن و... بنووسنەوە. بەمجۆرە هەزار ساڵی دیکە تێپەڕی کە بە هەزارەی کلاسیکی ئەدەبی سانسکریت ناسراوە و لەم هەزارەدا تەنیا بوودا هەستی بە بۆنی کەلاکی سانسکریت کرد. لەم هەزارەدا گەلێک شاعیری هیندی بە سانسکریت شیعریان هۆنیەوە، بێ ئەوەی کەس لە سەردەمی ئەواندا تەنانەت وشەیەکیش لەو شیعرانە تێبگەن. خەڵکی هەموو چاوەڕێبوون تا ڕۆژگار سوارەی غەزنەوی و مەغۆلی و دواتر ئینگلیزی ناردە سەریان و دوای کوژاندنەوەی ئاگری شەڕ وماڵوێرانی، ئەو خەڵکە توانیان جارێکی دیکە بە زمانی هیندی و بەنگالی و ئاسامی و گەجراتی و... کە زمانی زگماک و دایکی خۆیان بوون شیعر بڵێن و سەرلەنوێ بژێنەوە.



## زمانی فارسی چۆن لەدایکبوو بۆچی نەمرد؟

ئەگەر هەر لەم ڕوانگەیەوە تەماشای زمانی فارسی و لەدایکبوون و باڵاکردن و گەشەسەندنی بکەین، ئەوا دەبینین زمانی فارسیش لەدایکبوونەکەی بەهۆی شیعری فارسییەوە بوو. ئەبینین کە دووسەد ساڵ دوای هێرشی عەرەبەکان ئەو دەمەی یاقووبی لەیسی سەفاری، تاریفی خۆی لە زمانی شاعیرێکەوە بە زمانی عەرەبی بیست ڕووی کردە شاعیرەکە کە ناوی محمد وسیف بوو پێی گوت: ئەو شتەی کە من تێی ناگەم بۆ دەیڵێی؟ هەر ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە زمانی عەرەبی کە زمانی نووسین و بارگای شاهان بوو و تەنانەت خەڵکیش قسەیان پێ دەکرد و بەم زمانە نەزر و نیاز و عیبادەتیان دەکرد، پاشەکشەی کرد و بە ڕەوایەتی مێژووی سیستان، محمد وسیف دەستی کرد بە فارسی شیعر دانان و دەڵێن یەکەم کەس بووە کە بە فارسی دەری لە ناوچەی عەجەماندا شیعری گوتوە. پێشتر شاعیران بە زمانی ڕود و بە شێوەی خوسرەوانی ئەدوان و دواتر بە عەرەبی. ئەم وتەی یاقووبی لەیسی وەکو چاوەزارێک بوو کە لە باسکی زمانی فارسی هەڵواسی و زمانی فارسی تا هەزاران ساڵ پاراست و ژیانیەوە. هەرچەند لەو سەردەمەدا تاک و تەرا نووسەرەکان کتێبی مێژوو و فەلسەفە و... بابەتەکانی دیکەیان بە فارسی ئەنووسی بەڵام تەنیا شاعیرانی فارسی زمان بوون کە لە سەردەمی کۆنەوە فارسیان پاراست. لە ڕودەکی و عونسۆری و فیردەوسی و خەیام و نیزامی و حافز و سەعدی و عارف و بەهار تا دەگاتە نیما، تێکڕای ئەم شاعیرانە بە فارسی شیعریان گوتوە نەک بە عەرەبی و ئێستا فارسی وا باڵای کردووە کە ئەگەر خوێندکارەکانمان لە ئێستەدا بە ئەڵمانی و ئینگلیزی و ڕووسی و... بنووسن دیسان هەر زمانی فارسی دەمێنێت، لەبەرئەوەی کە ئاخرین شاعیری فارس هەر ماوە و نەمردووە.

## زمانی سێڵتەکانی ئیرلەندا بۆ لەناوچوو؟

هەموان دەزانین کە ئیرلەندا پێس ئەوەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە داگیر بکرێ بە زمانی سێڵتی ئەدوان و دەیان شاعیری هەڵکەوتوو بەم زمانە شیعری حەماسیان داناوە. کاتێک (٨٠٠ ساڵ پێش ئێستا) ئەم وڵاتە داگیر کرا، بەرەبەرە لەژێر زەبر و زەنگی تازەدا، زمانەکەیان کزبوو و لە زۆربەی شوێنەکاندا تروسکەی لێ بڕا و کوژایەوە.
هەروەها دەزانین کە ئیرلەندیەکان بە درێژایی ئەم هەشت سەد ساڵە لەگەڵ داگیرکەران بەشەڕهاتوون تا لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ڕزگاریان بوو. هەموو بەو هیوایەوە دەژیان کە کاتێک ڕزگاریان بوو، سەرلەنوێ زمانی سێڵتی زیندوو بکەنەوە و بیکەن بە زمانی شیعر و گۆرانی و ژیان و... ئەم حەز و ئارەزوانە کارێکی وەهای کرد کە شاعیری گەورەی ئیرلەندی بە ناوی ییتس (Yeats) لە سەدەی بیستەمدا بوو بە ئاڵاهەڵگری ئەم جووڵانەوە فەرهەنگیە بۆ بوژاندنەوەی زمانی سێڵتی. ییتس لە شیعرەکانیدا بە زمانی ئینگلیزی باسی ئەفسانە کۆنەکانی ئیرلەندا و حەماسەکانی دەکرد و دەیان شیعر و چیرۆکی لەم بارەوە نووسی و لەگەڵ هاوڕێکانیاندا تەماشاخانەیەکی نیشتمانی بە ناوی ئابی تیاتر (Abbey Theater) دامەزراند لە دۆبلین، بە نیازی بوژاندنەوەی زمانی ئیرلەندی کۆن و تەنانەت دەوڵەتی ئیرلەندیش زمانە کۆنەکەی

کرد بە زمانی فەرمی، بەڵام هیچکام لەم هەوڵانە بە سەرەنجام نەگەیشت و نەیانتوانی ئەو زمانە کۆنە زیندوو بکەنەوە. بەڕای من هۆی ئەم ناکامییە ئەوەبوو کە شاعیرانی سەردەم ئەفسانەکان و حیکایەتە کۆنەکانیان لەبری زمانی سێڵتی بە زمانی ئینگلیزی نووسیەوە کە بەم کارە هەم یارمەتی زمانی ئینگلیزیان دا و هەم ئیرلەندیەکانیان ناچارکرد لە داهاتوودا بۆ ناسینی خۆیان، زیاتر لە جاران دەبێ دەستەوداوێنی زمانی ئینگلیزی ببن.

## چەند نموونەیەکی دیکە:

ئەوەی باسکرا مشتێ بوو لە خەروارێ کە دەکرێت لێرەدا لە زمانی ئەرمەنی و عیبری ناوببەین کە لە مردن ڕزگاریان بووە و ئەمەش بەهۆی شاعیرانیان بووە کە هیچ کاتێک پەیوەندی خۆیان لەگەڵ خەڵک نەپچراندوە.

یان لەم ساڵانەدا گەلێک کەس بە زمانی فارسی دەربارەی زمانی ئازەری نووسیویانە تا ڕۆحی تازە بکەن بە بەر ئەم زمانەدا، بەڵام هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانە بە ئەندازەی «حیدەربابای» شاریار خزمەتی بە بوژانەوەی زمانی تورکی و ئازەری نەکردووە. ئەمە و دەیان نموونەی دیکە ئەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی لە سەرەتای نامیلکەکەدا ئاماژەمان پێکرد ئەویش ئەوەبوو کە: ڕازی مەرگی زمانەکان لە مەرگی شیعری ئەو زمانەدایە و ڕازی بوون و باڵاکردن و پەرەسەندنی هەر زمانێکی نوێش، لە تازەگی و ئاوداربوون و باڵاکردن و پەرەسەندنی شیعرەکانیاندایە. زۆرجار بیستوومانە کە زمانی هەر میللەتێک، ڕازی ژیانی ئەو میللەتەیە و یەکیەتی میللی خەڵکەکە دەپارێزی. ئەمە ئەگەرچی ڕاستە بەڵام ڕازی مانەوە و ژیانی هەر زمانێک بەستراوە بە ڕازی شیعری ئەو زمانەوە. زمان ئەوکاتە دەمرێ کە ئاخرین شاعیری ئەو زمانە لەناوبچێت و ئەو شیعرەش کە هۆ و هەوێنی ژیانەوە و مانەوەی زمانێکە ئەو شیعرەیە کە خەڵکی پێی ئەدوێن و باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەوان دەکا و لە دڵی ئەوانەوە لە شەقەی باڵ ئەدا و لە دڵی ئەوانیشدا دەنیشێتەوە و بۆن و بەرامەی شەعب و بۆنی ژیانی لێ دێ. شیعرێک کە لە خەڵک دابڕابێت، مردووە و بێ گیانە و شیعری بێ گیانیش ناتوانێت گیان ببەخشێت.

---

((لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم ئەگەر بابا تاهیر چوارینەکانی بە کوردی نەگوتبایە و ئەگەر خانی «مەم و زین»ی بە تورکی یان عەرەبی بهۆنیایەتەوە و ئەگەر حاجی قادر و مەحوی بە کوردی مەدحی خوایان نەکردایە، ئەگەر شێرکۆ بێکەس باسی حەماسەی «مامەیارە» و «بەردەقارەمان» و «هەڵەبجە»ی بە عەرەبی بۆ ئێمە بنووسیبا، و ئەگەر مەولەوی و مەلای جزیری و گۆران و دەیان کەڵەشاعیری گەورەی کورد بە کوردی شیعریان دانەڕشتایە، ئەوا ئێستا نە زمانی کوردی لە ئارادابوو نە کەس لە کوردەواریدا مامەیارە و شێخ مەحمود و مەم و ژین و... هتد ئەناسی)) وەرگێڕ

### سەرچاوە:

گۆڤاری ئادینە- ژمارە ٤٣- ٤٤ (١٩٩١ز = ١٣٦٩ هـ)

# سێ کلیل بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی تایفەگەرک و ئاینی

نووسینی: مەحمود حسێن
و. لە عەرەبییەوە: بارین

## کلیلی یەکەم
## مافی بوون و ژیان

لە جیهانی ئیسلامیدا، ململانێ دیار و بەرچاوەکانی نێوان مەزهەبە ئیسلامییەکان، ململانێیەکی ئاینی نییە، گەرچی لە ڕووکەشدا وا دیارە. چونکە قورئانی پیرۆز کە یەکەم سەرچاوەی ئاینیی و پیرۆزترین سەرچاوەیە لای مسوڵمانان، بە ڕاشکاوی و بە شێوەیەک هیچ گومان و دوودڵییەک و خراپ تێگەشتنێک هەڵناگرێت دەڵێ: خودای گەورە ئازادی باوەڕی بەخشیوە بە مرۆڤەکان، ئەوەی دەیەوێ ئیمانداربێت با ئیمانداربێت و ئەوەی دەیەوێ کافربێت با کافربێت. ئەم مانا ڕوون و ئاشکرایە لە زیاد لە ئایەتێکدا دەبینین کە لێرەدا هەندێکیان بە نموونە دەهێنینەوە:
(لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي فمن يكفر بالطاغوت و يؤمن بالله فقد استمسک بالعروة الوثقي لا انفصام لها والله سميع عليم- البقرة- ٢٥٦).
(انا هيدناه السبيل اما شاكرا و اما كفورا- الانسان-٣).
(قل الحق من ربكم فمن شاء فيلؤمن و من شاء فليكفر انا اعتدنا للظالمين نارا احاط بهم رادقها- الكهف- ٢٩).
نموونەی ئەم ئایەتانەی قورئان، ڕەوایەتی بوون و ژیان دەدات بە هەموو ئینتیما ئاینییەکانی جیهان، لە هەر جۆر و ڕەنگێک بێت و لە هەر پۆلێنبەندییەکدا بێت کە ئێمە بۆیان دەکەین. سا ئەو ئاینانە ئاینی ئاسمانی یان زەمینی، یەکتاپەرستی یان فرە خودایی بێت، هیچ جیاوازییەکیان نییە. چونکە قورئان بە یەکسانی مافی بوونی بەخشیوەتە هەموان. ئەم مافی بوونە تەنانەت بێ باوەڕەکانیش دەگرێتەوە، ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی خودای گەورە و میهرەبان نییە. لێرەوە ئەگەر قورئان مافی بوون و ژیان ببەخشێتە بێ باوەڕێک، ئاخۆ نایبەخشێتە ئەوانەی باوەڕیان بە

خودای تاک و تەنها هەیە؟ بەپێی زانیارییەکانی من لەسەر مەزهەبەکانی نێو ئیسلام، هیچ مەزهەبێکیان نییە باوەڕ بە تاک و تەنهایی خودای میهرەبان نەکات. پێغەمبەر لە یەکێک لە فەرموودەکانیدا دەڵێت: (ئەوەی لە دڵەوە و بە ڕاستگۆیی وتی لا الله الا الله دەڕواتە بەهەشت).

یەکڕیزی بڕبڕەی پشتی ئیسلامە، کەواتە لەم دیدە قورئانییەوە بۆ ئازادی ئاینی، هەموو مەزهەبەکانی نێو کۆمەڵگا ئیسلامییەکان، دەتوانن پێکەوە بە ئاشتی بژین، بێ هەستکردن بە ترس و دڵەڕاوکێ. با گریمانی ئەوە دابنێین، کۆمەڵێک لەو مەزهەبانە، وەک ئەوەی هەندێک پێیانوایە، لە ئومەتی ئیسلام چوونەتە دەرەوە و لایانداوە، بەڵام ئەم چوونەدەرەوە و لادانەیان، مافی بوون و ژیانیان لێ وەرناگرێتەوە. چونکە ئێمە ئەگەر لە مەزهەبێک لە مەزهەبەکان، ڕەگەزنامەی ئیسلامیمان بە حەق یان بە ناحەق لێوەرگرتەوە، ئەوا ئێمە بوێری ئەوە ناکەین ڕەگەزنامەی مرۆڤبوونیان لێ وەربگرینەوە کە خودای میهرەبان پێیبەخشیوون. ئێمە لە ئیسلامدا گەر ئەم مەزهەبەمان بەدڵبوو یان ئەو مەزهەبەی دیکەمان بەدڵنەبوو، ئەوا لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ئەو مەزهەبانە مافی بوون و ژیانیان هەیە و پێویستە پارێزراوبن.

## کلیکی دووەم
## سەرفرازی بۆ کێیە؟ کێ خاوەنی بەخشینی پاسپۆرتی ڕۆشتنە بۆ بەهەشت؟

لایەنگرانی هەر ئاینێک، پێیانوایە تەنها ئەوانن دەچنە بەهەشت. ئەو خەڵکانەی دیکە کە دەمێننەوە و لەسەر ئاینی ئەوان نین، ئەوا جێگایان ئاگری دۆزەخە و تێیدا تا هەتاهەتایە دەمێننەوە. ئەم جۆرە باوەڕە لای سەرجەم لایەنگرانی ئاینەکان هەیە، بە لایەنگرانی ئاینی ئیسلامیشەوە. بەڵام خودای گەورە و میهرەبان هەرگیز شتێکی لەو شێوەیەی نەوتووە. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا، جەخت لەوە دەکاتەوە کە سەرفرازی لە ڕۆژی قیامەتدا و ڕۆشتن بۆ بەهەشت، بەستراوە بە سێ مەرجەوە کە ئەمانەی خوارەوەیە: بڕوابوون بە خودا و بە ڕۆژی قیامەت و ئەنجامدانی کاروکردەوەی باش

ئەو دوور کەوتنەوە و لادانەی لە قسەکانی خودای گەورە کە لەلایەن مرۆڤەوە هاتەئارا، لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە هەر نەتەوەیەک لە نەتەوەکانی سەر گۆی زەوی، سیفەتی ئیمان بۆ خۆی پاواندەکات و سیفەتی کافر بەوانی دیکە دەبەخشێت. هەر نەتەوەیەک وایدادەنێت لە ڕۆژی قیامەتدا خۆی تەنها نەتەوەی سەرفرازە! بەڵام ئەمە بیرکردنەوەی خەڵکە و بیرکردنەوەی خودای مەزن نییە. خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەڵێ: (ان الذين امنوا و الذين هادوا و النصاري و الصابئين من امن بالله و اليوم الاخر و عمل صالحا فلهم اجرهم عند ربهم و لا خوف عليهم و لا هم يحزنون. ٦٢). مانای ئەم ئایەتە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و پێماندەڵێ سەرفرازی لە ڕۆژی قیامەتدا، تەنها موڵکی ئومەتێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو موڵکی تەواوی میللەت و ئومەتەکانی دیکە و سەرجەم بوونەوەرەکانیشە، بەو سێ مەرجەی لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێدراوە. لێرەوە فەزڵی میللەتێک بەسەر میللەتێکی دیکەدا نادرێت و ڕەچەڵەکێک لە ڕەچەڵەکێکی دیکە باشتر نییە، تەنها بە بڕی باوەڕهێنان بە خودا و بە کاروکردەوەی باش نەبێت. لە وتەیەکی قودسی (القدسی) دا هاتووە: (هەمو بوونەوەرەکان منداڵی خودان، خۆشەویسترینیان لای خودا، ئەوەیە بۆ منداڵەکانی خۆی باشبێت)، مانای ئەم وتەیە پاڵپشتێکە بۆ مانای ئایەتەکەی سەرەوە.

## کلیلی سێیەم
## جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت



لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان جیاکردنەوەی دین لە دەوڵـەت و جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت. چونکە دەوڵەت شتێکی جیاوازە لە سیاسەت و نابێت دەوڵەت و سیاسەت یەکسان بکەین بەیەک. دەوڵـەت بریتییە لە کۆمەڵێ دەزگا کە بەپێی دەستورێک بەڕێوەدەچێت. دەستورێک نوێنەری هەموو میللەتە بە سەرجەم پێکهاتە شارستانی و ئاینی و مەزهەبی و نەتەوەیی و ئابوری و ڕۆشنبیرییەکەیەوە. دەوڵەت لە فەلسەفەی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، لەوێوە دروستدەبێت کە گەل دەستبەرداری دەسەڵاتە فەردییە زۆرەکانی خۆی دەبێت و دەیبەخشێت بە لایەنێکی دیاریکراو و سەرجەم دەسەڵاتەکانی ڕادەستدەکات. ئەم لایەنە نە کەسێکە نە دەزگایەکە نە حیزبێکە، بەڵکو دەستورێکە. ئەوە ڕاست نییە دەستبەرداربوونی خەڵک لە دەسەڵاتەکانیان بۆ دەستور، بەوە لێکبدرێتەوە کە دەستبەرداری مافە ئاینییەکان یان مافە نەتەوەییەکانی خۆیان بوون. ئەم جۆرە لێکدانەوانە لە هیچ فەلسەفەیەکی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، ئاماژەی پێنەدراوە و بوونی نییە. دەوڵـەت وەک چۆن دەزگـای ئابوری و سیاسی و ڕۆشنبیری هەیە و تێیدا کاروبارەکانی میللەت بەڕێوەدەبات، ئەوا پێویستە دەزگـای ئاینیشی هەبێت و گرنگی بە مەسەلە ئاینییەکانی کۆمەڵگا بدات و ڕێکیانبخات.

هـەرچـی سیـاسـەتـە، ئـەوا ئـەو لایـەنـەیـە کە سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی دەزگاکانی دەوڵەت دەکات و دەستور جێبەجێ دەکات. ئەم جیاکارییە لەنێوان دەوڵەت و سیاسەت، کارێکی پێویستە، تا

هەر حیزبێک یان هەر زۆرینەیەک یان کەمینەیەکی کۆمەڵگا، لەکاتی وەرگرتنی دەسەڵاتدا، وا تێنەگەن بوونەتە خاوەنی خودی دەوڵەت و دەوڵەت لەسەر خۆیان تاپۆ بکەن. بردنەوەی زۆرینەی دەنگەکان لە ڕێگەیەکی دیموکراسییەوە، مانای وا نییە ئەو لایەنە ئازادە لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی بە دەوڵەت و دەزگاکانیی و دەستورەوە و دەتوانێ بە ئارەزوی خۆی و چۆنی بوویێت ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

لێرەوە بانگەشەکردن بۆ جیاکردنەوەی دین لە دەوڵـەت، پێویستە ڕاستبکرێتەوە و بگۆڕدرێت بۆ بانگەشەی جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت. ئەگەر توانیمان لەلایەکەوە هاوپەیمانی بۆ پەیوەندی نێوان دیـن و دەوڵــەت بگەڕێنینەوە، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر توانیمان دین لە سیاسەت جیابکەینەوە، ئەوا ئێمە دەتوانین میللەتان والێبکەین ئینتیمایەکی بەهێزیان بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگاکانیان هەبێت. بە شێوەیەک هەموو پێکهاتە کۆمەڵایەتی و تائیفی و دینی و نەتەوەییەکان، هەست بکەن ئەم دەوڵەتە موڵکی ئەوانە، بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کەمینەن یان زۆرینەن، بێ ڕەچاوکردنی شوناسی ئەوەی حوکم دەگرێتەدەست و دەچێتە سەر عەرشی فەرمانڕەوایی. کەواتە دەوڵـەت بۆ هەمووانە، بەڵام فەرمانڕەوایی بریتییە لە گۆڕەپانی ململانێی سیاسی لەنێوان حیزبەکان و ڕەوتە سیاسییەکاندا.

جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت، بە پلەی یەکەم ئامانجی پارێزگاریکردنە لە ئاین و لە پێکهاتە ئاینییەکان دوور لە گەمە سیاسییەکان. ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە لە زۆرێک لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا، شوناسە ئاینییەکان و ئینتیما تایفییەکان، بۆ بـردنـەوەی جەنگی سیاسی دژ بە نەیارەکان ئیستیغلال دەکرێن. حیزبی براوە، یاری لەسەر ژێی ئینتیمای ئاینی زۆرینە دەکات، حیزبی دۆڕاو یان حیزبی ئۆپۆزسیۆن، یاری لەسەر ژێی هەستی ئاینی کەمینەکان دەکات. بەم شێوەیە موقەدەسی دینی، تێکەڵ بە زەلکاوی بەرژەوەندییەکانی سیاسەت دەبێت و بانگەشەی سیاسی حیزبەکان دەبێتە بانگەشەیەکی ئاینی و هانی بڵاوکردنەوەی ڕق و ترس و تەکفیرکردنی یەکتر دەدەن. هەر لایەنێک هەوڵدەدات سوکایەتی بە پیرۆزییەکانی لایەنی ڕکابەری بکات، ئەمەش لە ڕێگەی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی مێژووی یەکتر و هێنانەوەی ئەو نموونانەی وێنەیەکی شەیتانی بەلایەنەکانی دیکە دەبەخشێت.

لە دەرئەنجامیشدا کۆمەڵگا لە ڕووی ویژدانییەوە هـەلاهـەلا دەبێت و پەیمانی کۆمەڵایەتی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگا لاوازدەبێت و یەکڕیزی میللەت تێکدەچێت و دەگۆڕێت بۆ یەکڕیزی تائیفی و ئاینی و نەتەوەیی. کێبڕکێی چوونە سەر حوکم و خزمەتکردنی کۆمەڵگا، دەگـۆڕێـت بـۆ پێشبڕکێکردن لەسەر داگیرکردن و قۆرخکردنی دەوڵەت بەناوی زۆرینەی دیموکراسییەوە! ئێمە گەر پەیمانێکی کۆمەڵایەتی هاوسەنگمان دروستکرد، پەیمانێکی کۆمەڵایەتی دەستورێک بە کۆدەنگی نەک بە زۆرینە بێنێتەئاراوە و تێیدا دەوڵەت دایکی هەموو پێکهاتەکان بێت، لەسەرو هەموویانەوە پێکهاتەی ئاینی و دوور لە چەمکی زۆرینە و کەمینە و ئاین دوور ڕابگرێت و بیپارێزێت لە گەمەکانی سیاسەت، ئەوا یەکڕیزی تائیفی تاڕادەیەکی زۆر هەڵدەوەشێتەوە و پەرتدەبێت و تەنگەنەفەسی ئاینیش نامێنێت. ئیدی خەڵکی بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە باس لە پاساوەکانی تێکەڵکردن و کەلتووری پێکەوە ژیانی ڕابردوو و ئێستا و ئایندەیان دەکەن.

**سەرچاوە:**

الاوان، ٢٠١٣/٥/١٨

# ئایدۆلۆژیای ئیسلامییەکان و چەمکی بەختەوەری



مستەفا ئەلقەلعی

نووسینی: مستەفا ئەلقەلعی
و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

له ڕاستیدا خوێندنەوەی ئەدەبیاتی ئیسلامی سیاسی، گرفت و پرسیارگەلێکی جۆراوجۆر له هزردا دەوروژێنێت. لەو پرسیارانه پرسیاری بەختەوەری فەلسەفی. سەرەتا با بزانین بەختەوەری (السعادة) چییه؟ پێناسەیەکی هەره سادەی بەختەوەری ئەوەیه هەموو کەسێک هەوڵدەدا بۆ ئەوەی بەختەوەر و دڵخۆش بێت، به جۆرێک وا دەردەکەوێت بەختەوەری ئەو هاندەرەیه که له پشت هەموو کارێکی مرۆڤەکانەوه ڕاوەستاوه، (بڕوانه وتاری: ما جدوی ان یکون المرء سعیدا، له نووسینی منصف الوهایبی، الاوان، کانونی دووەمی ٢٠١٠).

ئەوه پێناسەیەکی بابەتیانەی گشتییه و پێویستی به شیکردنەوه هەیه. باشترین دەروازه بۆ چوونه ناو شیکردنەوەی ئەو پێناسەیه، گوزارشتی (کارەکانی مرۆڤه) که له کۆتایی ڕستەکەدا هاتووه. بەرهەمی کشتوکاڵی کاری مرۆڤەکانه، دروستکردنی باڵەخانه بەرزەکان کاری مرۆڤەکانه، بڕین و لابردنی گرێ شێرپەنجەییەکان له جەستەی خەڵک کاری مرۆڤەکانه، دانانی مۆسیقا نەمرەکان کاری مرۆڤەکانه، هەروەها خۆتەقاندنەوه و ڕەجمکردنی خەڵک و بڕینی ئەندامەکانی جەسته و تیرۆرکردنی تێکۆشەرەکان و سەرکردەکان و کارکردن بۆ ناچارکردنی کۆمەڵگا تا بەرەو دواوه بگەڕێتەوه، ئەوانەش هەمووی کاری مرۆڤەکانه! بەم مانایه خاوەنی هەموو ئەو کارانه هەوڵی بەدیهێنانی بەختەوەری دەدەن.

باشه، لێرەوه منصف الوهایبی، وا پێناسەی بەختەوەری کردووه که بریتییه لەو هاندەرەی له پشت کارەکانی مرۆڤەوەیه. بەڵام ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسی، پێناسەی بەختەوەری به کۆتاییەکەی و بەوەی جێیدەهێڵێت دەکات. مەبەستی لەوەش دەرهێنانی چەمکی بەختەوەرییه له کایه مرۆییه دونیاییەکەی و سپاردنیەتی به کایەی ئاخیرەتی غەیبی. واته دەرهێنانی له ئەمڕۆ و سپاردنی به بەیانی، دەرهێنانی له ئێستا و سپاردنی به نادیار. ئەم پرۆسەیه له ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسیدا، گرنگه، بگره بنەڕەتییه. ئەم پرۆسەیه ئەو



دەروازە مەنهەجییە پێویستەیە کە لە ڕێگایەوە پرۆسەی شۆردنەوەی هزر دەستپێدەکات، واتە لێیەوە کەسی ئیسلامگەر بۆ کوشتن یان تەقینەوە ئامادە دەکرێت.

منصف الوهاییی دەربارەی ئایا بەختەوەری یۆتۆپیایەکی دوورە دەستە یان لەبەردەستدایە، هەروەها دەربارەی ئەوەی کام لەو دوو ئەگەرە دروستکەری نەهامەتییەکانی مرۆڤە، هەمان




پرسیاری فەیلەسوفی فەرەنسی «بلاز باسکاڵ-١٦٢٣ - ١٦٦٢» دەخاتەڕوو و دەڵێ: ئایا یۆتۆپیا بەو پێیەی هەرگیز مەیسەر نابێت و لە ئاسۆوە تابێت لێمان دوور دەکەوێتەوە، وامان لێدەکات نەگبەت و بەدبەخت بین، یان ئەوە ئێمەین نەگبەت و بەدبەختین چونکە ناتوانین لە چوارچێوەی ئەوەی لەبەردەستماندایە، بەختەوەری ببینین و بەدەستی بێنین؟

بەڵێ، ئەوە پێویستی بە بیرکردنەوە و تێڕامان هەیە. ئایا تیۆرسازێکی ئیسلامگەر چۆن دەتوانێت قەناعەت بە موریدەکانی بکات بەوەی بەختەوەری نزیکە هەرچەند دوورە و دوورە هەرچەند نزیکە؟ بەو واتایەی چۆن و بە چ شێوەیەک قەناعەت بە موریدێکی ئیسلامگەر دەکرێ، بەوەی دەتوانێ بەختەوەری بەدەست بێنێت، لە کاتێکدا لەم دونیایەدا بە فیعلی بەختەوەری نابینێت و تێیدا ناژی؟ واتە دەبێ قەناعەتی پێ بکرێ کە بەختەوەری بە کۆتایی هێنانی ژیانی خۆی و ئەوانی دیکە بەدیدێت. بەختەوەری بەم مانایە لەزەت و چێژوەرگرتن نییە لە ژیان، بەڵکو پەرستنی مەرگە. کەواتە مەرگ یان مردن دەبێتە داواکارییە هەرە سەرەکییەکە. ئەم تێگەشتنە لە بەختەوەری، لە چەمکی جیهاد بەرفراوانترە، بگرە دوورتریشە و لەگەڵ ئەو چەمکەش ناکۆکە. چونکە ئامانجی جیهاد لە سەرەتاکانی دەوڵەتی ئیسلامی و لە سەردەمی فتوحاتدا، بریتی بوو لە تالانکردن و کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و پڕکردنی (بیت المال) بوو لە پارە. لەو سەردەمەدا کەسی موجاهید نەدەڕۆشت تا لە پێناو یەزداندا بمرێت، بەڵکو دەڕۆشت تا بژی و سەروەت و سامان کۆکاتەوە و لە هەمانکاتیشدا بانگەوازی ئیسلام بڵاوبکاتەوە.

کەچی لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسیدا، بەختەوەری بریتییە لە مردن و کوشتن و سەرگەردانی و وێڵی نێو شاخ و بیابانەکان و بەسەربردنی ژیان لەژێر ڕەحمەتی ئاگری تۆپەکان و ڕۆکێتەکان. زۆر بە سانایی بەختەوەری لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامگەردا بریتییە لە (بەختەوەری مردن) نەک لە خۆکوشتن و کوشتنی نەفس بە تەنها، بەڵکو بە کوشتنی ئەوانی دیکەش لەگەڵ خودی خۆیدا. کوشتنی نەفس خۆی لە خۆیدا ئامانج نییە، بەڵکو شێواز و ڕێگایەکە بۆ کوشتنی ئەوانی دیکە. لێرەدا کوشتنی نەفسی خۆت مەسەلەیەکی ئاساییە و کوشتنی ئەوانی دیکە کاکڵەی مەسەلەکەیە یان جەوهەری مەسەلەکەیە. لای ئەوان خۆکوشتن لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجی کوشتنی ئەوانی دیکە، هیچ زەرەر و زیانێکی نییە.

ئایا شێوازی ئایدۆلۆژیای ئیسلامگەر چۆن ئەوە دەکات؟ چۆن دەکرێ گەنجێک لە هەرەتی تەمەنی ژیانیدا کە پڕە لە خەون و خولیا، لە خشتەببرێت و مێشکی پڕ بکرێت لە ئایدۆلۆژیای کوشتن و مەرگ: کوشتنی نەفس و کوشتنی ئەوانی دیکە؟ مێشکشۆردنەوە ئەو شێوازەیە دەگیرێتەبەر و وادەکات تەقینەوە بەختەوەری بێت، کوشتن بەختەوەری بێت، لەتوپەتکردنی جەستە بەختەوەری بێت. پێویستە ئەو کەسەی مێشکی شۆراوەتەوە، بڕوای بەوە بێت و خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان بکات، بگرە لەوەش زیاتر ئەو کەسە جەستەی خۆی دەبەخشێت بەم بەختەوەرییە، چونکە لە زۆربەیجارەکاندا کوشتنی ئەوانی دیکە، بە کوشتنی خودی کەسەکە ئەنجامدەدرێت، وەک لە کردەوە خۆکوژییەکاندا دەیبینین.

بەم مانایە بەختەوەری، لە عورفی میدیایی و سیاسیدا، هاومانای تیرۆرە. بەڵام لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامییەکاندا، چ ئیخوانەکان یان سەلەفییە جیهادییەکان، بە مانای شەهیدبوونە لە پێناو یەزدان.

خوێندنەوەی هەندێ لە ئەدەبیاتی ئیخوانە ئیسلامییەکان، توانایەکی گەورە دەرەخسێنێت بۆ تێگەشتن لە چەمکی (بەختەوەری مردن) لایان. لەوانە کتێبەکەی «حەسەن بەنا» (مذكرات الدعوة و الداعية، مكتبة افاق للنشر و التوزيع، کویت، چاپی یەکەم ٢٠١٢). هەروەها کتێبەکەی «سەید قوتب» (معالم فی الطريق، دار الشروق، بیروت، چاپی شەشەمی شەرعی ١٩٧٩). ئەم دوو کتێبە دوو دامەزرێنەرە سەرەکییەکەی ئیسلامی سیاسین و دوو سەرچاوە بنەڕەتییەکەی ئیسلامی سیاسین. ئەم دوو کتێبە لە بەشێکی زۆری جیهاندا، هۆکاری گیرۆدەبوونی جیهانن بە تیرۆری جیهادی. تێڕوانینێکی ڕەشبینانە بەسەر هەردوو کتێبەکەی سەید قوتب و حەسەن بەنادا زاڵە و وا تەماشای جیهان دەکەن کە بریتییە لە پارچەیەک خراپەکاری و بەدڕەوشتی و جێگای پیاوچاکان و داوێنپاکەکانی تێدا نابێتەوە.

جیهان لە ئەسڵدا پیس و گەندەڵ نییە، بەڵکو ئەوە گەندەڵکارانن جیهانیان پیس و گەندەڵ کردووە، هەر بۆیە حوکمی کوشتنیان بەسەردا دەسەپێت. کوشتن لای ئەوان پاکبوونەوەیە. لەم پێناوەشدا ئاساییە بۆ پاکردنەوەی جیهان لە پیسی و گەندەڵی، خودی نەفس لە پیسی پاکبکرێتەوە. هۆکاری گەندەڵی و پیسبوونیش زۆر و فرەچەشنە، لەوانە خۆرئاوای کافر و عەلمانییە غەرەبزەدەکانی سەر خاکی ئیسلام. لێرەوە و لە میانەی ئەم دیماگۆکییەوە،

ئایدۆلۆژیای کوشتن و تەقینەوە پێدزکە دەکات، هەر لەبەر ئەمەشە هەردوو کتێبەکەی سەید قوتب و حەسەن بەنا، لەیەککاتدا هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر بە خۆرئاوا و مۆدێرنە و ڕۆشنگەری و عەقڵانییەت هەیە و هاوبەشن لەو هەڵوێستەیاندا.

یەکەم ڕستە کە کتێبی (معالم فی الطریق) لێیەوە دەستپێدەکات مژدەی خەرەندێک بە گوێی خوێنەردا دەدات و دەڵێ: (لەمڕۆدا مرۆڤایەتی لەسەر لێواری خەرەندێک ڕاوەستاوە)، هۆکاری ئەم ڕاوەستانەش نە زانستییە نە کەشوهەوایە و تەنانەت سیاسیش نییە، بەڵکو هۆکاری نەمانی بەهایە. سەید قوتب درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێ: ئەو خەرندە بەهۆی داماڵینی جیهان لە بەهاکان پەیدا دەبێت کە دەکرێ ژیانی مرۆڤایەتی لە سێبەری ئەو بەهایانەدا گەشەیەکی تەندروست بکات و بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان بەرزببێتەوە. سەرنجبدەن قوتب قسەوباس لە بەهاکان دەکات. بەڵام ئەو هەرگیز ئاماژە بە دەستکەوتەکانی مۆدێرنەی خۆرئاوا نادات، چونکە لای ئەو دەستکەوتەکانی مۆدێرنە پڕە لەو بەهایانەی لەگەڵ بەها کۆنەپارێز و دواکەوتووەکانی سەلەفییەت ناگونجێت کە ئیسلامگەرەکان وەک دروشمێک لە دژی بەها هاوچەرخەکان بەرزیانکردووەتەوە.

بێگومان هەڵنەکردن لەگەڵ شەپۆلی سەردەمدا و نووقمبوون لە دواکەوتن و کۆنەپارێزیدا، بەسە بۆ قسەوتن بە دەستکەوتەکان و ڕەتکردنەوەیان، بە بیانوی فەزیلەت و بەهای بەرزو پیرۆز. کەچی لە هەمانکاتدا فەتواکانیان دەربارەی (هاوسەرگیری عورفی و هاوسەرگیری سەرجێ) و چەندان فەتوای ناشرینی دیکە کە شەهوانییەت و چڵێسی سێکسیان لێ دەتکێ، دەریدەخات ئەوانە هیچ پەیوەندییەکیان بە فەزیلەت و بەهای بەرز و پیرۆزەوە نییە. هەروەها کتێبەکەی «د. رفعت السید» ئیخوان موسلمین لە گەمەی سیاسەتدا و کتێبەکەی «پروت الخرباوی» دڵی ئیخوان، ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە ئیخوان هیچ پەیوەندییەکیان بە فەزیلەتەوە نییە. بەڵکو ئەوانە ڕەوتێکی دینی سیاسی پراگماتیکی مایکاڤیلییانە بوون و پەرۆشی گرتنە دەستی دەسەڵات بوون، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش هەموو ئامرازێکیان بە گونجاو و شیاو دەزانی.

لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامگەرەکاندا، چارەسەری بەها هاوچەرخەکان، لە ئیسلامدا دەبینن. بەڵام ئیسلامی هاوچەرخ نا وەک ئەو ئیسلامەی تێیدا دەژین و ئەویش لە ناوماندا دەژی، بەڵکو ئیسلامی پێشینان (سەلەف)، ئیسلامی سەرەتا کە ناتوانن بە دروستی دەستنیشانیشی بکەن. لێرەوە بەختەوەری لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامگەرەکاندا بریتییە لە پەرستنی کوشتن، کوشتنی ئەوانی دیکە چ بە تاک یان بە کۆ. کوشتنێک کە بە کوشتنی خودی نەفس خۆیدا تێدەپەڕێت و مافی ژیانی لێوەردەگرێتەوە. ئەو مافەی یەزدان بە مرۆڤی بەخشیوە و داوای لێکردووە پێی ڕازیبێت و پارێزگاری لێ بکات. بەڵام ئەوان لەبەر خاتری ڕازیکردنی مەیل و ڕق و کینەیان دژ بە سەردەم و بەهاکانی و دژ بە مۆدێرنە و بەختەوەرییەکەی، ئەم مافە پێشێلدەکەن و لەناویدەبەن.

**سەرچاوە:**

الاوان، ٢٦ کانوونی دووەم، ٢٠١٤

# دوو چەمکی ئازادی

نووسینی: ئیزایا بەرلین
و. لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

ناچارکردنی مرۆڤ مانای بێبەشکردنیەتی لە ئازادی، بەڵام ئازادیی لە چیدا؟ هەر بیریارێکی ئەخلاقی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ستایشی ئازادیی کردووە و بەرز ڕایگرتووە. ئازادی، وەک بەختەوەری و پیاوچاکی، سروشت و حەقیقەت، زاراوەیەکە چەندین لێکدانەوە هەڵدەگرێت. من نامەوێت باسی مێژووی ئەم زاراوەیە بکەم و مانا زۆرەکانی بخەمەڕوو، کە سەد دانەی تێپەڕاندووە و لەلایەن مێژووزانەکانی فیکرەوە تۆمارکراون، بەڵکو دەتوانم تەنیا دوو مانای ئەو زاراوەیە تاوتوێ بکەم و گفتوگۆیان دەربارە بکەم، کە دوو دانەی ناوەندین و بە ناخی زۆربەی مێژووی مرۆڤایەتیدا چوونەتە خوارەوە. یەکەم ناودەنێم چەمکی سیاسیی ئازادی، واتە چەمکی ئازادیی نێگەتیف (هەردوو وشەکە بەیەک مانا بەکاردێنم)، کە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لەخۆدەگرێت: ئەو پانتاییە کامەیە کە دەبێت تیایدا تاکێک (یان چەند تاکێک)، بەبێ دەستوەردانی تاکەکانی تر، ئەوە بکات کە دەیەوێت، یان ببێتە ئەو شتەی خوازیاریەتی؟ دووەمیش ناودەنێم چەمکی ئازادیی پۆزەتیف و وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لەخۆدەگرێت: سەرچاوەی ئەو کۆنترۆڵکردن یان دەستوەردانە کامەیە، کە دەتوانێت سنوور بۆ ئەوە دابنێ تاکێک چی بکات یان دەیەوێت ببێت بە چی؟ ئەم دوو پرسیارە بە ڕوونی جیاوازن، ئەگەرچی دەشێت وەڵامەکانی هەردووکیان بەناویەکدا بچن.

**چەمکی ئازادیی نێگەتیڤ:**

هەمیشە دەوترێت، من بەو ئەندازەیە ئازادم، کە تاکێک یان گرووپێک دەستوەرنەداتە چالاکی و کارەکانم. بە سادەیی. ئازادیی سیاسی بەم واتایە مانای ئەو پانتاییەیە، کە تاک دەتوانێت بەبێ هیچ ئاستەنگ یان کۆتوبەندێکی سەپێنراو لەلایەن ئەوانی ترەوە کاری تیادا بکات. چونکە کاتێک ئەوانی تر ڕێگردەبن لەوەی کارێکی دیاریکراو ئەنجامبدەم، ئازاد نابم، کاتێکیش پانتایی ئازادیم تا ئەوپەڕی سنوور تەسکدەکرێتەوە،

ناچاردەکرێم کارێک بکەم کە حەزی پێ ناکەم، یان لەوانەیە بەکۆیلەبکرێم. زاراوەی ناچارکردن هەموو لایەنەکانی بێتوانایی لەئاست کارێکدا لێک ناداتەوە، چونکە کاتێک دەڵێم ناتوانم لە دە پێ بەرزتر بازبدەم، یان لەبەرئەوەی نابینام ناتوانم بخوێنمەوە، یاخود ناتوانم لە لاپەڕە ئاڵۆزەکانی نووسینەکانی هیگڵ تێبگەم، ئەوا سروشتی نییە بڵێم تا ئەو ئاستە بەکۆیلەکراوم، یان ناچارکراوم.
ناچارکردن دەستوەردانێکی بە ئەنقەستە لەو پانتاییەی تیایدا ئازادیی کارکردنم هەیە. تۆ تەنیا لەو بارەدا ئازادیی سیاسی یان سەربەخۆیی خۆت لەدەستدەدەیت، کە لەلایەن کەسانی ترەوە ڕێگری لە هێنانەدیی ئامانجێکت لێ بکرێت[1]. بێتوانایی لەئاست هێنانەدیی ئامانجێکدا بە تەنیا، مانای لەدەستدان یان نەبوونی ئازادیی سیاسی نییە[2]. ئەوە بەهۆی بەکارهێنانی چەند زاراوە و دەستەواژەی نوێوە، وەک «سەربەخۆیی ئابووری» و دژەکەی «پاشکۆیەتیی ئابووری»، ڕووندەکرێتەوە. بەشێوەیەکی برواپێهێنەر و قاییلکەر باسکراوە، ئەگەر مرۆڤ بەو ڕادەیە هەژاربێت، نەتوانێت شتێک بەدەستبهێنێ کە لە ڕووی یاساییەوە قەدەغەکراو نییە – وەک پارچە نانێک، یان گەشتێک بەدەوری جیهاندا، یاخود بەرزکردنەوەی داوایەکی دادوەری بۆ دادگاکان– وەک ئەوە وەهایە بەپێی یاسا ئازادیی بەدەستهێنانی ئەو شتەی لێ قەدەغەکرابێت.
جا ئەگەر باری هەژاریم ڕێگربێت لەوەی نانێک بکڕم، یان پارەی گەشتێک بە دەوری جیهاندا بدەم، یاخود داوایەکی دادوەری بۆ دادگاکان بەرزبکەمەوە – وەک چۆن ئیفلیجی ڕێگردەبێت لەبەردەم ڕاکردنمدا– ئەوا ئەم دەستەوسانە مانای نەبوونی ئازادی، یان لانی کەم نەبوونی ئازادیی سیاسی نییە. ئەوەی وام لێ دەکات هەست بکەم قوربانیی ناچارکردن یان بەکۆیلەکردنم، بڕوابوونمە بەوەی هۆکاری بێتواناییم لەئاست بەدەستهێنانی شتێکی دیاریکراودا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانی تر کارێکیان کردووە ڕێگرە لەوەی من (من نەک ئەوانی تر) پارەی پێویست بەدەستبهێنم بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتە. بە دەربڕینێکی تر، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە پشتبەستووە بە تیۆرێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی دیاریکراو، کە هۆکارەکانی هەژاری و لاوازیم دیاریدەکات. ئەگەر هۆکارەکە نەبوونی توانا ئەقڵی یان جەستەییەکانم بێت، ئەوا دەستدەکەم بە باسکردنی ئەوەی لە ئازادی بێبەشکراوم (لێرەدا مەسەلەکە دەربارەی هەژاری نییە)، لەو کاتەدا نەبێت کە تیۆرەکە قبوڵدەکەم[3]. هەروەها ئەگەر پێموابوو بەهۆی بارێکی زۆردانە یان نادادپەروەرانەوە ڕێگریم لێ کراوە ئەوە بەدەستبێنم کە دەمەوێت، ئەوساکە باسی بەکۆیلەکردن و چەوساندنەوەی ئابووری دەکەم. وەکو ڕوسۆ باسیکردووە: «ئەوە سروشتی شتەکان نییە وامان لێ دەکات شێت بین، بەڵکو تەنیا

١- بێگومان مەبەستم حەقیقەتی ڕووداوەکە نییە.
٢- هەلڤیتیۆس بەڕوونی باسی ئەمەی کردووە، کاتێک وتویەتی: مرۆڤی ئازاد تاکێکە بە ئاسن کۆتوبەند نەکراوە و زیندانییەک نییە لە زیندانێکدا – وەک کۆیلەیەک کە لە سزا دەترسێت ناچارناکرێت کارێک بکات... هەروەها بێتوانایی لەئاست فڕیندا (وەک هەڵۆ)، یان بێتوانایی لەئاست مەلەکردندا (وەک نەهەنگ) مانای لەدەستدانی ئازادی نییە.
٣- بێگومان وێناکردنی مارکسیستانە بۆ یاسا کۆمەڵایەتییەکان لایەنێکی ناسراوی ئەو تیۆرەیە، بەڵام توخمێکی گرنگە لەناو هەندێک برواخوازیی مەسیحی و بەکەڵکایەتی و گشت بڕوخوازییە سۆسیالیستییەکاندا.

نییەتە خراپەکانە وامان لێ دەکات بەو جۆرە بین»[٤]. پێوەری چەوساندنەوە ئەوەیە، کە خەڵکانی تر ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بە مەبەست یان بێ مەبەست، ئەنجامیدەدەن بۆ تێکشکاندنی خواستەکانم. کەواتە سەربەخۆیی مانای دەستەوەرنەدانی ئەوانی ترە لە کاروبارە تایبەتییەکانم، هەتاکو ئەم پانتاییەش (پانتایی دەستوەرنەدان) زیاتربێت، پانتایی ئازادییەکەم فراوانترەبێت.

ئەمە مەبەستی فەیلەسووفە سیاسییە کلاسیکییەکانی ئینگلتەرا بوو، کاتێک ئەو وشەیەیان بەکاردەهێنا[٥]. ئەوان سەبارەت بە پانتایی ئەو ئازادییەی تاک دەکرێت یان دەبێت هەیبێت جیاوازبوون و پێیانوابوو، کە نابێت ئازادی بێسنوور بێت. چونکە ئەگەر بێسنوور بوو، ئەوا کەشێک دەخوڵقێنێ تیایدا مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا بارێکی ململانێی بێسنوور دەگوزەرێنن. ئەم باری ئازادییە «سروشتی»یە دەبێتە مایەی پشێویی کۆمەڵایەتی و مرۆڤەکان بەهۆیەوە ناتوانن لانی کەمی پێداویستییەکانی خۆیان دەستەبەربکەن و ئازادییەکانی لاواز لەلایەن بەهێزەوە زەوتدەکرێت. بیریارەکانی هەڵگری ئەم بیروڕایانە درک بەوە دەکەن، ئامانج و چالاکییەکانی مرۆڤ خۆبەخۆ لەگەڵ یەکتردا تەبانابن، (خەسڵەتە بڕواخوازییەکانیان هەرچۆنێک بێت) بایەخی زۆر بە چەندین ئامانجی دیکەی وەک دادپەروەری، خۆشگوزەرانی، ڕووناکبیری، دڵنیایی و ئاستە جۆربەجۆرەکانی یەکسانی دەدەن. بۆیە ئامادەن بۆ بەرتەسککردنەوەی سنووری ئازادی، لەپێناو چەند بەهایەکی تردا، کە ئازادی یەکێکە لەوانەدا (واتە خنکاندنی ئازادی لەپێناو ئازادیدا)، چونکە بەبێ ئەمە نەدەتوانرا ئەو تەبایی و سازانە دەستەبەربکرێت، کە خوازیاری بوون. سەرەنجام ئەو بیریارانە پێیانوابوو، دەبێت سنووری کاری ئازادی مرۆڤەکان بەپێی یاسا دیاریبکرێت. هەروەها لایەنگرانی ئازادی- وەک لوک و میل لە ئینگلتەرا و کۆنستانت و تۆکڤیل لە فەڕەنسا- لەو بڕوایەدا بوون، پێویستە لانی کەمی ئەو پانتاییە هەبێت، کە تیایدا ئازادیی تاکەکەسیی بەدەست بێت، بەبێ ئەوەی لەبەر هیچ هۆیەک زەوت بکرێت. ئەگەرنا، ئەوا تاک خۆی لە پانتاییەکی زۆر بەرتەسکدا دەبینێتەوە، کە دەرفەت تەنانەت بەلانی کەمی گەشەپێدانی توانا سروشتییەکانی نادات. ئەمەش بە تەنیا ڕێگردەبێت لەبەردەم ئەوەی تاک بەردەوام بێت لەسەر گەڕان بەدوای ئامانجە جۆربەجۆرەکانیدا، کە بەلایەوە گرنگ، دادپەروەرانە، سوودبەخش و پیرۆزن، یان ڕێگردەبێت لەبەردەم ئەوەی تاک درک بەو ئامانجانە بکات. کەواتە دەبێت سنوورێک لەنێوان کایەی ژیانی تاکەکەسی و کایەی دەسەڵاتی گشتیدا دابنرێت. دەستنیشانکردنی ئەم سنوورە مەسەلەیەکە پێویستی بە گفتوگۆ و تەنانەت سازش هەیە، چونکە ئامانج و ئارەزووەکانی تاکەکان بەشێوەیەکی گشتی تێکهەڵکێشن و ئەوەی تاک ئەنجامیدەدات، بەو ڕادەیە تایبەتی نییە کە کاریگەریی لەسەر ئەوانیتر نەبێت، یان سنوور بۆ چالاکیان دانەنێت. لەبەرئەوەی «ئازادیی ماسیی کراکی (جۆرە ماسییەکی ڕووباریی

4-Emil, book2: P.320. In Oeuvers copletes, ed. Bernard Gagnebin & others (Paris, 1959), vol.4.

٥- هۆبز دەڵێت: «مرۆڤی ئازاد تاکێکە دەتوانێت بێ هیچ کۆتوبەندێک ئەوە بکات، کە دەیەوێت». «یاساش کۆتوبەندێکە، ئەگەرچی بتپارێزێت لەو کۆتوبەندانەی قورسترن لە کۆتوبەندی یاسا، وەک یاساکانی هەندێک دابونەریتی قورس کە گەمارۆی ئازادیی دەدەن و سەرکوتیدەکەن. هەروەها یاساکانی ستەمکاریی زۆردار یان پشێوی«. بینتام هەمان شتی وتووە.

لمۆز درێژ و باریکی کاژێرییە)، مانای مردنی ماسیی منەیە (ماسییەکی زۆر بچووکە)»[٦] و «ئازادیی هەندێک، مانای زەوتکردنی ئازادیی ئەوانیترە، یان فشارهێنانە بۆ ئازادیی ئەوانیتر». بەو پێیەی «ئازادی بەلای بەڕێوەبەری قوتابخانە، یان ڕاگری کۆلیژێکی زانکۆی ئۆکسفۆردەوە، جیاوازە لەگەڵ ئازادی بەلای جوتیارێکی میسرییەوە».

ئەم گوتەیە هێزی خۆی لە شتێکەوە بەدەستدێنێ کە ڕاستەقینە و گرنگیشە، بەڵام وەک دەستەواژەیەکی سیاسیی بۆش دەمێنێتەوە. ڕاستە دەستەبەرکردنی مافە سیاسییەکان، یان دابینکردنی دەستوەرنەدانی دەسەڵات، بۆ چەند تاکێکی نیمچە ڕووت، یان نەخوێندەوار، یاخود ئەوانەی گیرۆدەی دەستی خواردنی خراپ و نەخۆشییەکانن، جۆرێک لە سوکایەتیکردن بە هەلومەرجی بژێوی ئەو تاکانە لەخۆدەگرێت، بەڵام ئەوانە پێویستیان بە چاودێریی تەندروستیی و خوێندن هەیە، پێش ئەوەی لە ئازادی و شێوازی سوودلێوەرگرتنی تێبگەن. کەواتە ئازادی بەلای ئەوانەوە مانای چییە کە ناتوانن بەکاری بێنن؟ ئازادی چ بەهایەکی هەیە، ئەگەر هەلومەرجی لەبار بۆ سوودلێوەرگرتنی بە کاملترین شێوە لەئارادا نەبێت؟ هەندێک ئەولەوییەت یان باری گرنگ هەن- وەک ئەوەی یەکێک لە نەهلیستەکانی رووس (دۆستۆیفسکی) هێمای بۆ دەکات- تیایاندا پێڵاو لە بەرهەمەکانی پۆشکین گرنگتر دەبێت و ئازادیی تاکەکەسی پێداویستی یان داخوازییەکی بنچینەیی گشت تاکەکان نابێت. لەبەرئەوەی ئازادی مانای نەبوونی هیچ جۆرە پەستبوون یان تێکشانێک نییە، چونکە لەوانەیە ئەمە مانای وشەکە قەبەبکات و چیتر مانای ڕاستەقینەی خۆی نەبەخشێت، واتە مانای زۆر یان مانای کەم بگەیەنێت. جوتیاری میسری لە پێشدا پێویستی بە پۆشاک و چاودێریی تەندروستی هەیە، زیاتر لەوەی پێویستی بە ئازادیی تاکەکەسی هەبێت، بەڵام لانی کەمی ئەو ئازادییەی ئیمڕۆ پێویستی پێیەتی و ئەو لایەنە زۆرەی ئازادی کە سبەینێ دەشێت پێویستی پێی هەبێت، هێما بۆ چەند جۆرێکی جیاواز ئازادی ناکەن کە پێیان نامۆبێت، بەڵکو ئازادییەکە هاوشێوەی ئەو ئازادییەیە مامۆستا و هونەرمەندان و ملیۆنێرەکان هەیانە.

پێموایە ئەوەی ویژدانی لیبرالیستە خۆرئاواییەکانی تووشی دڵەڕاوکێ کردووە، ئەو بڕوایە نییە کە ئەو ئازادییەی مرۆڤەکان کۆششی بۆ دەکەن، بەپێی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووریيان جیاوازە، بەڵکو ئەوەیە کە ئەو کەمایەتییەی ئازادیی هەیە، ئەنجامی بەکاربردنی زۆرینەی هەرە زۆر بەدەستیهێناوە، ئەو زۆرینەیەی بێبەشە لە ئازادی. ئەوانە، پشتئەستوور بە بەڵگەی باش، پێیانوایە ئەگەر ئازادیی تاکەکەسی ئامانجی بنچینەیی گشت مرۆڤەکان بێت، ئەوا نابێت هیچ مرۆڤێک لەلایەن ئەوانیترەوە لە ئازادی بێبەش

٦- ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی تری مەیلی سروشتیی زۆرینەی ئەو بیریارانەیە کە بڕوایان بە پێویستیی پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان شتە جوانەکان، یان لانی کەم تەبایی نێوانیان هەیە. مێژووی فیکر- وەک مێژووی میللەتان- پڕییەتی لە چەندین نموونەی توخمگەلی ناکۆک یان جیاواز، کە بەشێوەیەکی ناسروشتی و لە ژێر کاریگەریی حوکمڕانیی ستەمکاردا و لە ترسی دوژمنێکی هاوبەش هاوپەیمانێتیی یەکتر دەکەن، بەڵام ململانێی لایەنە هاوپەیمانەکان پاش نەمانی مەترسی دەستپێدەکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی پارچەپارچەبوونی ڕژێمەکە و گەلێک جار ئەوە لە بەرژەوەندیی مرۆڤەکاندا دەبێت.

بکرێت. ئازادیی یەکسانیش مانای ئەوەیە، بە شێوازێک مامەڵە لەگەڵ ئەوانی تر نەکەم، کە بۆ خۆم پێی ڕازی نیم. هەروەها قەرزی ئەوانە بدەمەوە کە بەدەستهێنانی ئازادی یان خۆشگوزەرانیی ئابووریيان بۆ ئاسانکردوم، یاخود ڕۆشنبیریانکردوم و بەرچاوڕوونیانکردوم. ئەمەش مانای دادپەروەرییە بە سادەترین و گشتیترین ماناکانی و بنچینەی ئەخلاقی لیبرالیستانەیە. ئازادی تاقە ئامانجی مرۆڤ نییە، من دەتوانم هاوشێوەی ڕەخنەگری ڕووس (بیلنسکی) بڵێم، ئەگەر ئەوانیتر لە ئازادی بێبەشکران و براکانم بە کۆتوبەندکراوی و لە باری هەژاری و پیسوپۆخڵیدا مانەوە، ئەوا ئازادیم بۆ خۆم ناوێت، بەڵکو بەتەواوەتی ڕەتیدەکەمەوە و پێم باشترە بۆ هەتاهەتایە چارەنووسیان لەگەڵ دابەشبکەم. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک ئەنجامی تێکەڵکردنی زاراوەکان بەدەست نایەت. بۆ خۆبەدوورگرتن لە نابەرابەری یان نەهامەتی، ئامادەم گشت یان بەشێکی ئازادیی خۆم بکەمە قوربانی: ئەو ئازادییەی بە ویستی خۆم و ئازادانە دەستبەرداری دەبم، لەپێناو دادپەروەری و یەکسانیدا و لەبەر خۆشەویستیم بۆ هاوڕێ و مرۆڤە هاوڕەگەزەکانم. لێرەشدا دەبێت هەست بە تاوانباری و ئازاری ویژدان بکەم، ئەگەر لە هەندێک هەلومەرجدا ئامادەنەبم بۆ ئەو قوربانیدانە. لەگەڵ ئەوەدا قوربانیدان، زیادکردنی قوربانیدانەکان نییە- بەتایبەتی ئازادی- جا پێویستیی مەعنەویانە بۆ ئەوە یان قەرەبووکردنەوەی هەرچەند گەورەبێت. چونکە شتەکان ئەوانەن کە هەن: ئازادی ئازادییە و مانای یەکسانی، دادپەروەری، ژیوار، بەختەوەری، یان ویژدان نییە. بۆیە ئەگەر ئازادیی من، یان ئازادیی چینە کۆمەڵایەتییەکەم، یاخود ئازادیی میللەتەکەم پێویستی بە بەدبەختیی ئەوانیتر هەبێت، ئەوا ئەو سیستەمەی ڕێگە بەمە دەدات، سیستەمێکی نادادپەروەر و بێ ئەخلاقە، بەڵام ئەگەر ئازادیی خۆم کەمکردەوە یان لەدەستم دا بۆ کەمکردنەوەی شەرمەزاریی ئەم نایەکسانییە، کە نابێتە مایەی زیادکردنی ئازادیی تاکەکەسیی ئەوانیتر، ئەوا ئەنجامەکە لەدەستدانی تەواوەتیی ئازادی دەبێت. لەوانەیە بکرێت لەدەستدانەکە بە دەستکەوتێک لە بواری دادپەروەری، یان بەختەوەری، یاخود ئاشتیدا قەرەبووبکرێتەوە، بەڵام لەدەستدانی ئازادیی «کۆمەڵایەتی» یان «ئابووری» هەر دەمێنێتەوە و کۆتایی نایەت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕاستییە لەئارادادەبێت کە ئازادیی هەندێک پێویستی بە کەمکردنەوەی ئازادیی ئەوانیترە، بەڵام بەپێی چ پرنسیپێک ئەوە ڕوودەدات؟ ئەگەر ئازادی شتێکی پیرۆز و پرنسیپێک بێت کە قابیلی دەستکاریکردن نەبێت، ئەوا پرنسیپێکی لەو جۆرە لەئارادانابێت. دەبێت یەکێک یان هەندێک لەو ڕێسا و پرنسیپە ناکۆکانە لە پراکتیکدا ملکەچ بکەن: نەک هەمیشە لەبەر ئەو هۆکارانەی دەکرێت بە ڕوونی باسبکرێن، بەڵکو لەبەر ئەوانەی شێوەی ڕێسا و فەرمانی گشتی وەردەگرن. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت سازشکردنێکی پراکتیکی بدۆزرێتەوە.

ئەو فەیلەسووفانەی خاوەن تێڕوانینی گەشبینانە بوون سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ و توانای پێکەوە گونجانی خواستە مرۆڤایەتییەکان- وەک لوک و ئادەم سمس و لە هەندێک باریشدا میل- لەو بڕوایەدابوون، کە پێکەوە گونجانی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن، پشتبەستووە بە فراوانیی پانتایی ئازادیی تایبەتیی تاکەکەسی، کە نابێت دەوڵەت یان هیچ دەسەڵاتێک دەستدرێژی بکاتە سەری. هۆبز و ئەوانەی هاوڕایبوون،

بەتایبەتی بیریارە موحافەزەکار و کۆنەپەرستانەکان، بیانوی ئەوەیان دەهێنایەوە، کە بۆ ڕێگەگرتن لەوەی مرۆڤەکان یەکتری تێک بشکێنن و کۆمەڵگە نەبێتە جەنگەڵ یان چۆڵەوانی، پێویستە چەندین یاسای پارێزگاریکار دابنرێن، بۆ ئەوەی ناچاربکرێن لە شوێنی خۆیان بمێننەوە و سنووریان بۆ دابنرێت. هۆبز ویستی پانتایی دەسەڵاتی ناوەندیی فراوان بکات و پانتایی ئازادیی تاک کەمبکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوولا لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە پێویستە هەندێک لایەنی ژیانی تاک بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی تاک سەربەخۆیانە و لە دەرەوەی مەودای کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی کاربکات. دەستدرێژیکردنە سەر ئەمە هەرچەند کەمیش بێت، هەر جۆرێکە لە ستەمکاری. بنیامین کۆنستانت، کە بەپەرۆشترینە بۆ ئازادی و تایبەتمەندیی تاکەکەسی و یەکێکە لەوانەی ڕاشکاوانە و لێهاتوانە بەرگریی لێ دەکردن، سەرباری ئەوەی دیکتاتۆرییەتی یەعقوبیی لەیادنەکردبوو، پێویستیی پاراستنی ئازادیی ئایین، بیروڕا، دەربڕین و مافی موڵکایەتیی لە هەر دەستدرێژییەکی زۆردانە ڕاگەیاند. هەریەکێک لە جیڤەرسۆن، بورک، پەین و میل لیستێک بە جۆر و شێوازەکانی ئازادیی تاکەکەسیی خستەڕوو، کەچی بیانووی پاراستنی دەسەڵات لە ڕووی جەوهەرەوە هەمیشە وەک خۆی ماوەتەوە. بۆیە ئەگەر بمانەوێ ڕێگە لە «زەلیلکردنی سروشتی خۆمان و نکۆڵی لێ کردن»ی بگرین، ئەوا پێویستە لانی کەمی ئەو پانتاییە بپارێزین کە تاک دەتوانێت تیایدا ئازادیی تاکەکەسیی خۆی هەبێت. ئێمە ناتوانین بە تەواوەتی و یەکجارەکی ئازادبین، بەڵکو دەبێت بەشێک لە ئازادیی خۆمان بکەینە قوربانی بۆ پاراستنی ئەو بەشەی بۆمان ماوەتەوە. خۆبەدەستەوەدانی تەواوەتی، تێکشکاندنی خودە. کەواتە لانی کەمی ئازادی دەبێت چۆن بێت؟ ئەوەی مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری بێت، بەبێ ئەوەی زیان بە ناوەڕۆکی سروشتی مرۆڤ بگەیەنێت. ئەم ناوەڕۆکە چییە؟ ئەو ستاندارتانە کامانەن کە پێویستیان دەکات؟ ئەمە بابەتی گفتوگۆیەکی بێکۆتایی بووە و لەوانەیە هەرواش بمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو پرنسیپ یان ڕێسایەی بەهۆیە ڕادەی دەستوەردان دیاریدەکرێت هەرچییەک بێت، جا ئەو دەستوەردانە لەلایەن یاسای سروشتییەوە بێت، یان ئەوە بێت کە یاسا سروشتییەکان، مافە سروشتی یان سوودبەخشەکان، بڕیارە پابەندخوازە ڕەهاکان، پابەندییە کۆمەڵایەتییەکان، یان بیرۆکەیەکی گشتی پێویستی دەکات، یاخود هەر تێگەیشتنێک کە بەهۆیەوە تاکەکان بەهانە و بەڵگەکانی خۆیان ڕووندەکەنەوە و پاساویان بۆ دێننەوە. بەوپێیەی ئازادی مانای ڕزگاربوونە لە «دەستوەردان» یان نەبوونی دەستوەردانە، یاخود گۆڕینی پێگەکانییەتی بۆ ئەو سنوورانەی هەرچەند گۆڕانیان بەسەردا بێت، هەر مەسەلەیەک دەبێت پێویستە درکی پێ بکرێت و دانی پیادا بنرێت. «تاقە ئازادی، کە مانای وشەی ئازادیی بەسەردا جێبەجێدەبێت، ئازادییە بۆ کۆششکردن لەپێناو هێنانەدیی ئەوەی ئامانجمانە و بەکەڵکە بۆمان، بەو ڕێگە و شێوازانەی بەباشی دەزانین بۆ خۆمان». ئەمە قسەی یەکێکە لەوانەی لە بواری داکۆکیکردن لە ئازادی ناوبانگیان دەرکردووە. ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیە بێت، ئایا بیانوویەک بۆ زۆربۆهێنان یان ناچارکردن لەئارادادەبێت؟ میل هیچ گومانێکی بەرامبەر بەمە نەبوو. لەکاتێکدا دادپەروەری پێویستی بەوەیە هەر تاکێک لانی کەم ئازادیی هەبێت، ئەوا دەبێت فشار بخرێتە سەر ئەوانی تر- ئەگەر پێویست بوو هێزیش

بەکاربهێنرێت- بۆ ڕێگەگرتن لەوەی ئازادیی هیچ تاکێک زەوت بکرێت. بێگومان ئەرکی گشتیی یاسا ئەوەیە ڕێگە لەم جۆرە پێکدادانانە بگرێت، ئەگەرنا- وەک لاسال بە سوکایەتیپێکردنەوە هێمای بۆ دەکات- ئەوا ئەرکی دەوڵەت و دەسەڵاتەکەی کورت دەبێتەوە بۆ پاسەوانی شەو یان پۆلیسی هاتوچۆ.
چی وای کرد پاراستنی ئازادیی تاکەکەسی بەلای میل-ەوە پیرۆزبێت؟ ئەو لە وتارە بەناوبانگەکەیدا ڕایگەیاند: «هیچ دەرفەتێک بۆ پێشکەوتنی ژیواری لەئارادانابێت، ئەگەر تاکەکان بە ئازادی و بەو شێوەیە نەژین کە گونجاوە بۆیان»، هەروەها دەرفەت بۆ دەستکەوتی داهێنەرانە و خۆڕسک و بلیمەتیی فیکری یان بوێریی ئەخلاقیش لەگۆڕێ نابێت. توانستە ئاساییە زۆر بچووکەکان کۆمەڵگە وێراندەکەن و هەرگیز یارمەتیدەر نین بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە، هەروەها بارگرانیی دابونەریتەکان هەموو شتێک تێکدەشکێنێ، کە بەهادار و داهێنەرانەیە. ئەمەش بەرهەمی پابەندبوونی هەمیشەییە بە دابونەریتەکانەوە و ملکەچکردنە بۆیان، یان سەرشۆڕکردنە بۆ فرمانەکانیان، کە تەنیا بوونەوەری کەمتوانا و چەندین وزەی لاوازی کۆتوبەندکراو و بیرکردنەوەی تەسک بەرهەمدێنێ. لێرەدا ئەم وتانە دەردەبڕرێت: «خۆسەلماندن بەلای بێدینەوە، وەک خۆنەویستیی بەلای مەسیحییەوە گرنگە». «ئەو هەڵانەی مرۆڤ دەیانکات - سەرباری وریاکردنەوە و ئامۆژگاری- کاریگەرییان لەو زیانە کەمترە ئەنجامی ڕێگەدان بەوانیتر فشاربخەنە سەری و بەرەو ئەو ئاڕاستەیەی بەرن کە بەڕاستی دەزانن». بەرگریکردن لە ئازادی ئەوەیە، ئامانجە «نێگەتیڤەکان»ی پاراستنی تاک لە دەستوەردان لەخۆی دەگرێت. هەروەها هەڕەشەکردن لە تاک بە چەوساندنەوە، ئەگەر ڕازی نەبێت بە ژیانێک کە خۆی ئامانجەکانی دیاری ناکات و تەنیا یەک دەروازەی هەیە، تەنانەت ئەگەر لە پشت دەروازەکەوە شتی چاوەڕوانکراو و ئەگەری قازانجکردن و سەرکەوتنیش هەبێت- جا ئامانجی ئەم سنووردانانە هەرچەندێک جوامێرانە بێت- تاوانێکە دەرهەق بە مرۆڤبوونی مرۆڤ و مافی ژیانی مرۆڤ بەو شێوازەی خۆی دەیەوێت. ئەمە ئازادییە بەو جۆرەی لیبرالیستەکان لە جیهاندا و لە ڕۆژگاری (ئیراسمۆس)ەوە- یان هەندێک لە ڕۆژگاری (ئۆکامەوە)- هەتاکو ئیمڕۆ تێی دەگەن. داواکردنی مافە مەدەنییەکان و ئازادیی تاکەکەسی و ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بە چەوساندنەوەی تاک و زەلیلکردنی و دەستدرێژیکردنە سەر مافە گشتییەکانی و دژی بێهۆشکردنی بە کۆمەڵ و پڕوپاگەندەکردنی ڕێکخراو لەم تێگەیشتنەوە سەرچاوەدەگرێت، کە جەغتدەکاتەوە لەسەر تاک و شتێک دەکاتەوە جێی بایەخپێدانی تاکە.

### لێرەدا دەکرێت سێ ڕاستی دەربارەی تاك و گرنگییەکەی ڕەچاوبکرێن:

یەکەم: میل دوو بیرۆکەی ڕوون و جیاکارە تێکەڵ بە یەکتری دەکات. یەکەمیان دەڵێت ناچارکردن، کە دەبێتە مایەی بێزاری و چەپاندنی ئارەزووەکانی مرۆڤ، کارێکی خراپە، ئەگەرچی ئامانج لێی ڕێگرتن بێت لە خراپەکارییەکی گەورەتر لە خودی پرۆسەی ناچارکردنەکە. لەکاتێکدا دەستوەرنەدان - کە پێچەوانەی ناچارکردنە - باشە، تەنانەت ئەگەر تاقە باشەش نەبێت. ئەمە چەمکی ئازادیی نێگەتیڤە بەشێوە کلاسیکییەکەی. بیرۆکەی دووەم دەڵێت پێویستە تاکەکان هەوڵبدەن بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت، یان گەشەپێدانی کەسایەتییەکی خاوەن چەند سیفەتێک، کە میل پێیان ڕازییە: کەسایەتییەکی ڕەخنەگر،

ڕەسەن، خەیاڵ فراوان و سەربەخۆ، کە بەئاسانی کۆنترۆڵ ناکرێت و ناسازێت، تەنانەت ئەگەر ئەوە بگاتە ڕادەی نامۆبوون و ناوێزەبوون. دەکرێت ئەم حەقیقەتە بدۆزرێتەوە و ئەم جۆرە کەسایەتییە بەرهەم بێت، ئەوەش تەنیا لە هەلومەرجی ئازادیدا. ئەم دوو بیرۆکەیە تێڕوانینی لیبرالیستانەن، بەڵام هاوشێوە نین و هەوڵدان بۆ پێکەوە بەستنیان لە باشترین باردا کارێکی ئەزموونگەرانەیە و پێویستی بە سەلماندنە. هیچ کەسێک نییە دژی ئەو بیروڕایە بێت کە دەڵێت، ناکرێت حەقیقەت یان ئازادیی بیروڕا و گوزارشتکردن لە خود لە شوێنێکدا پەرەبستێنێ و ببوژێتەوە، کە دۆگماکان هەموو فیکرێک وردوخاش دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا مێژوو دەریدەخات، وەک جێمس ستیڤن لە هێرشکردنە گەورەکەیدا بۆ سەر میل و لە وتارەکەیدا «ئازادی، یەکسانی و برایەتی« دەریبڕیوە، دەشێت دادپەروەری و خۆشویستنی حەقیقەت و تاکگەرایی جۆشسەندوو لەو کۆمەڵگانەدا پەرەبستێنێ کە خاوەن دیسپلینی بە زەبروزەنگن، وەک دیسپلینی پیورتانی (پاکیزەخوا)ی کالڤنی لە سکۆتلەندا و نیوئینگلاند لە ئەمریکا، یان خاوەنی دیسپلینی سەربازین، تاوەکو ئەو کۆمەڵگانەی لێبوردەترن یان خەمساردن. ئەگەر مەسەلەکە بەم جۆرە بێت، ئەوا تێزەکانی میل کە هێما بۆ ئەوە دەکەن ئازادی مەرجێکە بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی توانا مرۆییەکان و گەشانەوەیان، شکستخواردوو و ناڕاست دەردەچن. ئەگەر نەگونجانی ئەم دوو ئامانجەش سەلما، ئەوا لەوانەیە میل دووچاری میحنەتێکی گەورە ببێت. ئەمە سەرباری کێشەکانی تر کە ئەنجامی ناکۆکیی تیۆرەکانی لەگەڵ بەکەڵکایەتیی توندوتیژدا (النفعیە المتزمتە) سەرهەڵدەدەن، تەنانەت لە ڕووە مرۆییەکەی خۆیەوە.

دووەم: ئەم تیۆرە ڕێژەییانە نوێیە، چونکە وەک دەردەکەوێت بەدەگمەن گفتوگۆ دەربارەی ئازادیی تاک وەک ئامانجێکی سیاسی (بەراورد بە بوونی ڕاستەقینەی) لە جیهانی کۆندا هەبووە. کۆندورسیە لەوەوبەر توانجی لەسەر ئەوە داوە و هێمای بۆ نەبوونی بیرۆکەی مافەکانی تاک لە یاسا گریکی و ڕۆمانییەکاندا کردووە. ئەمەش باری ژیوارە کۆنەکانی وەک چینی و جولەکەش بووە[٧]. تەنانەت لە مێژووی نوێی خۆرئاوادا هەژموونی ئەم بیرۆکەیە و دەستڕۆیشتنی بارێکی ڕیزپەڕبووە، نەک ڕێسا. ئازادی بەم واتایە بەدەگمەن دەنگێک بووە بۆ هاندانی مرۆڤایەتی، بەمەبەستی پێکەوە کارکردن لەپێناو بەدەستهێنانی ئەو جۆرە مافەدا. ئارەزووی تاک بۆ پیادەکردنی ئازادیی خۆی، بەبێ دەستدرێژیکردنە سەر ئەوانی تر و پێشێلکردنی مافەکانیان، نیشانەی ژیوارێکی پایەدارە لەسەر ئاستی تاکەکەسی و کۆمەڵگە. هەستی تایبەتمەندی لە بواری پەیوەندییە تاکەکەسییەکاندا و دانانی بە شتێکی پیرۆز لە چەمکی ئازادییەوە سەرچاوەدەگرێت، کە وێڕای ڕەچەڵەکە ئایینییەکانی بە ئەستەم لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانیدا کۆنترە لە سەردەمی ڕینیسانس یان سەردەمی ڕیفۆرم[٨]، لەگەڵ ئەوەشدا نەمانی مانای مردنی ژیوارێک و تەواوی داهاتووی ئەخلاقییە.

سێیەمین خەسڵەتی چەمکی ئازادی گرنگییەکی گەورەتری هەیە، چونکە ئازادی بەم تێگەیشتنە ناکۆک نییە

٧- بڕوانە گفتوگۆ بەنرخەکەی مایکڵ ڤیل بەناونیشانی «چەند وانەیەک لە مێژووی فەلسەفەی هەقەوە«: (Lecons d›histoire de la philosophie du droit)، کە سەرەتاکانی بیرۆکەی مافە خودییەکان دەگێڕێتەوە بۆ ئوکام.

٨- بڕوابوونی مەسیحییەت (جولەکە و ئیسلامیش) بە دەسەڵاتی ڕەوای یاسا ئاسمانی و سروشتییەکان، هەروەها بە یەکسانی لەبەردەم خولْقێنەردا، جیاوازە لەگەڵ بڕوابوون بە ئازادی کە ژیان بەو شێوەیە بۆ تاک مسۆگەردەکات، کە خۆی دەیەوێت.

لەگەڵ ئۆتۆکراسی، یان نەبوونی ئۆتۆنۆمی. ئازادی بەم مانایە بەتایبەتی بایەخ بە ناوچەی کۆنترۆڵکردن دەدات، نەک بە سەرچاوەکەی. لەوانەیە دیموکراسی هاوڵاتی لە گەلێک ئازادی بێبەش بکات، کە دەشێت لە سایەی کۆمەڵگەی تردا هەیبێت. چونکە دەکرێت وێنای زۆردارێکی لیبرالی بکرێت، کە ئازادییەکی تاکەکەسیی زیاتر بداتە نەوەکانی میللەتەکەی. ئەو زۆردارەی پانتاییەکی فراوانتری ئازادی بۆ میللەتەکەی دەستەبەردەکات، لەوانەیە دادپەروەرنەبێت و هانی نابەرابەریی توندڕەوانە بدات و هیچ بایەخێک بە سیستەم، یان چاکەکاری، یاخود زانین نەدات. ئەگەر ئەوەشی کرد، بەبێ ئەوەی ئازادیی تاکەکان سەرکوت بکات، یان بە ڕادەیەکی کەمتر لەوەی ڕژێمەکانی تر سەرکوتکردنی ئەنجامدا، بەوە تەبادەبێت لەگەڵ وەسفکردنەکانی میلدا[٩].

ئازادی بەم تێگەیشتنە لە ڕووی لۆژیکییەوە پەیوەندیی بە دیموکراسی یان ئۆتۆنۆمییەوە نییە. لەوانەیە ئۆتۆنۆمی زیاتر لە ڕژێمەکانی تر گەرەنتییەکی باشتر بخاتەڕوو بۆ پاراستنی ئازادییە مەدەنییەکان و لایەنگرانی ئازادیش (لە بیر و پراکتیکدا) داکۆکییان لێ کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێویست پەیوەندییەک لەنێوان ئازادیی تاک و سیستەمی دیموکراتیدا نییە. وەڵامدانەوەی پرسیاری: کێ فەرمانڕەواییم دەکات؟ لۆژیکیانە جیاوازە لەگەڵ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا: ڕادەی دەستوەردانی حکومەت لە کاروبارەکانم چەندە؟ جیاوازیی لەنێوان هەردوو چەمکی ئازادیی "پۆزەتیڤ" و "نێگەتیڤ"یشدا جیاوازیی نێوان ناوەڕۆکی وەڵامی ئەم دوو پرسیارەیە[١٠]. چەمکی ئازادیی "پۆزەتیڤ" کاتێک ڕووندەبێت، کە هەوڵبدەین

٩- ئەمە مەسەلەیەکە شایستەی گفتوگۆکردنە، چونکە گشت پۆلەکانی بەهرەمەندان و داهێنەران و کەمایەتییەکان لە بروسیای سەردەمی فردریکی مەزن، یان نەمسای سەردەمی جۆزیفی دووەمدا کەمتر دووچاری چەوساندنەوە دەبوون و فشاری دامەزراوەکان و دابونەریتەکان نەدەکەوتە سەریان، وەک باری دیموکراسییەکانی کۆن یان نوێ.

١٠- هەندێک جار و لە باری دیاریکراودا سەختە ڕادەی «ئازادیی نێگەتیڤ» بخەملێنرێت، چونکە سەرەتا وەک شتێک دەردەکەوێت، کە پشتبەستووە بە توانای هەڵبژاردنی شتێک لەنێوان دوو شتدا. لەگەڵ ئەوەدا گشت هەڵبژاردنەکان ئازاد نین، یان بەهەمان ئەندازە ئازاد نین. ئەگەر لە سایەی حکومەتێکی دیکتاتۆریدا– لە ژێر هەڕەشەکردن و ئەشکەنجەداندا، یان بەهۆی ترسی لەدەستدانی کارەکەمدا – خیانەتم لە هاوڕێکەم کرد، ئەوا دەکرێت بوترێ ئەوەم بەتەواوی ئازادیی خۆم ئەنجام نەداوە و هەڵبژاردنم نەکردووە، واتە کوشتن و ئەشکەنجەدان و زیندانم بۆ ئەوانی تر هەڵنەبژاردووە. تەنیا لەبەر بوونی ئەگەری تر ناکرێت هەڵبژاردنەکەم بەواتای ئاسایی وشەکە ئازادانە بێت (ئەگەرچی کارەکەم بەخواستی خۆم بووبێ). وەک دەردەکەوێت ئازادیم پشتبەستووە بە: (ا) ئەو دەرفەتانەی لەبەردەستمدان (ئەگەرچی شێوازی ئاشنابوون پێیان ئیمپرسیۆنیستانەی سۆزدارانە بێت). دەرفەتەکان وەک سێو ناژمێرێن، چونکە خاوەن قەوارەی دابڕاو نین، هەتا بەبێ کۆششکردن بژمێررێن. (ب) ڕادەی ئاسانی یان سەختیی گۆڕینی ئەو دەرفەتانە بۆ شتی واقعی. (ج) گرنگیی ئەم دەرفەتانە لە شێوازی ژیانم و لە هەموو هەلومەرجەکانیدا، کاتێک بەیەکتری بەراورد دەکرێن. (د) ڕادەی توانای کرانەوەی یان داخرانی بەپێی چالاکیی مەبەستداری مرۆڤ. (هـ) ئەو بەهایەی بەم دەرفەتانە دەدرێت، نەک لەلایەن تاکەکانەوە بەتەنیا، بەڵکو لەلایەن ڕای گشتیی ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژین. پێویستە گشت ئەو دەرفەتانە یەکبخرێن بۆ بەدەستهێنانی سەرەنجامێک، کە بەپێویست بەجۆرێک وردبینانەی مشتومڕهەڵنەگر نابێت. دەشێت چەندین شێوازی ناهاوسەنگی ئازادی هەبن، کە سەختە بە یەک پێوانە بپێورێن. هەروەها ئێمە ڕووبەڕووی چەندین کێشە دەبینەوە، کە لە ڕووی لۆژیکییەوە نامۆن بەلای کۆمەڵگەکانەوە، وەک: ئایا ڕێکخستنێکی وەها وادەکات ئازادیی کەسی (ا) زیاتربێت لە ئازادیی کەسانی (ب)و (ج) و (د) بەیەکەوە؟ ئەم کێشانە لە کاتی پیادەکردنی پێوانە بەکەڵکایەتیەکاندا سەرهەڵدەدەن. لەگەڵ ئەوەشدا، مادام داوای پێوانەکردنێکی ورد ناکەین، ناتوانین بیانووی ڕەوا بۆ ئەو قسەیەمان بدۆزینەوە، کە دەڵێت ئازادیی دەستوپێوەندە ئاساییەکانی شای سوید بەشێوەیەکی گشتی زۆر زیاترە لە ئازادیی هاوڵاتیی ئاسایی لە ئیسپانیا یان ئەلبانیا. چونکە پێویستە کۆی نموونەکان وەک چەند بەشێکی گشتی بەراوردبکرێن، ئەگەرچی ئەو شێوازەی بۆ بەراوردکردن و ڕاستیی سەرەنجامگیریی پیادەکراومان سەختە، یان شایستەی شرۆڤەکردن و ڕوونکردنەوە نین. لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵۆزیی چەمکەکان و فرەیی پێوانە و هاوسەنگییەکان سیفەتێکی جیاکارەی هەمان بابەتە و خەوشییەک نییە لەو شێوازەی پیادەیدەکەین بۆ پێوانەکردن، یان دەستەپاچەیی نییە لە فیکری وردبیندا.

وەڵامی پرسیاری: کێ فەرمانڕەواییم دەکات؟ بدەینەوە، نەک وەڵامی پرسیاری: دەتوانم ئازادانە چی بکەم یان ببم بەچی؟ پەیوەندیی نێوان دیموکراسی و ئازادیی تاکەکەسی لەوە ئاڵۆزترە لایەنگرانی هەردووکیان تێی دەگەن. خواستی ئەوەی لەلایەن خۆمەوە بەڕێوەببرێم، یان بەشداریکردن لەو پرۆسەیەی ژیانم کۆنترۆڵدەکات، خواستێکە هێندەی خواستی بەدەستهێنانی دەرفەتی کاری ئازاد قووڵە و تەنانەت لەو مێژووە کۆنترە، بەڵام خواستی بەدەستهێنانی هەمان شت نییە. جیاوازییەکە بەڕادەیەک گەورەیە، کە دەبێتە هۆی پێکدادانی ئەو ئایدیۆلۆژیانەی لە جیهانەکەماندا باڵادەستن. چونکە ئەم ئازادییە – ئازادی بە تێگەیشتنە پۆزەتیڤەکەی– مانای ڕزگاربوون نییە "لە"، بەڵکو ڕزگاربوونە "بۆ"– بۆ بەدەستهێنانی شێوازێکی دیاریکراوی ژیان، کە لایەنگرانی تێگەیشتنی "نێگەتیڤانە" دروستیدەکەن و هەندێک جار تەنیا دەمامکی ستەمکارییەکی دڕندانەیە.

## چەمکی ئازادیی پۆزەتیڤ:

تێگەیشتنی "پۆزەتیڤانە"ی وشەی "ئازادی" بەرهەمی خواستی مرۆڤە بۆ ئەوەی سەرگەورەی خۆی بێت. من حەزدەکەم لە ژیان و بڕیاردانەکانمدا پشت بە خۆم ببەستم، نەک بە چەند هێزێکی دەرەکی، جا هەر جۆرێک بن. من حەزدەکەم ئامڕازی دەستی خۆم بم، نەک ئامڕازێک کە ئەوانیتر کۆنترۆڵی دەکەن. من حەزدەکەم بکەربم، نەک کارلێکراو و بەهۆی بیرکردنەوە و بەپێی چەند ئامانجێکی هوشیارانە ڕێبکەم کە هی خۆمن، نەک بەپێی ئەو هۆکارانەی لە دەرەوەڕا دەسەپێنرێن بەسەرمدا. من حەزدەکەم کەسێک بم نەک هیچ، خۆم دیاریی ئەوە بکەم حەز بە ئەنجامدانی چ کارێک دەکەم، نەک بەپێی فرمانی ئەوانی تر کاربکەم، خۆم ئاڕاستەکەر بم، نەک ئەوانیتر ئاڕاستەم بکەن، وەک ئەوەی شتێک یان گیانلەبەرێک یاخود کۆیلەیەک بم و نەتوانم ڕۆڵی مرۆڤێک ببینم، کە درک بە ئامانجەکانی خۆی دەکات و بیریان لێ دەکاتەوە و ئەو شێواز و میتۆدە تاکەکەسیانە هەڵدەبژێرێت، کە دەیەوێت بیانهێنێتەدی. لانی کەم ئەمە بەشێکە لە مەبەستەکەم، کاتێک دەڵێم من خاوەن بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانیم و هەر ئەمەشە وەک مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تری جیهان جیام دەکاتەوە. سەرباری هەموو ئەوانە حەزدەکەم، وەک بوونەوەرێکی بیرکەرەوە و خوازیار و چالاک، درک بە بوونی خۆم بکەم. ئەو بوونەوەرەی بەرپرسیارێتیی بژارەکانی خۆی دەگرێتە ئەستۆ و توانای ڕوونکردنەوەیانی هەیە، بە گەڕانەوە بۆ بیروڕا و ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی. من بەو ڕادەیە هەستدەکەم ئازادم، بڕوام بەوەبێ ئەمە ڕاستییە و بەو ڕادەیەش هەستدەکەم کۆیلەکراوم، کە وام لێ دەکات درک بەوە بکەم لە بارێکدام هیچ پەیوەندییەکی بە ڕاستییەوە نییە.

ئەو ئازادییەی وا لە تاک دەکات سەرگەورەی خۆی بێت و ئەو ئازادییەی وا دەکات لەلایەن ئەوانی ترەوە ڕێگە لەوە نەگیرێت کە دەمەوێت بیکەم، دوو تێگەیشتنن لە ڕواڵەتدا جیاوازییان لەگەڵ یەکتر نییە، وەک ئەوەی لەنێوان تێگەیشتنی "نێگەتیڤ" و "پۆزەتیڤ"ی ئازادیدا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو چەمکی

"نێگەتیڤ" و "پۆزەتیڤ" لە مێژوودا بە ئاڕاستەی پێچەوانە گەشەیانکردووە و هەمیشە بە هەنگاوی لۆژیکیی ماقوڵ گەشەیانکردووە و لەکۆتاییشدا ئەوانە کەوتوونەتە ناکۆکییەوە لەگەڵ یەکدا.
یەکێک لە ڕێگەکانی ڕوونکردنەوەی ئەوە، ئەو چالاکییە سەربەخۆیەیە کە زاراوەی سەرگەورەی خۆیی هەنگاوی لێوە هەڵهێناوە و بەکارهێنانی هیچ زیانێکی نییە: "من سەرگەورەی خۆمم" و "من کۆیلەی کەس نیم"، بەڵام (وەک پێڕەوکارانی ئەفلاتون و هیگڵ هێمایان بۆ کردووە) ئایا ناشێت من کۆیلەی سروشت یان ئارەزووەکانم بم، کە کۆنترۆڵ ناکرێن؟ ئایا ئەمانە چەند جۆرێکی "کۆیلە"ی هاوشێوەی کۆیلایەتیی بنەڕەتی نین، کە هەندێکیان سیاسین و هەندەکەی تر یاسایی، یان ئەخلاقی، یاخود ڕۆحی؟ ئایا مرۆڤ ئەزموونی ڕزگاربوون لە کۆیلایەتیی ئەخلاقی یان سروشتی (کۆیلایەتیی خۆماکە سروشتییەکان) نەبووە و ئەنجامی ئەم ئەزموونە بۆی دەرنەکەوتووە لەناو ناخیدا لایەنێکی زاڵی پایەبەرز و لایەنێکی بێکەڵکی وەها هەیە کە دەبێت کۆنترۆڵ بکرێت؟ خودی زاڵ لە زۆر ڕووەوە بە لۆژیک و "سروشتی پایەبەرز"ی مرۆڤ دەچێت، ئەوەیە کە تاقیدەکاتەوە و هەڵدەسەنگێنێ و بیر لە سەرەنجامەکان دەکاتەوە و ئامانجی هێنانەدیی ئەوەیە کە لەسەر ئاستی دوورمەودا تەبایە لەگەڵ خودی "ڕاستەقینە"، یان "نموونەیی"، یاخود "سەربەخۆ". ئەو خودەی جیاوازە لەگەڵ مەیلە نائەقڵانییەکان و ئارەزووە سەرکێشەکان و خودی "ژێرەوە" کە کۆششدەکات بۆ ئەوەی ئارەزووی دەستوبرد بەدەستبێنێ. هەروەها ئەو خودەی ملکەچی ئارەزوو و هەستی وەهایە کە پێویستیان بە تەمێکردنی توند و دڵڕەقانە هەیە، ئەگەر مەبەست بەرزکردنەوەی بێت بۆ ئاستی سروشتی "ڕاستەقینە"ی خۆی. دەکرێت ئەم دوو خودە وەک لێکدابڕاو بکەونەڕوو: خودی ڕاستەقینە گەورەتر و فراوانتر لە تاک و "گشتێکی" کۆمەڵایەتیدا چڕبکرێتەوە، کە تاک تیایدا دەبێتە پێکهاتەی هۆزێک، ڕەگەزێک، کڵێسایەک، دەوڵەتێک، یان کۆمەڵگەیەکی گەورەی بوونەوەرە زیندوو و مردووەکان و ئەوانەی لەدایکیش نەبوون. کەواتە ئەم قەوارەیە ئەو خودە "ڕاستەقینە"یەیە، کە دەتوانێت ئازادی بۆ خۆی و هەموو ئەو پێکهاتانە بهێنێتەدی، ئەمەش ئەگەر توانیی ویستی بەکۆمەڵ یان "ڕێکخراوەیی" خۆی بسەپێنێ بەسەر توخمە یاخییەکان و سەرەنجام بەسەر ئازادیی "باڵا"دا. مەترسیی بەکارهێنانی مەجازیی ئەو زاراوە ڕێکخراوەییانە، بەمەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ فشارهێنانی هەندێک مرۆڤ بۆ هەندێکی تر، لەپێناو بەرزکردنەوەیاندا بۆ ئاستێکی "باڵاتر"، هەمیشە هێمای بۆ کراو، بەڵام ئەوەی وادەکات ئەم زمانە مەجازییە قبوڵکراوبێت ئەوەیە، ئەو بارە ڕووندەکاتەوە کە ئێمە تاوتوێیدەکەین. چونکە دەکرێت پاساوبهێنرێتەوە بۆ فشارخستنە سەر مرۆڤەکان و ناچاربکرێن کارێک بکەن لەپێناو هێنانەدیی چەند ئامانجێکدا (بۆ نموونە، دادپەروەری و تەندروستیی گشتی). تاکەکان کاتێک دەتوانن بەبێ فشار و ناچارکردن ئەمە بکەن، کە ئاستێکی باشی ڕۆشنبیری و زانستییان هەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی نابینان، یان نەزانن، یاخود ئاست نزمن ئەوە ناکەن. بۆیە دەکرێت درک بەو هۆیە بکرێت، کە وام لێ دەکات فشار بۆ ئەوانیتر بهێنم و ناچاریان بکەم کارێک بکەن سوود بەوان بگەیەنێت، نەک بە من. بەو جۆرەش لافی ئەوە لێ دەدەم لەوان زیاتر ئاشنام بە پێداویستییە ڕاستەقینەکانی ئەوان. ئەمەش وایان لێ دەکات چۆک دابدەن و یاخی نەبن، ئەگەر

ئاقڵیش بن درک بەوە بکەن کە بۆیان باشە، وەک چۆن من درکی پێ دەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت ئەو سنوورەی فشارهێنان و ناچارکردنە تێپەڕێنم و لافی ئەوە لێ بدەم، ئەوان لەباری نەزانیدا شتێک دەکەن کە لە کاتی هۆشمەندبووندا نایکەن، چونکە لەوانەیە هەندێک جار باری هۆشمەندی و درککردن ئاڵۆز و داپۆشراو بێت، ئەوەش ویستی ئەقڵانی و خودی "ڕاستەقینە"یە. هەروەها خودی "نەزان" شتێک دەربارەی خودی ئەقڵانیی "ڕاستەقینە" نازانێت و ناکۆکە بەوەی هەستی پێدەکات و دەیکات و بەئاشکرا قسە دەربارەی دەکات. بەم جۆرە ئەم خودە تاقە خودە کە ئارەزووەکانی شایانی بایەخپێدانن(١٠).
کاتێک لەم گۆشەنیگایەوە سەیردەکەم، دەستدەکەم بە فەرامۆشکردنی خواستە ڕاستەقینەکانی مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکان و بەناوی خودی "ڕاستەقینەیانەوە" دەیان چەوسێنمەوە و ئەشکەنجەیان دەدەم، چونکە تەواو ئاشنام بەوەی هەر ئامانجێکی ڕاستەقینەی مرۆڤ (وەک بەختەوەری، ڕاییکردنی ئەرکی سەرشان، دانایی، کۆمەڵگەی دادپەروەر و هێنانەدیی ئارەزووەکانی خود) دەبێت تەبابێت لەگەڵ ئازادیی ئەودا- واتە سەرباری ئەوەی لاڵ و ئاڵۆز بێت، هەڵبژاردنی ئازادانە بۆ خودی ڕاستەقینەی بۆ ڕەخسابێت.
گەلێک جار پەردە لە ڕووی ئەم ناکۆکییە ڕواڵەتییە هەڵماڵراوە، چونکە جیاوازی لەنێوان دوو دەربڕیندا هەیە: یەکەم بڵێم دەزانم چی باشە بۆ فلانە کەس کە خۆی نازانێت و لەپێناو سوودی ئەودا خواستەکانی فەرامۆش بکەم. دوەم بڵێم فلانە کەس هەڵبژاردنەکەی بەپێی سروشتی خۆی بووە، نەک وەک لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەردەکەوێت، بەڵکو وەک خودێکی ئەقڵانی خودەکەی "تر" کە پشت بە بینین و ئەزموون دەبەستێت، یان خودێکی "ڕاستەقینە"یە درک بەوە دەکات کە باشە و دەبێت هەڵبژێرێت. ئەم زیندانە دڕندەیەی وادەکات ئەوەی فلان دەشێت هەڵیبژێرێت، ئەگەر بووە شتێکی ناکۆک بە سروشتی خۆی، لەگەڵ ئەوەی "فلان" بەڕاستی ئامانجییەتی حەز بە هەڵبژاردنی دەکات، ناوکی گشت ئەو تیۆرە سیاسیانەیە کە پەیوەندییان بە درک بەخۆ کردنەوە هەیە. ئەگەر وتم لەوانەیە ناچاربکرێم بەشتێک کە لە بەرژەوەندیی خۆمدایە و بەهۆی دەستەوستانی خۆمەوە درکی پێ ناکەم- واتە ئەم ناچارکردنە سوودبەخشە بۆ من- ئەوا ئەم وتەیە تەواو جیاوازە لەگەڵ ئەم وتەیەمدا: ئەگەر ناچارکردنەکە لە بەرژەوەندیی مندا بێت، ئەوا زۆرەملێیانە ئەو کارەم ئەنجام نەداوە، چونکە بەویستی خۆم بووە، جا هۆشمەندانە بووبێت یان نا. لە "ڕاستیدا" من ئازادم، تەنانەت لەو کاتەی جەستەی لاوازم و ئەقڵی گەمژەم ئەوە ڕەتدەکاتەوە و بەتوندی بەرەنگاری ئەوانە دەبمەوە کە ئەو زۆرەملێیە بەسەرمدا دەسەپێنن، ئەگەر مەبەست لە پشت ئەو ناچارکردن و زۆرەملێیەشەوە سوودی گشتی بێت.
دەشێت ئەم گۆڕانکارییە تەلیسماوییە یان فریودانەی ولیەم جێمس بەهۆیەوە گاڵتەی بە هیگڵیستەکان دێت- کە تەواو هەقی خۆیەتی- بەشێوەیەکی خراپ و بە ئاسانی لەگەڵ چەمکی ئازادیی "نێگەتیڤ"دا بەکاربهێنریت، کە تیایدا ئەو خودەی نابێت دەستوەردرێتە کاروبارەکانی، چیدی تاکێکی خاوەن خواست و پێداویستییە ڕاستەقینەکانی خۆی نابێت، ئەوەی بەشێوەیەکی سروشتی درکیان پێ دەکات، بەڵکو ئەو مرۆڤە "ڕاستەقینە"یە دەبێت کە لە ناخیدایە و کۆششدەکات بۆ ئەو ئامانجە نموونەییانەی خودەکەی

تری خەونی پێوە نابینێت، چونکە چەند ئامانجێکی دوورەدەستن. وەک باری خودی ئازاد، دەکرێت ئەو بوونەوەرە بگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی گەورەتر لەوەی هەیە، هەتاکو قەبارەیەکی هەبێت کە قەبارەی تاکەکەسی تێدەپەڕێنێ، وەک دەوڵەت، چینی کۆمەڵایەتی، میللەت، یان خودی مێژوو. ئەمەش واقعیترە و خاوەن چەند خەسڵەتێکی جیاوازە لەگەڵ خودی ئەزموونگەردا... بەڵام تێگەیشتنی "پۆزەتیڤانە"ی ئازادی وەک خودسەروەری، لەگەڵ پێشنیارەکەی دەربارەی مرۆڤێک کە دژی خۆی کەرتبووە، کۆتایی پێ هاتووە و بەئاسانی وەک سەرەنجامێکی مێژوویی یان پراکتیکی کەرت دەبێت بۆ دوو بەش: خودی پایەبەرزی ئاڕاستەکاری باڵادەست و ئەو خودەی بریتییە لە تەنێک هەستوسۆز و خواست کە پێویستی بە پەروەردەکردنە. ئەمە ئەو حەقیقەتە مێژووییەیە کە کاریگەریی گەورەی هەیە و ئەوە ڕووندەکاتەوە (ئەگەر مەسەلەکە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەبێت) وێناکردنەکانی ئازادی ڕاستەوخۆ لەو بیروڕایانەوە سەرچاوەدەگرن کە وێڵن بەدوای ئەوەی بزانن خود مانای چییە، تاک یان مرۆڤ چ واتایەکی هەیە. بە جۆرێک گەمەکردن بە پێناسەی مرۆڤی گەمەکار دەتوانێت وابکات ئازادی ئەو مانایەی هەبێت کە خۆی دەیەوێت و بیخاتە ناو ئەو چوارچێوەیەی خواستییەتی. مێژووی نوێش ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە ئەمە تەنیا مەسەلەیەکی ئەکادیمی نییە.
سەرەنجامەکانی لێک جیاکردنەوەی هەردوو خودەکە ڕوونتردەبێتەوە، ئەگەر ڕوانیمانە ئەو دوو شێوە بنچینەییە کە خواستی ئاڕاستەکردنی خۆیی- واتە ئاڕاستەکردنی تاک لەلایەن خودی "ڕاستەقینە"کەیەوە - لە مێژوودا بەخۆوەی دیوە: یەکەمیان خۆنەویستی لەپێناو سەربەخۆییدا، دووەمیان درککردنی خود یان تەماهیکردنی خود لەگەڵ پرنسیپێک یان ئایدیالیزمێکی دیاریکراودا، لەپێناو هێنانەدیی هەمان ئامانجدا، واتە سەربەخۆیی.

سەرچاوە:
کتێبی "سنوورەکانی ئازادی"، نووسینی ئیزایا بەرلین، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە جومانە تالیب، بڵاوکراوەی (دار الساقی)، چاپی یەکەم ١٩٩٢.

# فەیلەسووفی ئازادی

نووسینی: ک. ئێسکێنێر
و. لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

پاش کۆتایی هێنان بە نووسینی کتێبی «میر» سەرلەنوێ، مەکیاڤیلی بۆ گەڕانەوە بۆ ئیش و کاری حکوومی، خۆشی کەوتە دڵیەوە. لە دێسامبەری ١٥١٣ لە نامەیەکدا کە بۆ ڤیتۆری نارد نووسیبووی: «گەورەترین ئارەزووی من ئەوەیە خزمەتی خاوەن شکۆکانی بنەماڵەی مێدیچی (Giuliano de Medici) بکەم هەرچەندە لە سەرەتادا تەنانەت تاشە بەردێکم پێ بسپێرن تا بیتلێنمەوە». ئەو پێی وابوو باشترین ڕێگەی گەیشتن بەم ئاواتە، ڕۆیشتن بۆ ڕۆما و پێدانی ئەو (نامیلەکە بچووکەی خۆی) یەتی بە جولیانۆ مێدیچی، تا بەو جۆرە پێی بسەلمێنێ «ئەبێ دڵخۆش بێ لەوەی کە کەسێکی وەکو مەکیاڤیلی لای ئەو کاربکات».

ڤیتۆری وەکو ئەوەی حەزی لە جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بێت لە وەڵامی مەکیاڤیلیدا، داوای لێکرد تا کتێبەکەی بۆ بنێرێت تا بزانێت شیاوی ئەوە هەیە بڵاوبکرێتەوە یان نا؟ مەکیاڤیلی بەشە ئامادەکراوەکەی نارد و ڤیتۆری بۆی نووسی: «زۆر بەلامەوە جوان بوو لێ چونکا هەموو بەشەکانی کتێبەکەم بەتەواویی لانیە ناتوانم حوکم بدەم». دڵخۆشیەکەی مەکیاڤیلی زۆری نەخایاند، ڤیتۆری لە سەرەتای ١٥١٤ کتێبی (میر)ی خوێندەوە و لێی بێدەنگ بوو. چیتر باسی کتێبەکەیان نەکرد و لە نامەکانیاندا لە وەڵامدا، باسی خۆشەویستی و شتی سەیر و سەمەرەیان ئەکرد.

مەکیاڤیلی ئەیویست وەکو ئەوان کەمتەرخەم خۆی پیشانبدات بەڵام ئاشکرابوو نەیدەتوانی دڵەڕاوکەی ڕووە لە زیاد بوونی خۆی بشارێتەوە. لە ئاکامدا و لە ناوەڕاستی ساڵدا، نائومێدانە و دڵشکاو، لە

نامەیەکدا بۆ ڤیتۆری نووسی: «نامەوێ چیدی هەوڵ بدەم وادیارە جگە لە درێژەدان ئەم ژیانە سووک و بێ نرخە، چارەیەکم نیە تەنانەت کەسێک نابینم خزمەتەکانی من وەبیربێنێتەوە یان بڕوای بەوە هەبێ کە ئەز دەتوانم کارێکی بەسوود بکەم».

پاش ئەم نائومێدیە، ژیانی مەکیاڤیلی بەرەورووی گۆڕانکارییەکی بەردەوام بووەوە، بە چەشنێک چالاکی سیاسی وەلانا و هێدی هێدی خۆی وەکو نووسەر و هونەرمەند دەبینیەوە هەربۆیە پاش ساڵێک بێ کاری، بوو بە ئەندامی کارای یەکێک لە گرووپە نووسەرە هیومانیستەکان و بەردەوام بە مەبەستی کات بەسەربردن و وتوێژی زانستی، لە باخی کۆزیمۆ ڕووچەلای (Cosimo Rucellai) لە نزیکی شاری فلۆرانس لەگەڵ ئەواندا کۆدەبووەوە. لەم دانیشتنانە، بە زۆری باسی ئەدەب، تایبەتمەندی زمانی لاتین و ئیتاڵی، خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی و شانۆیی دەکرا بەڵام وزە و توانای داهێنەرانەی مەکیاڤیلیی بەرەو ئاراستەیەکی تازە برد و وای لێکرد هەوڵبدات دەقێکی شانۆیی بنووسێت. بەرهەمی ئەم فکرەش، کۆمێدیای درەوشاوەی، زمان زبر و بێ بەزەییانەی ماندراگۆلا Mandragola بوو. لەم شانۆنامە کە ڕەنگە لە ١٥١٨ نووسراوبێت، باسی تەفرەدانی ژنێکی جوان و دڵڕفێن دەکرێت کە هاوسەری حاکم (قازی)یەکی بەساڵاچووە و بە دڵنیاییەوە پێش ئەوەی لە ڕۆما و فلۆرانسدا نمایش بکرێت دۆستەکانی مەکیاڤیلی دەقەکەیان خوێندبۆوە. ئاشکرایە لەم دانیشیتنەدا بەپێی نووسراوەکەی ئانتۆنیۆ برۆچێلی Antonio Bruciali، لە ژێر ناوی (وتووێژ Dialogues) بۆمان دەردەکەوێت کە باسی سیاسەت و بەتایبەت چارەنووسی دەستەڵاتی کۆماری و چۆنیەتی گەورەبوون و پارێزگاریان لە ئازادی و تێوەگلانیان لە گەندەڵی و هەروەها ڕووخان و فەوتانیان دەکرا. هەرچەندە ئەم باسانە دەربارەی ئازادی مەدەنی لە قسە تێنەدەپەڕی بەڵام هەندێک لە ئەندامانی ئەم گرووپە ئەوەندە دژی گەڕانەوەی دەستەڵاتی ستەمکاری بنەماڵەی مێدیچی بوون کە لە ١٥٢٢دا لە پیلانێکی سەرنەکەوتوودا، هەولێ کوشتنی کاردینال جولیۆ مێدیچی Giulio Medici یان دا و دواتر لەسەر ئەم تاوانە یاکوپۆ دیا تیچتۆ Jacopo da Diacceto کوژرا و سێ ئەندامی چالاکی گرووپەکە دوورخرانەوە و کۆبوونەوەکانی گرووپ کۆتایی پێ هات لێ لەبەرئەوەی مەکیاڤیلی ئەوەندە لایەنگری ئازادی لە شێوەی کۆماریدا نەبوو نەیدەویست لە هیچ پیلانێکی هاوشێوە دژ بە مێدیچی بەشداری بکات، هەرچەندە لەژێر تەئسیری ئەواندا، لە ١٥٢١ (نامیلکەی شەڕ)ی نووسی و دواتریش لەژێر ئەم تەئسیری لایەنگرانی کۆماری، وتارەکانی لەژێر ناوی (دە بەرگی یەکەمی مێژووی لی وێوس)دا نووسیەوە کە بە درێژترین و جوانترین و تازەترین نووسراوی مەکیاڤیلی لە فەلسەفەی سیاسیدا ئەژمار دەکرێت. دەبێ ئەوەش بزانین کە مەکیاڤیلی هەر لە سەرەتای هاوینی ١٥١٣ نوقمی خوێندنەوەی مێژووی کۆن و هەروەها نووسراوەکانی لی وێوس بوو لە سەرەتای نووسینەکانیشیدا ئەم خوێندنەوەی مێژوو بە سەربەرزی بۆ




خۆی دادەنێت بەڵام پاڵنەری ئەو بۆ نووسینەوەی ئەندێشەکانی، ئەندامانی گرووپی (ئۆرتی ئۆریچەلار) بوون و هەر بۆیە نووسراوەکانی بە شێوەی باوی هیومانیستەکانی ئەو سەردەمە، زۆرتر لەژێر ناوی لێکدانەوە و شرۆڤەی دەقە کۆنەکاندا بڵاودەکردەوە و گوتارەکانی پێشکەش بە (ڕۆچەلایی) و (بویێن دێلمۆنتی) کردووە و نووسیویەتی: «هاوڕێکانم ناچاریان نەکردایەم خۆم هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەم بیرۆکانە بنووسم».

### ئامرازی گەورەیی

مەکیاڤیلی لە گوتارەکانیدا، لە کاروباری سوپا و کێشەکانی وڵاتی ڕۆمی کۆن دەدوێت، بەڵام لە توێژینەوەی لە مێژووی سەرەتای ڕۆم کێشەیەک سەرقاڵی دەکات، ئەم کێشە هەرچەندە لە سەرەتای گوتاری یەکەمدا باسی لێکراوە بەڵام لە حەقیقەتدا، لە زۆربەی لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا، دیار و ئاشکرایە، ئەو دەڵێت: «حەزدەکەم بزانم هۆکارەکانی زاڵ بوونی کۆماری ڕۆم چی بوون؟»».

ئاشکرایە لە نێوانی ئەم بابەتە و کتێبی (میر) پەیوەندیەک بەدی دەکرێت. ڕاستە کە مەکیاڤیلی لە میردا، بەلای حکوومەتی کۆماریدا ناچێت و لە گوتارەکانیدا، زۆربەی بەڵگە و نموونەکانی لە دەسەڵاتی کۆماری وەرگرتووە. بەڵام ئەمە هەڵەیەکە وابزانین لە گوتارەکانیدا بەتەنیا باس لە کۆمارەکان دەکات بەبێ ئاوڕدانەوە لە پاشایەتی. لە بەشی دووەمدا، دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کە سەرەڕای کۆمارەکان، ئاوڕێ لە دەستەڵاتی شارەکانیش داوەتەوە چ ئەم شارانە لەژێر دەسەڵاتی کۆماریدا بن یان دەسەڵاتی پاشایەتیدا. خاڵی تری هاوبەش ئەوەیە لە (میر)دا، مەکیاڤیلی ئامۆژگاری پاشاکان دەکات بۆئەوەی بە ئەنجامدانی کاری مەزن، سەربەرزی بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن و لە وتارەکانیدا ئەم ئارەزووە لەوەدا دەنگدەداتەوە کە چۆن هەندێک وڵات و شار توانیویانە پلەی گەورەیی ببڕن بەتایبەت ڕۆم کە بە (ترۆپکی گەورەیی) گەیشت و (دەسکەوتی گەورەیان) وەرگرت . ئەم پرسیارە کە «هۆکارەکان و ڕێگەکانی گەیشتن بە گەورەیی چین؟» سەرنجی مەکیاڤیلیی بەتەواوی ڕاکێشابوو لەبەرئەوەی وەڵامەکەی بەجۆرێک قسەی هیومانستەکانی دەسەلماند کە دەیانگوت: «هەرکەس، کێشەکانی ئێستا و ڕابردوو تاوتوێ بکات تێدەگات کە داواکاریەکان و تایبەتمەندیەکانی مرۆڤەکان زۆر لێکدەچن» بە واتایەکی تر «ئەو کەسەی بە هەوڵی بەردەوام و بە جیدی ڕووداوەکانی ڕابردوو بخوێنێتەوە، داهاتوو پێشبینی دەکات و هەر ئەو ڕێگە چارەسەریە کە لە کۆندا بەکارهێنراوە، بەکاری دەهێنێت بە شێوازێکی تازە و گونجاو بۆ ڕووداوی هاوشێوە لە داهاتوودا» هەر لێرەوە دیارە بنەما و ڕۆحی کۆی گوتارەکان، ئەم ئومێدە دڵخۆشکەرەیە ئەگەر بتوانین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕۆم لە کۆندا بزانین ڕەنگە ئێمەش بتوانین ئەو سەرکەوتنە دووپات بکەینەوە. بەڕای مەکیاڤیلی، کلیلی تێگەیشتنی ئەم سەرکەوتنەی ڕۆم بە کورتی ئەم دێڕەیە «ئەزموون پیشانی داوە کە وڵاتەکان بە فراوانکردنی سنوور و سەروەت و

سامان ناتوانن بەختەوەر ببن مەگەر ئەوەی بە ئازادی بژین». بۆ سەلماندنی ئەم حەقیقەتە گشتیە، جیهانی کۆن دوو نموونەی سەرنجراکێشمان پێشکەش دەکات. یەکەم: «سەرسورهێنەرە کاتێک دەبینین ئەسینا، پاش سەدسالّ لە سەرکەوتنیدا بەسەر حکومەتی پیسیستراتۆس (Pisistratus- ٥٢٧ پ.ز - دیکتاتۆری ئەسینا) بەو پلە لە گەورەیی دەگات» لەوەش گرنگتر ئەمەیە کە «ڕۆما پاش شەڕ دژی دەسەلآتی پاشاکانی خۆیان، بەو گەورەییە دەگەن» . لە لایەکی دیکەشەوە، پێچەوانەی ئەم شتانە، لەو وڵاتانە دێنە ئاراوە کە خەڵکەکەی وەکو کۆیلە ژیاون . بۆیە «هەر کە ستەمکارێک دەسەلآتی کۆمەڵگایەکی حوڕی گرتە دەست یەکەم نەگبەتی ئەوەیە چیدی نە بەرەوپێش دەچن و نە دەسەلآت و سامانیان زیاد دەکات بەڵکو بەرەو دوا دەگەڕێنەوە» . مەبەستی سەرەکی لە ئەوەی کە مەکیاڤیلی بەردەوام باسی ئازادی دەکات ئەوەیە پێمان بڵێت، هەر شارێک بیەوێت گەورەیی خۆی بسەلمێنێت دەبێت لەهەر چەشنە کۆیلەیەتی سیاسی ئازادبێت چ ئەم کۆیلەیەتیەتی هۆکاری ناوەکی (دەسەلآتدارانی ستەمکار) یان هۆکاری دەرەکی واتە (داگیرکردن لەلایەن ئیمپراتۆری بێگانەوە) بێت .

بە واتایەکی تر کاتێک شارێک لە ئازادی بەهرەمەندە کە بتوانێت سەربەخۆیی خۆی لە تەئسیری هەر دەسەلآتێک، بێجگە لە دەسەلآتی کۆمەڵگا، بپارێزێت ئەمە یانی ئازادی واتە چارەنووسی خۆ دیاری کردن. مەکیاڤیلی لە بەشی دووەمی گوتاری یەکەمدا، ئەم چەمکە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: «لەو شارانەی خۆ دەبوێرم کە سەرەتا لەژێر دەسەلآتی کەسێکدا بوون، زۆرتر پەنجە دەخەمە سەر ئەو شارانەی کە هەر لە بیدایەتەوە ئازادبوون. مەبەست ئەو کەسانەیە خۆیان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان حوکمیان کردووە» . دواتر ئەم قسە، لە باس لە (یاساکانی سۆلۆن Solon- ٥٩٩- ٦٣٨ پ.ز. یاسادانەری ئەسینا)دا لەبەرئەوەی توانیبووی «شێوەیەک لە دەسەلآت بە حەزی خەڵک دابمەزرێنێت و ئازادی ژیانیان بۆ دابین بکات» دووپات دەکاتەوە .

بەمجۆرە نەتیجەی یەکەمی ئەم گوتارانە پێمان دەڵێت: «شارەکان بەو مەرجەی خەڵک خۆی بەڕیوەی ببات دەتوانن لە ماوەیەکی کورتدا بە سەربەرزی بگەن و پەرەبستێنن» ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە مەکیاڤیلی بەتەواوی بێبڕوا بێت بە پاشاکان لەبەرئەوەی جارناجار دەڵێت ماندنەوەی دەسەلآتی خەڵک هەرچەند هاوبەرژەوەندی نین لەگەڵ حکومەتی پاشایەتیدا، بەلآم لە زۆر شوێندا دەسەلآتی کۆماری لە پاشایەتی پێ باشترە . بەڵگەشی بۆ ئەم بۆچوونەی لە سەرەتای گوتاری دووەمدا ئەوەیە کە دەڵێت: «قازانجی هاوبەش پاڵ لە شارەکانەوە دەنێت بەرەو سەربەرزی بڕۆن نەک خێری تاکەکەسی، ئەم بەرژەوەندیە هاوبەشەش تەنیا لە دەسەلآتی کۆماریدا گرینگی پێدراوە» لە دەسەلآتی پاشایەتیدا، ئەمە ئاوژوو دەبێت لەبەرئەوەی «ئەو شتەی خێری پاشای تێدایە لە زەرەری خەڵکدایە و ئەوەی بە قازانجی خەڵکە زەرەری بۆ بەرژەوەندی پاشا تێدایە. لێرەوە دەردەکەوێت ئەو وڵاتانەی دەسەلآتی پاشایەتی




بەرپیوەی دەبات بە ئاستەم پێش کەوتن بەخۆوە دەبینن و چەواشەش، ئەو شار و ناوچانەی ئازادن، خێر و سوودی زۆرتریان دەست دەکەوێت» .

پرسیار ئەمەیە ئەگەر ئازادی ڕەمزی گەورەییە، خودی ئەم ئازادیە چۆن بە دەستی بهێنین و بیپارێزین؟ مەکیاڤیلی دەڵێت: «فاکتەری بەختەوەری پێویستە بۆ ئەوەی شارێک بە گەورەیی و سەربەرزی بگات هەروەها پێویستە بەبێ پاڵپشتی لایەک، لە ئازادی کەڵک وەربگرن» «ئەو شارانەی لە سەرەتاوە بە دیلی ژیاون، ناتوانن یاسایەک ببیننەوە بۆ ژیانێکی ئازاد و سەربەرزانە، ئەم ئەرکە لای ئەوان نەک زەحمەت، بەڵکو نامومکینە» .

لێرەشدا، وەکو کتێبی (میر) دەڵێت هەڵەیەکی کوشندەیە ئەگەر وەکو پلۆتارخۆس (Plutarchus – پلۆتارک ٤٦– ١٢٠ز) یان وی لیویۆس گەورەیی و بەختەوەری و شکۆیی ڕۆما بدەینە پاڵ شانس. من کە ناتوانم ئەم ئیدعایە قەبووڵ بکەم من لام وایە ڕۆمیەکان لە لایەکەوە لە بەخت سوودیان وەرگرت بەڵام گیرۆدەی دەیان بەڵا و کێشەی جۆراوجۆر بوونەوە لەلایەن ماخواکانەوە. بەم جۆرە بوو توانیان «ڕۆما بەهێز و گەورە و بەختەوەر بکەن»

دیسانەوەش وەکو (میر) تەئکید دەکاتەوە کە ئەم سەرکەوتنە بەرهەمی هاوبەشی شانس و سفەتی زەروری (ڤێرتو) بووە. هەر ئەو سفەتەی نەهامەتیەکان والێدەکات بە هێوری تەحەمولی بکەین و هاوکات دڵە بەخشندەیەکەی خواژنەکانیش بۆ لای خۆمان ڕابکێشین. ئەگەر بمانەوێت بزانین چی وای لە ڕۆما کرد زاڵ ببن بەسەر وەزعیەتەکەدا، وەڵامەکەی لەم واقعیەتەدایە ڕۆما خاوەن ڤێرتوی بەرز بوو و ئەم خەسڵەتەی تا چەند سەدە پاراست. ئەوان هەم ئازادی خۆیان پاراست و هەم بەسەر جیهاندا زاڵ بوون و ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەبوو کە بەختی خۆیان و بەرزترین پلەی ڤێرتویان ئاوێتە کرد . لە شرۆڤەکردنی چەمکی سەرەکی «ڤێرتو» مەکیاڤیلی لە کتێبی «میر» و لە «گوتارەکان»یشدا، ئەم وشەیە وەکو یەک بەکاردەهێنێت بەو جیاوازیەوە کە لە (میر)دا دەڵێت ڤێرتو وەکو سفەتی پێویستە لە هەموو سەرکردەی سیاسی و سوپاییدا بوونی هەبێت بەڵام لە گوتارەکانیدا بە ئاشکرا دەڵێت بۆئەوەی شارێک بە پلەی ڕێز و گەورەیی بگات دەبێت هەموو دانیشتوان (یان هاوڵاتی) خاوەنی ئەم بەها تایبەتمەندییە بن . هەبوونی (ڤێرتو) لای هەموو تاکێک پیشاندەری ئەوەیە ئەو کەسە دەبێت بۆ گەیشتن بە ڕێز و گەورەیی و سەربەرزی ژیانی شارەکەی ئامادەگی هەر کارێکی تێدابێت چ باش و چ خراپ، بۆیە ئەم مەرجە پێویستە لە هەموو کەسێک و بەتایبەت لای سەرکردە سیاسیەکان هەبێت. لێرەشەوە مەکیاڤیلی بە توانج هێرشدەکاتە سەر ئەو بەها ئەخلاقیە کە لە هیومانیزمی سیسرۆندا هاتووە. سیسرۆن لە (تەکلیفی ئەخلاقی) ئاماژەی کردووە کە ڕۆمۆلۆس کاتێ زانی واباشترە خۆی

دەسەڵاتی یەکەم بێت، بەو قەناعەتە گەیشت کە براکەی خۆی بکوژێت و ئەم کارەشی کرد تاوانێکی کرد کە جێگەی چاوپۆشی نیە و «ئەو پاساوانەش بۆ ئەم براکوژیە هێناویەتەوە نە عاقڵانەیە و نە تەواوە»١ مەکیاڤیلی بە پێچەوانەوە دەڵێت: «عەقڵی دووربین هەرگیز ئەو کەسەی کە بۆ دەوامی دەسەڵاتی پاشایەتی یان کۆماری، دەستی داوەتە کردەوەیەکی نایاسایی، لۆمە و سەرزەنشت ناکات» و لە ئیدامەدا دەڵێت: «ئەگەر نەفسی ئەم کردەوە، ڕۆمۆلۆسمان وەکو تاوانبار پێدەناسێنێت بەڵام دەرەنجامی باشی کارەکە بەری بوونی ئەومان لا دەسەلمێنێت. لەبەرئەوەی، ئەو کەسەی بە مەبەستی وێرانکردن و ڕووخاندن پەنا دەباتە بەر توندوتیژی شیاوی لۆمەیە نە کەسێکی کە بە نیازی چاکە و چاکسازی پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی زۆر و هێز» هاوشێوەی سەرکردە سیاسیەکان، دەبێت هاوڵاتی ئاسایی، بەرژەوەندی گشتی لەلای گرنگتر لە بەرژەوەندی تاک و بەها ئەخلاقیەکان بێت. لێرەدا مەکیاڤیلی تیتاڵی بە بەهاکانی هیومانیزم لە ڕۆمای کۆن دەکات. سیسرۆن لە ئەرکەکانی ئەخلاقدا گوتبووی: «هەندێ ئەرک ئەوەندە قێزەون و پیسن کە هیچ ئینسانێکی عاقڵ، تەنانەت بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەشی، ئامادە نیە جێبەجێی بکات» مەکیاڤیلی لە وەڵامدا دەڵێت: «کاتێک بە شێوەیەکی ڕەها، ئاسایشی وڵات دەکەوێتە مەترسیەوە، ئەرکی هەر هاوڵاتیەک ئەوەیە کە چیدی نابێت ڕەچاوی داد و ستەم و بەزەیی و دڵڕەقی و سەربەرزی و سەرشۆڕی بکات، بەڵکو دەبێت هەرچەشنە شەرمێک وەلابنێت و بەردەوام تەنیا، بیر لە ڕزگاری وڵات و پاراستنی ئازادی بکاتەوە»

کەوابو نیشانەکانی (ڤێرتو) چ لە ئاستی سەرکردەکان و چ لای هەر هاوڵاتیەک، ئەوەیە کە هەموو کەسێک دەبێت ئامادەگی ئەوەی تێدابێت کە «چاکەی گشتی بخاتە پێش بەرژەوەندی خۆیەوە و وڵاتی بەلاوە خۆشەویستر بێت لە منداڵ و باووباپیرانی» هەربۆیە مەکیاڤیلی پێی وایە، کۆماری ڕۆما، گەنجینەی ڤێرتو بوو. لەوێدا خۆشەویستی وڵات سەرتر لە هەمووشتێک بوو، «زۆربەی خەڵکی ڕەشۆکی سەرەڕای ڕق و قینیان بەرامبەر بە ناوی پاشاکان، بەدرێژایی چوار سەدە، عاشقی گەورەیی و سەربەرزی و بەرژەوەندی گشتی زید و وڵاتەکەیان بوون»

ڕەمزی پاراستنی ئازادی و بەستنەوەی بە سیفەتی (ڤێرتو) لەلای تێکڕای هاوڵاتیان، کێشە و پرسیارێکی بنەڕەتی هێنایە ئاراوە کە چۆن دەتوانین ئەم سیفەتە پەرەپێبدەین و لە دڵی هەمواندا جێگیری بکەین کە بۆ هەتاهەتایە بۆ وەدەست هێنانی سەربەرزی و مەزنی لە ژیانی شارستانیدا، گومانمان لا نەمێنێت و دڵنیابین؟ مەکیاڤیلی دەڵێت: «کە فاکتەری بەخت و شانس لەم ئەرکەدا، دەور دەبینێت. هیچ شارێک بە سەرفرازی ناگات جگە لەوەی کە کەسێکی بەڕیز و مەزن بەرەو ئەو ئاراستەیەی ببات و دانیشتوانی شارەکە، ئەم لەدایک بوونە نوێیە (شکۆ و سەربەرزی شارەکەیان) وەکو کچی ئەو باوکە گەورەیە

1- Cicero - On moral obligations, P 163




سەیربکەن» . ئەو شارەی کە لە بێبەختیدا، بناغە دانەرەکەی دووربین و زیرەک نەبووبێت بەردەوام خۆی لە وەزعێکی شوومدا دەبینێت، بە عەکسەوە، ئەو شارەی کە لە ئاوڕدانەوە لە ڕابردووی، (ڤێرتو) و ڕێگەچارەسەری ژیرانەی دامەزرێنەرەکەی ببینێتەوە (وەکو ڕۆما بەنیسبەت ڕۆمۆلۆسەوە)، دەزانن شانس و بەخت یارمەتیداون کە چاکترین کەس (وەکو دامەزرێنەر) هاتۆتە سەر ڕێگایان .

دامەزراندن و چەسپاندنی دەسەڵاتی کۆماری یان پاشایەتی لە هەر وڵاتێکدا، بەبێ ئەم (بەختە سەرەتاییە) و تەنیا بە پاڵپشتی (ڤێرتوی) هاوڵاتیان نامومکینە لەبەرئەوەی ڕای جیاوازی خەڵک، دەبێتە لەمپەرێک لە ئاستی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی باش و شیاوی وڵاتەکەیان لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی کۆماری. دەبێت یەک نەفەر بەم ئەرکە هەڵسێت . بۆ گەڕانەوەی سەربەرزی بۆ وڵاتێک، کە گەندەڵی تەنیوەتی، (ڤێرتوی) کەسێکی مەزن و زیندوو پێویستە نەوەک ڤێرتوی خەڵکی ڕەشۆکی . لێرەوە مەکیاڤیلی وای بۆ دەچێت کە «بەبێ ڕەچاوکردنی ئەم یاسا گشتیە، هیچ وڵاتێک- کۆماری یان پاشایەتی- بە ڕێکوپێکی، دانامەزرێت یان چاکسازی و گۆڕانکاری بەخۆوە نابینێت مەگەر ئەوەی یەک کەس، بناغەدانەر یان فەرمانڕەوای بێت .

مەکیاڤیلی ئەوەشمان پیدەڵێت کە ئەگەر وڵاتێک تەنیا خۆی بە بەختەوە ببەستێتەوە و دووربینی و عەقڵیەتی نابێتە لاوە ئەمە خۆفریودان و خۆ بێبەش کردنە لە کەسێکی مەزن و وێرانبوونە لە ماوەیەکی کورتدا. ڕاستە کە دەسەڵات دەبێ بە دەس یەک کەسەوە بێت، بەڵام دەسەڵاتی ڕەهای یەک کەس دەوامی نابێت لاوازی ئەو جۆرە دەسەڵاتە ئەوەیە کە بە مردنی کەسی دەسەڵاتدار، ئەو (ڤێرتو) یەش دەمرێت و چیتر زۆر زەحمەتە بگەڕێتەوە . کەوابوو ئەوەی بۆ ڕزگارکردنی وڵات (چ کۆماری یان پاشایەتی) زەروور هەبوونی پاشایەک نیە کە تاکو دواپشوو بە عەقڵ و دووربینیەوە حوکم بکات بەڵکو بوونی کەسێکە کە بەجۆرێک دەسەڵات ڕێکبخات کە دواتر قەدەری وڵات پشت گەرم بێت بە (ڤێرتوی) زۆرینەی خەڵکەوە نهێنی قووڵی ئەو دەسەڵاتداریەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەم کارە.

بەڕای مەکیاڤیلی، ئاڵۆزی ئەم کێشەیە لەوەدایە کە لە باوباپیرانی دامەزرێنەرەکانی شارێکدا، هەرچەند بە ڕێژەیەکی زۆر (ڤێرتو) هەبێت بەڵام هەر بە ڕێژەیە لای هاوڵاتیانی ئاسایی بوونی نیە چونکا «زۆربەی مرۆڤەکان حەزیان لە خراپەیە تا چاکە و کاتێک دەسەڵاتیان بکەوێتە دەست بەپێی خراپە و پیسی ناخیان ئەجووڵێن و بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە ڕەچاوناکەن . واتە دانیشتوانی هەر وڵاتێک لە (ڤێرتو)ی دامەزرێنەران دووربکەونەوە و وڵات بەرەو وەزعێکی خراپتر ببەن بە کورتی باشترین کۆمەڵگەش ئیستیعدادی گەندەڵی تێدایە . سەرچاوەی ئەم خوازە و ئەم شرۆڤەکاریە لە سەرچاوەی فکری ئەرەستۆوە هاتووە. واتە وێناکردنی ڕێکخراوە سیاسیەکانی کۆمەڵگە لە شێوەی پەیکەرەیەکی

سروشتیدا کە «بە تێپەڕبوونی زەمەن وەکو هەر دروستکراوەیەکی تر زەرەرمەند دەبێت» .
مەکیاڤیلی لە سەرەتای گوتاری سێهەمدا دەڵێت: «وەکو ڕۆژ ئاشکرایە کە ئەم پەیکەرانە، ئەگەر نوێ نەبنەوە لەناودەچن» لەبەرئەوەی ڤێرتوی ئەوان خەساردەبێت و ئەم کرمۆڵییە ئەگەر دەرمان نەکرێت دەبێتە هۆی تیاچوونی ئەو ئەشیایە» . بە ڕای ئەو، ئەم گەندەڵی و لەناوچوونی ڤێرتویە بە دوو شێوە ڕوودەدات، یان ئەوەیە هاوڵاتیان بەهۆی تەمەڵی و کەمتەرخەمی بە نسبەت سیاسەتەوە، چالاکی لە دەست دەدەن و بەم جۆرە بەبێ (ڤێرتو) دەمێننەوە .
مەترسی دووەم ئەوەیە کە خەڵک چالاک دەمێننەوە و بەڵام هێدی هێدی حەز و ئارەزو و بەرزەفڕی تاک و گروپێک گرنگی زۆرتری پێدەدرێت تاکو بەرژەوەندی گشتی. وە پێی وایە گەندەڵی و خراپ بوون سیاسەتی ئەوانەیە کە خێری خەڵکیان ناوێت و پتر بیر لەوە دەکەنەوە چەند خەڵک سوودیان پێدەگەیەنن.
هەروەها ڕێکخراوی گەندەڵی سیاسی، ئەوەیە کە بەهێزەکان پێشنیار دەدەن و ئەو پێشنیارەش بۆ ئازادی گشتی نیە بەڵکو بۆ مانەوەی دەسەڵات و هێزی خۆیانە . لێرەوە وڵاتی گەندەڵیش بەو شێوەیە، وڵاتێکە کە بە پێچەوانەی ڕابردووەوە، نە کەسانی شیاو و خاوەن ڤێرتو بەڵکو ئەوانە دەیبەن بەڕێوە و زۆرترین پلەوپایە و ئیمکانیاتیان هەیە کە حەز و ویست و خۆویستی خۆیان لەبەرچاوە .
ئەم لێکدانەوەیە مەکیاڤیلی بەرەوڕووی کێشە دەکاتەوە. لەلایەکەوە دەڵێت کە مرۆڤەکان «بەگشتی بەدگومانن و حەزیان لە پلەوپایەیە و تا ناچارنەکرێن کاری چاکە ناکەن» . لەولاشەوە دڵنیامان دەکاتەوە ئەگەر «ڕێگە بە مرۆڤ بدرێت کە بە پەیژەی بەرزەفڕێدا سەربکەون ئەوا ئەم حەزە پشێوی و وێرانی وڵاتەکەی لێدەکەوێتەوە بەجۆرێک گەیشتن بە سەربەرزی و مەزنی نامومکین دەکات» .
لەبەرئەوەی پاراستنی ئازادی مەرجی گەیشتن بە سەربڵندیە و پەرەسەندنی گەندەڵی ئازادیی دەکوژێت، بەتایبەت کاتێک خەڵک قازانجی خۆیان بوێت و گروپێک پشتگیری لەم ویستە بکات کوڵ و کۆی خەڵک، بۆ دانانی یاسایەک کە پارێزگاری لە ئازادی بکات، دادەمرکێت و دەسەڵات دەکەوێتە دەست چەند تاقمێک و ئازادی جێگە خۆی بە ستەمکاری و ملهۆڕی دەدات . واتە هەرکاتێک گەندەڵی تان و پۆی کۆمەڵگەی بەتەواوی گرتەوە ئەوا چیتر شارۆوەندان ناتوانن تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورتیش، ئازادانە بژین . کێشەی مەکیاڤیلی ئەمەیە: چۆن دەتوانین لە ناخی گشتی مرۆڤدا، سیفەتی ڤێرتویان تێدا زیندوو بکەینەوە کە لە سروشتیاندا نیە؟ چۆن دەتوانین ڕێگە لە گەندەڵی خەڵک بگرین تا پشت لە سوودی خۆیان بکەن و بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاو بگرن تا سەربەرزی دەستەبەر بکەن؟ تێکڕای گوتارەکان، ململانێیەکە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم کێشە.



مەکیاڤیلی

## ڕیبەرایەتی و یاساکان

مەکیاڤیلی دەڵێت لەبری هەوڵ بۆ لابردنی ئەم کۆسپە، ناچارین دەوری لێبدەینەوە واتە مادام کە ناتوانین بە شێوەی سروشتی چاوەڕێی (ڤێرتو)یەکی وەها لە هاوڵاتیان بکەین نابێت بێ هیوا ببین چون ڕەنگە لە بەختی باش، ئەو وڵاتە ڕێبەرێک ببینێتەوە کە کردار و ڕەوشتی وەکو بناغەدانەرەکەی بەرزبێت و «ڤێرتوی» بە ڕێژەیەکی زۆر تێدابێت. ئەمەش هیوایەکی بێهوودە نیە .

بە ڕای مەکیاڤیلی شارۆمەندی ڕەوشت بەرز دەورێکی حاشاهەڵنەگر دەگێڕێت لە گەیشتنی شارێک بە سەربەرزی، لانی کەم ئەگەر دە ساڵ جارێک، لە مێژووی ڕۆمدا، کەسایەتی وەها دەرکەوتایە ئەوا هەرگیزا و هەرگیز ئەو شارە نوقمی گەندەڵی نەدەبوو .

هەروەها دەڵێت: ئەگەر کۆمەڵگەیەک ئەوەندە بەختەوەربێت کە لە هەر بەرەیەکدا، سەرکردەیەکی وەهای تێدا هەڵکەوێت کە ڕێگە بە گەندەڵی نەدات و کۆمەڵگە بپارێزێت و نەهێڵێت لە هەلدێران بەربێتەوە، ئەوا پەرجووی سەرهەڵدانی (کۆماری هەتاهەتایی) دەبینرێت واتە ئەو پەیکەرە سیاسیە کە خۆی ناداتە دەستی مەرگ . با بزانین دەماندی ڕۆحی (ڤێرتو) لە جەستەی تاکەکاندا، چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە دەتوانێت یارمەتیدەری شارێک بێت بۆ گەیشتن بە سەربەرزی؟ لێرەوە لە گوتاری سێهەمدا مەکیاڤیلی هەوڵدەدات چەند نموونەیەک بهێنێتەوە کە چۆن ڕۆم بە یارمەتی ئەو تاکەکەسانە بە سەربەرزی گەیشت و چۆن شوێنەواری چاکەیان لە پاش خۆ، لەو شارەدا، بەجێهێشتووە .

بیرکردنەوە و بۆچوونی مەکیاڤیلی لەم بابەتەدا، زۆر لە کتێبی میرەوە نزیکە. هەم لەم گوتارانەدا و هەم لە میریشدا، پێمان دەڵێت کە سیاسەتوان و سەرکردەی لێهاتووی خاوەن ڤێرتوی زۆر، بە دوو جۆر دەبێتە سەرچاوەی خزمەتکردنی گەورە. یەکەمیان لە ڕێگەی تەئسیردانان لەسەر هاوڵاتی. ئەو دەڵێت: هەندێ جار ناوبانگی ئەم پیاوە مەزنانە و ئاکار و ڕەوشتیان، ڕاستەوخۆ دەبێتە ئیلهامبەخشی ئەو مرۆڤە باشانە و وایان لێدەکات لاسایی ئەوان بکەنەوە. هەروەها مرۆڤە ناخڕەشەکانیش شەرمدەکەنەوە لەوەی بە پێچەوانەی ڕەوشتی بەرزی ئەوانەوە بژین .

قسەی سەرەکی مەکیاڤیلی ئەمەیە گەورەیی سەرکردەیەکی مەزن لەوەدایە کە بتوانێت ئەم (ڤێرتو) و ڕەوشت بەرزیە لەنێو جەماوەردا پتەو بکات هەرچەندە ئەو جەماوەرەش بەشێوەی سروستی خاوەن ئەو سیفەتەش نەبن. مەکیاڤیلی لە (میر) و لە (تەکنیکی شەڕ) و لە گوتارەکانیشیدا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە باشترین ڕێگە بۆ ناچارکردنی جەماوەر لە پەیڕەوکردنی ڕەوشت بەرزیدا ئەوەیە کە لە هەڵسوکەوتی تر بیانترسێنێت. ئەو ستایشی (هانیباڵ) دەکات کاتێک بە شێوەی خۆی، بۆ هێورکردنەوە و یەکگرتوویی ڕیزەکانی سوپاکەی، پەنادەباتە بەر تۆقاندن . سەرەڕای ئەمەش، خۆشەویسترین کەس لای مەکیاڤیلی، مانیلۆس تۆرلاڤۆسە (Manilius Torquatus – سەرکردەی ملهۆڕی ڕۆم. ٢٠٢

پ.ز) کە بە ورەیەکی بەرز و لە ڕێگەی زەبر و زەنگەوە، ئەو هاوڵاتیانەی کە پشتیان لە ڕەوشت بەرزی کردبوو، ناچاریانی کرد بگەڕێنەوە بۆ ڤێرتوی پێشین .
ڕێگەیەکی کورتتر بۆئەوەی ئەوکەسە مەزنانە وڵاتەکەیان بەرەو سەربەرزی و عێزەت ببەن بە ڕای مەکیاڤیلی ئەوەیە کە هەبوونی ڕێژەیەکی زۆری ڤێرتو لەواندا، وڵات لە گەندەڵی و وێرانی دووردەخاتەوە.
لە بەشی بیست و سێهەمدا، بە وردی باس لە ژیان و کارەکانی (کامیلۆس Camilus سەرکردە و سیاسەتوانی ڕۆمی. ٣٦٥ پ.ز) دەکات کە چەندە دووربین بووە و بە کردەوەی بەرز و چاونەترسی بەڕیوەبەری و فەرمانددەیی سوپاکەی کردووە دواتر بە کامڵی باس لەم بابەتە دەکات و دەڵێت سەرکردەکان دەبێ بزانن چۆن بەخیلان چەک دەکەن لەبەرئەوەی (ئیرەیی بردن ڕێگەگرە لە مرۆڤی لێهاتوو بۆئەوەی ئەرکە گرینگەکانی جێ بەجێ بکات) سەرکردە ئەگەر ئەرکی سوپای لە ئەستۆبێت ئەوا دەبێت بوێر و چاونەترس بێت چونە بە گوتەی (لی ڤیۆس) لەو شوێنانەی کە بەرەوڕووی شەڕێکی قورس دەبنەوە سەرکردە پێویستە چالاک و گورج بێت . پێویستە سەرکردە عاقڵ و دووربین بێت و شارەزایی تەواوی لە مێژووی کۆن و هەروەها ئەرکە هەنووکەییەکاندا هەبێت دەبێ هۆشیار و ئاگاداربێت و فریوی دوژمنەکانی نەخوات .
تێکڕای ئەم قسە و باسانە پیشاندەدات کە مەکیاڤیلی داڵغەی ئەو ڕووداوانەیەتی کە زێدەکەی (فلۆرانس) لە ڕابردوودا بەخۆوەی دیوە. ئەوکاتەی باس لە سەرکردەی مەزن و خاوەن ڤێرتو دەکات دەیهەوێت پێمان بڵێت کە خۆبەدەستەوەدان و وێرانی فلۆرانس لە ١٥١٢دا، دەرەنجامی نەبوونی ئەو سیفەتە بوو لە دوو سەرکردەکەیدا، واتا (ساونۆرالا) و (سۆدرین). ئەوان نەیانتوانی بەسەر بەخیلی و ئیرەیی بردندا زاڵ ببن هەربۆیە هەردووکیان شکەستیان خوارد . سەرکردەی باش دەبێت لە مێژوو دەرس وەربگرێت.
ڕاستە دانیشتوانی فلۆرانس، شارەزای ئاکاری بەربەرەکان نەبوون و هیچ هەوڵێکیان لەم ڕێگەدا نەدا و تەفرەیان خوارد و بوونە قوربانی ڕاوڕووتی بەربەرەکان . بەڵام سەرکردەکانیان ئاگادار و هۆشیار نەبوون و ئەوەندە دڵساف بوون کە پاش شەڕ لەگەڵ (پیزا)دا، ئەو شارەیان بەرەو سەرشۆڕی و ڕیسوایی برد . لێرەدا مەکیاڤیلی بەم سکاڵا تاڵە کۆتایی بە گوتاری سێهەمی دەهێنێت.

**

ئەگەر بۆ ئەو کێشەیە بگەڕێینەوە کە مەکیاڤیلی لە گوتاری سێهەمیدا، هێناویەتە ئاراوە، بە ئاشکرا دەبینین کە ئەم کێشەیە بێ چارەسەر ماوەتەوە. هەرچەند ئەو ڕوونیدەکاتەوە کە چۆن بە هێنانەوەی سیفەتی بەرزی سەرکردەکان وەکو نموونە، دەکرێت هاوڵاتی ناچاربکەیت لەو کردانە پێڕەوی بکات بەڵام هەر خۆی دووپاتیدەکاتەوە کە دەرکەوتنی سەرکردەی باش پەیوەندی بە بەختەوە هەیە و ناکرێت بۆ گەیشتنی شارێک بە سەربەرزی، پشت بە بەخت ببەستن و متمانەی پێ بکەین. لێرەدا کێشەکە




وەک خۆی دەمێنێتەوە و ئەویش ئەمەیە: چۆن لە خەڵکی ڕەشۆکی بەرزەفڕ و تەمبەڵ، کە ئامادەگی گەندەڵیان تێدایە و ڤێرتو و ڕەوشت بەرزی لە ناخیاندا بۆ درێژخایەن جێگیر بکەین بۆئەوەی وڵات بە سەربەرزی و گەورەیی بگات؟

لێرەدا، بەنیسبەت کتێبی (میر)ەوە، مەکیاڤیلی لە ڕوانگەی سیاسی خۆیدا، هەنگاوێک بەرەوپێش هەڵدەگرێت. بەڕای ئەو، چارەسەری ئەم کێشە بەستراوە بەوەی کە دڵنیابین کە نەزم لەنێو هاوڵاتیاندا هەیە و ئەوان وافێرکراون کە بۆ پاراستنی ئازادی و ڤێرتوی خۆیان هەوڵبدەن. لە بەشی یەکەمی گوتاری یەکەمیدا، دەڵێت: ئەگەر بمانەوێت بزانین چۆن ڕۆم چەندین سەدە هەڵگری ئەو سیفەت و ڕەوشتە بەرزانە بوو، دەبێت توێژینەوە لەوەدا بکەین کە چۆن ڕۆم لە سەرەتاوە ڕێکخرابوو؟

پاشان لە بەشی دووەمدا دێتەوە سەر ئەم باسە کە ڕۆم چۆن توانی ڕێگەی ڕاست بدۆزێتەوە و بەتەواویی بە ئامانجەکانی بگات و دەڵێت: بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، دەبێت لە پێش هەموو شتێکا، لە (ئۆردینی - Ordini) (ئەرک و نەزم و فرمان) ئەو شارە و دامەزراوە و ڕێکخراو و یاساکانی ڕێکخستنی ڕۆما، ئاوڕبدەینەوە . بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش دەبێت بزانین کە هەر وڵاتێک پێویستی بە چ جۆرە ڕێکخراوەیەک هەیە بۆ ئەوەی پەرەی پێبدات تا لە کاروباری ناوخۆیدا، لە گەندەڵی پێشگیری بکات. لێرەدا مەبەستی مەکیاڤیلی ئەرکە سیاسی و حکومەتیەکانە . لێرەوە بەشی زۆری گوتاری یەکەم تایبەتە بەم بابەتەوە و نموونە بەرچاوەکانی لە مێژووی ڕۆم وەرگیراوە بۆئەوەی بزانین «ڕێکخراوەکانی ڕۆم چ دەورێکیان لە گەیشتن بە سەربەرزی و گەورەیی ئەو وڵاتەدا گێڕاوە»

مەکیاڤیلی دوو ڕێگەی چارەسەری بنەڕەتی و زەرووری دەستنیشان دەکات کە بە یارمەتی ئەوانە دەکرێت کاروباری ناوخۆ بە چاکی بەڕیوەببرێت و سیفەتی ڤێرتو لە ناخی خەڵکدا جێگیربکرێت لە بەشی یازدە تا پانزەدا دەڵێت: گرنگترین ڕێکخراو لە هەر وڵاتێکدا، ڕێکخراوە دینیەکانە، پێویستە دڵنیابین کە عیبادەت لەم شوێنانەدا بە ڕێکوپێکی بەڕیوەبچێت . هەروەها دەڵێت: ڕێزگرتن لە داب و نەریتە دینیەکان سەربەرزی و گەورەیی کۆمارەکانی لێدەکەوێتەوە . بە پێچەوانەشەوە لە هەرکوێ بەها دینیەکان و خواپەرستی دابەزی ئەوە نیشانەی گەندەڵی و وێرانی ئەو شوێنەیە .

ئەو دەڵێت: ڕۆمیەکان بە باشترین شێوە لەوە گەیشتبوون کە دین بۆ بەختەوەری وڵاتەکەیان بەکاربهێنن. شا (نۆما Numa ٧١٥ - ٦٧٣ پ.ز) جێگری ڕۆمۆلۆس، لەوە گەیشتبوو کە «بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو، پێویستە ڕێ و ڕەسمی دینی بەجێ بهێنرێت» . بە عەکسەوە، دەسەڵاتدارانی ئیتاڵی لە سەردەمی تازەدا، هەرگیز گرنگیان بەم لایەنە نەداوە. هەرچەند لە ڕواڵەتدا بەناو ڕۆم، ناوەندی دینی مەسیحیەتە، حەقیقەت ئەوەیە کە بەهۆی هەڵەی خراپی کڵێسەی ڕۆم، ئەم وڵاتە لە تەقوا و دینداری بەتەواوی دوورکەوتۆتەوە . دەرەنجامی ئەم ڕسوایەش ئەوەبوو کە ئەمڕۆکە، لە

ئەوروپا، لەبەر بێدینی، خەڵک ڕوویان لە گەندەڵی کردووە بەم بۆنەشەوە ئازادی خۆیان لەدەست داوە و فەرامۆشیان کردووە چۆن لە خۆیان پارێزگاری بکەن و وڵاتەکەیان بۆتە نێچیری بەربەرە بەهێزەکان یان ئامادەن وڵاتەکەیان ببێتە قوربانی لە بەرامبەر هەر وڵاتێکدا کە هێرش بکاتە سەریان .
ئەو نهێنیە کە ڕۆم لە کۆندا دەیزانی و لە جیهانی ئەمرۆدا لەبیرکراوە ئەوەیە کە ڕێکخراوە دینیەکانیش وەکو سەرکردە مەزنەکان دەورێکی باش ببینن لە سەربەرزی و گەورەیی وڵاتەکەیاندا. واتە بە ئیلهام بەخشین و دڵخۆشکردنی خەڵک یان ترساندن و تۆقاندنیان لە ڕێگەی دینەوە دەکرێت خەڵک ناچار بکرێن بۆ ئەوەی بەرژەوەندی گشتی ڕەچاوبکەن. مەکیاڤیلی دەڵێت لە ڕێگەی فاڵگرتنەوە و ئەستێرەی بەختەوە لە ڕۆمای کۆندا، خەڵک هاندەدران وڵاتەکەیان خۆش بوێت. سەرکردە ڕۆمیەکانیش، کاتی فاڵەکە چاکبوایە خۆیان بۆ شەڕ تەیار دەکرد و سوپا بڕوای تەواویان هەبوو کە لەو شەڕانەدا سەرکەوتوویی دەستبەر دەکەن و لەسەر بنەمای بڕوا بەم ڤێرتو، زۆربەی جارەکان سەرکەوتوو دەبوون . مەکیاڤیلی بیری لەوە دەکردەوە کە ڕۆمیەکان چۆن لە ڕێگەی دینەوە ترسیان لە دڵی هاوڵاتیدا دەچاند و ڤێرتوی ئەوانیان بە کردەوە تا ئەو ڕادە بەرز دەکردەوە کە بە شێوەیەکی تر نامومکین بوو.
مەکیاڤیلی بەرچاوترینی ئەم نموونە لە بەشی یازدەدا باسی لێدەکات و دەڵێت: پاش شکستی ڕۆم لە شەڕی (کانای Cannae) لە بەرامبەر هانیباڵدا، هاوڵاتیەکی زۆر کە لە چارەنووسی وڵات ناهومێد بووبوون، کۆبوونەوە و هاتنە سەرئەوەی ئیتاڵیا بەجێبهێڵن بەڵام (ئیسکیپۆی) سەرکردە کە ئەمەی زانی، بە شمشێری تیژ لە بەرامبەریان وەستا و بە سوێنددانیان ناچاریانی کرد بمێننەوە و بەرگری بکەن. هەرچەند عەشق بە وڵات و یاساکانی نەیانتوانیبوو ئەوان بهێڵێتەوە بەڵام لە ترسی ئەو سوێندەی کە خواردبوویان، بە ناچاری مانەوە . ئەم بیرۆکە کە کۆمەڵگەی لەخواترس و دیندار بە شێوەیەکی سروشتی ئەجر و پاداشتی خۆیان وەردەگرن و ئەم پاداشتەش شتێک نیە جگە لە سەربەرزی و گەورەیی لە ژیانی مەدەنیاندا، لای دۆستانی مەکیاڤیلی لەو سەردەمەدا باوبوو.
مەکیاڤیلی دەڵێت: لە ١٤٩٠ لە فلۆرانس، (ساونارۆلا) سیاسەتەکانی لەسەر ئەم بنەما دانابوو. خەڵک لایان وابوو کە ئەو لەگەڵ خودا قسەدەکات. ئەویش پەیامی خودا بەگوێی فلۆرانسیەکاندا دەدا کە ئەگەر تاعەت و خواناسی بکەن بە پیشە، ئەوا خوداش وەکو ڕابردوو، گەورەیی و سەربەرزیمان بۆ دەگەڕێنێتەوە . سەرەڕای ئەمانە، بەهۆی بڕوا بە بەهای دین لە دوولاوە مەکیاڤیلی نیسبەت بە پێشینیان ڕای جیاوازی بووە. لایەنگرانی ساونارۆلا حەزیان دەکرد دین لە ژیانی سیاسیدا بە بەردەوامی بوونی هەبێت بەڵام مەکیاڤیلی بەلایەوە حەقیقەتی دینی گرینگ نەبوو. ئەو بڕوای بە دەورێک بوو کە دین لە ڕێگەی ئیلهام بەخشین بە خەڵک دەیگێڕێت بۆئەوەی ڕێگای چاکە بە بەردەوامی بگرنەبەر و خراپەکان ڕیسوابکەن بۆیە هەر دینێک چەند توانایی بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکە ببوایە و چەندە سوودی




بە بەرژەوەندی گشتی بگەیێنابا، ئەوەندە ڕێزی دەگرت . لێرەشەوە دەڵێت ڕێبەرانی هەر کۆمەڵگەیەک ناچارن بە بەردەوامی «ئەو شتەی کە بە قازانجی دینە قەبووڵی بکەن و گرنگی پێ بدەن، هەرچەندە ئەو شتانەش لایان درۆبێت»

جیاوازی دووەمی مەکیاڤیلی لەگەڵ پێشینانیدا ئەوەیە کە قازانجی ئومور بە کردەوە لای گرینگترە هەر بەم پێوەرە ئەو دەڵێت دینی ڕۆمیەکان کە لە کۆندا باشتر لە دینی مەسیحیەت بووە. دەکرێت یاسا و ڕێسا و ئامۆژگاریەکانی مەسیحیەت، بەرگی ڤێرتو بکەی بە بەریدا و لەسەر ئەو بنەما و بە مەبەستی چاکسازی و پارێزگاری لە کۆمەڵگەی مەسیحی، تەفسیر بکرێت و سوودی لێ وەربگیردرێت. بەڵام حەقیقەت ئەوەیە ئامۆژکاریەکانی مەسیحیەت بە شێوەی غەڵەت لێکدانەوە و شرۆڤەی بۆ کراوە بۆیە ناتوانێت ژیانێکی ئازاد و تەندروست و بەهێز بۆ کۆمەڵگە دابین بکات. مەسیحیەت باسی مرۆڤی خاکی و موفەکیر دەکات لە باشترین شێوەشدا بە بەکەم زانینی مرۆڤ و بە سووکایەتی بە ئوموراتی مرۆڤ هیچ بەهایەک بۆ گەورەیی فیکر و توانایی جەستە و سفەتە چاکەکانی هاوڵاتی دانانێت. مەسیحیەت لە فەزل و گەورەیی مرۆڤ تەسەورێکی متافیزیکی هەڵەی هەیە و بە سەپاندنی ئەم تەسەورە نە تەنیا سەربەرزی و فەخری لە ژیانی شاریدا بەرەوپێش نەبردووە بەڵکو لە حەقیقەتدا ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوە گەورەکانی بەرەو هەڵدێر و گەندەڵی و نەمان بردووە. لێرەدا مەکیاڤیلی بە لۆمە و تەنز، وەکو ئەدوارد گیبۆنی (E. Gibbon) مێژوونووسی بەریتانی، پێمان دەڵێت: هەرچەندە مەسیحیەت حەقیقەت و ڕێگای ڕاستی پێ نیشان داوین، بەڵام بە هەرزان پێی نەبەخشیوین. لەبەرئەوەی جیهانی بەرەو لاوازی و سستی برد و لە کۆتاییشدا ڕادەستی خراپکارانی کرد .

**

مەکیاڤیلی لە کۆتایی گوتاری یەکەمدا، باس لە ڕێگەی دووەم دەکات کە ئەویش ناچارکردنی خەڵکە بۆ وەرگرتنی ڤێرتو. ئەو پێی وایە کە دەکرێت لە ڕێگەی دەسەڵاتی یاساییەوە جەماوەر ناچاربکەیت بەرژەوەندی گشتی بخەنە پێش سوودی تاکەکەسیەوە. دەڵێت باشترین نموونەی ڤێرتو لە شارستانیەتدا، دەرەنجامی فێرکردن و پەروەردەی باشە . ئەگەر دەپرسن هەندێ شار بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم ڕەوشت بەرزیەیان لا ماوەتەوە و وەڵامەکەی ئەمەیە کە «ناوی چاکەی ئەم شارانە دەرەنجامی یاسای باش و ڕێک و پێکەکەیانە» . دواتر ئەم تەوەرە لە سەرەتای گوتاری سێهەمدا دێتە ئاراوە و دەڵێت: ئەگەر شارێک بیهەوێت سەرلەنوێ بژێتەوە و ڕێگەی سەربڵندی بگرێتە بەر، ئەم ئەرکە تەنیا لە ڕێگەی کەسێکی نەفس بەرزەوە جێبەجێ دەبێت یان بە کەڵک وەرگرتن لە یاسایەکی ڕێک و پێک .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی مەکیاڤیلی ئەوەندە گرنگی بەو پیاوە مەزنانە دەدات کە بناغەی شارە گەورەکانیان داناوە. ئەم کەسایەتیانە لەبەر ڕەوشت بەرزی توانایی دانانی یاسا و ڕێسای

باشیان هەیە بۆ ئەوەی گەندەڵی کۆنترۆڵ بکەن. بەرچاوترین ئەم کەسانەش، بەلای مەکیاڤیلیەوە، لیکۆرگۆس (Lycurgus سەدەی نۆی پ.ز) بناغەدانەری ئیسپارتە. بەپێی ئەو یاسا کامڵە ئەو داینابوو «ئیسپارت توانی هەشت سەد ساڵ بەدوور لە سووکایەتی بە سەربەرزیەوە بژی» بێ ئەوەی ئازادی خۆی لە دەست بدات . سەرکەوتنی نۆما و ڕۆمۆلۆسیش لە سەرەتادا لە ڕۆم، شیاوی بایەخ و سەرنجدانە. ئەم جووتە لە ڕێگەی ئەو کۆمەڵە یاسا ڕێک و پێکەی کە دایاننابوو، توانیان بەزۆر و بە دڵنیاییەوە، سیفەتە باشەکان لە ناخی خەڵکی ڕۆما جێگیر بکەن و تەنانەت فراوانخوازی و پەرەسەندنی ئیمپراتۆریەتیش، ڕێگەخۆشکەر نەبوو بۆ گەندەڵی ڕۆم. ئەو شارە تەژی لە ڤێرتویەک بوو کە بە نیسبەت شار و کۆمارەکانی ترەوە، کەم نەبوو . بەڕای مەکیاڤیلی، ئەم تێبینیە گەورەترین پەندمان لە مێژوو پێدەبەخشێت. ئەو دەڵێت من پێتانم پیشاندان کە یاسادانەری گەورە ئەو کەسانەن کە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی یاسا بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە لە ژیاندا بە باشی تێگەیشتوون کەوابوو بە وردبوونەوە لەم یاسانەدا کە بۆ چۆنیەتی دەسەڵات دانراون دەتوانین ڕازی سەرکەوتنەکەیان بدۆزینەوە و نهێنی ئەم حیکمەتی پێشینیانە ڕاستەوخۆ بگەیەنینە دەستی سەرکردەکانی ئەمڕۆ. نوکتەی هەرە گرنگ لە یاساکانی ئەم پیاوە ژیرانە لە سەردەمی کۆندا، بە زمانی سادە ئەوەیە کە هیچ حکومەتێک، چ پاشایەتی و چ ئاریستۆکراسی و چ دیمۆکراسی، بەشێوەیەکی پەتی و بێخەوش بەردەوام نابن و خۆیان بەپێی زەمەن دەبنە هۆکاری گەندەڵی و فەوتانیان.

کەوابوو ئەو بیرمەندانە لایان وایە ڕازی سەرکەوتن لە ڕێگەی یاساوە بۆ جێگیرکردنی ڤێرتو بەزۆر لە دامەزراندنی حکومەتی جۆراوجۆرە کە لەوێدا ناپایەداری بێخەوشی دەسەڵات وەلا دەنرێت و تەنیا هێز و ئیستحکامات کۆدەکرێنەوە. مەکیاڤیلی دەمانباتەوە بۆ ڕۆم و دەڵێت: ڕۆم بۆیە کۆمارێکی تەواوی پێکهێنا چون وردە وردە توانی حکومەتی بنکە فراوان دابمەزرێنێت .

لە زانستی سیاسیدا لە ڕۆمای کۆن، ئەمە باوبوو کە جوانیەکانی حکومەتی بنکە فراوانیان وەبیر خەڵک بخەنەوە و پارێزگاری لێبکەن. ئەم باسە، تەوەری مێژووی پۆلۆبیوس و نامیلکەکەی سیسرۆنە و پاشان لای هیومانیستەکانی فلۆرانس لە سەدەی پازدە، خۆشەویست بوو. بەڵام مەکیاڤیلی خوێندنەوەیەکی تری بۆ حکومەتی بنکە فراوان هەیە. ئەو دەڵێت: لە هەر کۆمارێکدا، دوو گروپی دژ واتە خەڵک و دەوڵەمەندەکان بوونیان هەیە . ئەگەر بە شێوەیەکی یاسایی حکومەت ڕێگە بە یەکێک لەم دوانە بدات کە دەسەڵاتی ڕەهایان هەبێت ئەوە حکومەتی کۆماری بە ئاسانی تووشی گەندەڵی دەبێت . ئەگەر دەوڵەمەندێک ببێتە میر، ئەوا ستەمکاری سەرهەڵدەدات. ئەگەر دەوڵەمەندەکان حکومەتی ئاریستۆکرات دابمەزرێنن ڕەنگە لە بەرژەوەندی خۆیان ئیش بکەن. خۆ ئەگەر دیموکراسیش دابمەزرێت هەر ئەم شتە دەربارەی خەڵک ڕاستە. کەوابوو ڕەوشت بەرزی و ڤێرتوی خەڵک لە بەرژەوەندی تاقمێکدا کاری




پێدەکرێت و لێرەشەوە کۆمار ئازادی خۆی لە دەست دەدات . مەکیاڤیلی چارەسەری ئەم کێشەیە لە دانانی یاسای بنەڕەتیدا دەبینێتەوە بە چەشنێک کە ئەو یاسا بتوانێت تەوازن و پارسەنگییەک لەناو چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا دروست بکات. دەبێت هەموو تاقمەکان بە ئەرکی خۆیان لە دەسەڵاتدا هەڵسن و چاودێری یەکتر بن. یاسا تا ڕێگربێ لە بێ شەرمی و خۆبەزلزانی دەوڵەمەندەکان و کەمتەرخەمی و بێ دەربەستی جەماوەریش. گروپە ڕەقیبەکان دەبێت بە وردی ئاگایان لە یەکتر بێت بۆ ئەوەی بە دیتنی هەر شتێک کە نیشاندەری ئەوەبێت کە لایەنێک بیهەوێت دەسەڵات بەتەواوی قۆرخبکات بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو ڕەوتە و کەم کردنەوەی فشارەکان دەبێت بزانن تەنیا «یاساکان و ئەو ڕێکخراوانەی لەسەر بنەمای ئازادی گشتی» دانراون یارمەتیدەریانە و بە فریایان دەگات. گروپ و تاقمە جیاوازەکان، هەرچەند بیر لە بەرژەوەندی تەسکی خۆیان بکەنەوە بەڵام لەوەدەچێت دەستێکی نادیار ئەوان بەرەو ئاراستەیەک دەبات کە لە هەموو چالاکییەکانیاندا بۆ دانانی یاسا، بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاوبگرن. لێرەوە ئاشکرایە «هەر یاسایەک بە مەبەستی لایەنگری لە ئازادی دابنرێت خۆی دەسکەوت و دەرەنجامی دووبەرەکی ئەوانە» ....

لە کۆتایی سەدەی سێزدەهەمی زاینی بەدواوە، (رمیجۆ Remigo) و (لاتینی B. Latini) و (دینۆ کامپانی Dino Compagni) مێژوونووس و لەوانەش گرنگتر (دانتە) هاوڵاتیانی خۆیانیان لۆمە دەکرد کە گوایە نایانەوێت بە ئاشتی بژین بۆیە ئازادیان خستۆتە مەترسیەوە. ئەوان لەو سەردەمەدا وای بۆ دەچوون کە ناتەبایی و کێشە کۆمەڵە و تاقمی لێدەکەوێتەوە و ئەم چەنە بەرەکیە، پڕ مەترسین بۆ لە دەست دانی ئازادیە مەدەنیەکان. بەڵام مەکیاڤیلی سووربوو لەسەر قسە سەرسوڕهێنەرەکەی و دەیگوت ئەو پەرێشانی و نابەسامانیە لە کۆندا شیاوی زۆرترین مەدحە. ئەمەش دژایەتی لەگەڵ بنەمای فیکری هیومانیستەکانی فلۆرانس بوو. مەکیاڤیلی دەڵێت ئەو شەڕ و شۆڕ و پەرێشانیە بەسەر ڕۆمدا تێپەڕی، ئەگەر لە نەفسی خۆیدا ناوی شەڕ و بەڵای لێبنێین بەڵام ڕێگەی نەدا بەرژەوەندی تاقم و فرقەیەک زاڵ بێت ئەمەش بۆ پاراستنی مەزنی ڕۆم، خراپە و بەڵایەکی زەروور بوو .

## پێشگری لە گەندەڵی

مەکیاڤیلی بە بەڵگەوە پێمان دەڵێت کە بوونی حکومەتی بنکە فراوان بۆ پاراستنی ئازادی زەرورە بەڵام کافی نیە چون خەڵک زۆرتر بیر لە سوودی خۆیان دەکەنەوە تاکو بەرژەوەندی گشتی و کاری چاکە ناکەن مەگەر ئەوەی ناچاربکرێن. شارۆمەندی بەهێز و ئەو تاقمانەی خاوەنی قازانجی تایبەتن بەردەوام لە هەوڵدان تەوازونی دەسەڵات بۆ ئامانجی بەرزەفڕانەی خۆیان و گروپەکەیان، بەلای خۆیاندا دابشکێنن و بەم کارە وڵات بەرەو گەندەڵی دەبەن و ئازادی دەکەوێتە مەترسیەوە. ئەم مەترسیە، وەکو مێژووی

ڕۆم پێمان دەڵێت لەلایەن ئەو کەسانەوە دروست دەبێت کە لە حکومەتی پێشوو سوودیان پێگەیشتووە.
مەکیاڤیلی لێرەدا زاراوەی مەترسی (کوڕانی برۆتۆس) بەکاردێنێت. (برۆتۆس J. Brutus سەدەی شەشی پ.ز) ڕۆمی لە شەڕی حکومەتی ملهوڕانەی (تارکینیۆس سۆپێریۆس ٥١٠ پ.ز) ڕزگارکرد بەڵام کوڕەکانی ئەم دیکتاتۆرە ئازادی خەڵکیان بە کۆیلەیەتی خۆیان دەزانی و لەبەرئەوەی وەکو حکومەتی پاشایەتی، دەستڕۆیشتووبن و سوودوەربگرن دژی زێدی خۆیان کەوتنە پیلان و ئاژاوە نانەوە.
مەکیاڤیلی دەڵێت لەکاتی سەرهەڵدانی مەترسیەکی وەهادا، باشترین ڕێگەحەل، کوشتنی کوڕەکانی برۆتۆسە. ڕاستە برۆتۆس دەسەڵاتی گرتەدەست و بە دڵڕەقیەوە لەبەرچاوی خۆی ئەمری کرد کوڕەکانی بکوژن. ئەم ڕووداوە سەرنجڕاکێشە. ئەو توند و تیژییەی پێویستە ببێت. ئەو کەسەی دەبێتە دەسەڵاتی یەکەم و وڵاتێک ڕزگاردەکات ئەگەر کوڕەکانی برۆتۆس نەکوژێت حکومەتەکەی ناتوانێت بەردەوام بێت.
مەترسیەکی تر کە هەڕەشە لە بەردەوامی سیاسی دەکات حەزی دەسەڵاتە بۆ ناوزڕاندن و سووکایەتی کردنە بە هاوڵاتی کە بەدناوی حکومەتی لیدەکەوێتەوە.
مەکیاڤیلی دەڵێت: هەندێ شار (دەسەڵات) تووشی هەڵەیەکی کوشندە دەبن ئەویش ئەمەیە بۆ پاراستنی ئازادی خۆیان، زەرەر بە هاوڵاتیانێک دەگەنن لەبری ئەوەی پاداشتیان پێ بدەن. دەیانڕەنجێنن. ئەمە نەخۆشیەکی مەترسیدارە چون ئەو کەسانەی بە ناحەق ستەمیان لێکراوە، بیر لە تۆڵە ئەکەنەوە و لە نەتیجەدا وڵات زووتر دەکەوێتە دەست حکومەتێکی ستەمکار. دەبینین لە ڕۆمدا، بەهۆی ئەو ناسپاسی و بێ ڕێزیانە دەرحەقی کرابوو ناچاربوو شارەکە بە زەبری زەنگ و زۆر داگیربکات.
ڕێگەچارەی ئەم کێشە ئەوەیە ڕێکخراوگەلێکی تایبەت بۆ سکاڵای خەڵک دابنرێت تا چیدی ناسپاسەکان و ئیرەیی بەرەکان نەتوانن ناوی کەسە باشەکان بزڕێنن و ناشیرینیان بکەن. دەبێ ڕێگە بدرێتە هەر هاوڵاتیەک تا بەبێ ترس و دڵەڕاوکە هەرکەس بە ناحەق تۆمەتی دا پاڵی ڕادەستی حکومەت بکرێت و بە سزای خۆی بگەیەندرێت. لێرە مەکیاڤیلی باس لە مەترسیەکی گەورەتر دەکات کە هاوسەنگی و تەوازونی حکومەتی بنکەفراوان دەشێوێنێت. ئەوەش ئەوەیە کە هاوڵاتیەکی بەرزەفڕ، لە بەرژەوەندی خۆی (نەک بەرژەوەندی گشتی) وەفاداری و ڕێزی خەڵک ئیستیغلال بکات و حیزبێک دروست بکات. ئەمە جۆرێکە لە گەندەڵی و حکومەت بەرەو ستەمکاری دەبات. هەروەها مانەوەی سەرکردەکانی سوپا لە شوێنی خۆیاندا، لە درێژخایەندا دووبەرەکی و شەڕ و ناکۆکی لێدەکەوێتەوە. مەکیاڤیلی ئاماژەدەکات کە مانەوەی سەرکردەکانی سوپا لە پلەی خۆیاندا، هێزێکی گەورەی بۆ دەستەبەرکردن و هەر ئەمەش ڕۆمی بەرەو کۆیلایەتی برد. کاتێک دەسەڵاتێکی ڕەها بەبێ کۆت و بەند و چاودێری بە کەسێک بدرێت لە دەوری کۆدەبنەوە و خاوەن دەسەڵات بەرەو گەندەڵی دەبەن لێرەدا ئازادی زیان دەبینێت.
لە وەها وەزعیەتێکدا پێویستە دەسەڵاتێکی ڕەها بە کەسێک دەسپاک بدرێت تا بەبێ ترس لەکاتی


مەکیاڤیلی

تەنگژەدا، بۆ پاراستنی وڵات و ئازادی بەرەو ڕووی گەندەڵکاران ببێتەوە. هەروەها دەبێت یاسا و ڕێسایەک هەبێت تا ئەم هەوڵە بەرەو لاڕێ نەچێت. باشتر وایە سەرکردەکانی سوپا بۆ ماوەیەکی کورت دابنرێن نەک بۆ هتاهەتایە وە هەروەها چاودێریان لەسەربێت کە ڕێکخراوەکەیان بۆ ئەو ئەرکە بەکاربهێنن کە لە سەرەتاوە بەو مەبەستە دامەزرێندراوە. بەم شێوە، مەترسی دەسەڵاتی ڕەها و گەندەڵی ڕەها و حکومەتی بێ دەسەڵات چارەسەر دەکرێت .

سەرچاوەیەکی دیکەی شەڕ و دووبەرەکی تەئسیری خراپ دەوڵەمەندە گەورەکانە. ئەوان بە لەبەرچاوگرتنی پلەوپایە و سەروەت و سامانیان، هەندێجار بە قەرزدانی پارە بە خەڵک بۆ زەواج یان یارمەتیدانیان، سوودێک بە جەماوەر دەگەیەنن. ئەم دەسگرۆییە حەزێک لای خەڵک دروست دەکات ئەوان خۆیان بە قەرزداری دەوڵەمەندەکان دەزانن و پشتگیریان لێدەکەن ئەم کارە پاڵ لە پارەدارەکانەوە دەنێت تا بە حەزی خۆیان یاسا پێشێل بکەن و بەو قەناعەتە بگەن کە دەتوانن بە پارە پەرە بە گەندەڵی بدەن . لەبەرامبەردا گەندەڵی و نەفس نزمی هەژاران بۆ ژیانێکی ئازاد پیشاندەری نابەرابەرییە لە وڵاتدا.

مەکیاڤیلی دەڵێت: ئەگەر شارێک لە بەرامبەر حەز و بەرزەفڕی پارەدارەکانیدا، بە شێوەگەلێکی جیاواز نەوەستێتەوە و ئەو حەزەیان سەرکوت نەکات ئەوا شار ڕێگەی گەندەڵی و وێرانی دەگرێتە بەر.

بۆ چارەسەری ئەم کێشە مەکیاڤیلی دەڵێت: حکومەت دەبێ سەروەت و پارەی زۆر و زەوەندی هەبێت و خەڵک تاڕادەیەک لە هەژاریدا بهێڵێتەوە. هەژاربوونی خەڵک ڕێکارێکە کە چیدی خەڵک نەتوانن بە پارەی زۆر کەسانێکی تر بەرەو گەندەڵی پەلکێش بکەن. بەمجۆرەش گەندەڵی کەم دەبێتەوە .

ئەگەر پارە و سامان لای خودی حکومەت بێت ئەوا دەتوانێت لە هەر بەرنامەیەکدا بۆ ڕاکێشانی سەرنج و خۆشەویستی خەڵک بەرامبەر بە حکومەت، بە ئەرکی خۆی هەڵبستێت و مەجال نەدات دەوڵەمەندەکان لەم ئەرکە خێرخوازیەدا پێش حکومەت بکەون. دەوڵەت دەبێ لێرەدا خزمەتی زۆرتر بەو کەسانە بکات کە لە کاروبارییاندا، بەرژەوەندی گشتی لەبەرچاودەگرن تا سوودی تاکەکان. مەکیاڤیلی دەڵێت «ڕاگرتنی کۆمەڵگە لە هەژاریدا بەسوودترین ئەرکێکە کە کۆمەڵگەی ئازاد دەتوانێت جێبەجێی بکات» لەکۆتاییشدا دەڵێت: داری هەژاری بەری شیرینترە لە داری دەوڵەمەندی.

لێرەوە بۆمان ئاشکرادەبێت کە بیرەوەری و داڵغەی مەکیاڤیلی پەیوەندی نزیکی بە چارەنووسی فلۆرانسی زێدی ئەوەوە هەیە. مەکیاڤیلی دەڵێت ئەگەر شارێک بیەوێت ئازادی خۆی بپارێزێت پێویستە کۆمەڵە یاسایەک هەبێت بۆ پشتگیری لە تۆمەت دانە پاڵ یەکتر و ڕەواجی بێ متمانەیی، بە نیسبەت کەسە باشەکانەوە. ئەو دەڵێت لە فلۆرانسدا یاسا و ڕێسایەکی وا بوونی نەبووە. ئەوەی مێژووی ئەم شارەی خوێندبێتەوە دیویەتی کە چ تۆمەتگەلێک بە ناڕەوا دراونەتە پاڵ ئەو هاوشاریانەی کە کاری گرینگیان بە دەستەوە بووە ئەمەش هۆکاربوو بۆ سەرهەڵدانی کێشەگەلێکی زۆر کە پایەی ئازادی

شارەکەیان سست کرد لەکاتێکدا بە ئاسانی دەکرا لە ڕێگەی یاساییەوە ڕێکخراوێکیان دانابا بۆ سکاڵای تۆمەت لێدراوان و سزادانی ئەوانەی بە ناحەق تۆمەتیان داوەتە پاڵ مرۆڤە باشەکان.
فلۆرانس ڕێگەی دا تاکو (کۆزیمۆ مێدیچی) تاقمێک بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی عائیلەکەیان کۆبکاتەوە و بەمجۆرەش بەرەو کۆیلەیی و دیلی هەنگاوی نا. کاتێک ڕەقیبەکانی (کۆزیمۆ)یان عاجز و تۆمەتبار کرد لەبری دڵنەوایی بکەن و پاداشتی پێبدەن، بە شێوەیەکی ناشیرین لە فلۆرانس دەریان کرد بەم ئەرکەش جەماوەرێکی زۆر ئەویان ڕەنجاند و تووڕەکرد تا لە کۆتاییدا ناچاربوون هێنایانەوە فلۆرانس و کردیانە پاشا. پلەیەکی بەرز کە بەبێ ئەو دوژمنکاریەی بە ناحەق لە بەرامبەریدا گرتبوویانە بەر، هەرگیز مومکین نەبوو خۆی پێی بگات .
تەنیا لە ساڵی ١٤٩٤ هەلێک بۆ ئازادی فلۆرانس ڕەخسا. مێدیچییەکان نەفی کران و نیزامی کۆماری دامەزرایەوە. بەڵام لێرەدا سەرکردەکان بە ڕێبەری (پیرۆ سۆدرینی) بە نەگرتنە بەری سیاسەتێکی دروست لەکاتی گۆڕانکاری دەسەڵاتدا، هەڵەیەکی کوشندەیان کرد. هەر ئەو هەڵەیە کە پێشتر لە مێژووی ڕۆمدا، ناوی لێنابوو کوشتنی کوڕەکانی (برۆتۆس). سودرینی ڕای وابوو بە دلپاکی و سەبوری دەکرێت ڕێگە لە حەزی کوڕەکانی برۆتۆس بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵات بگیرێت. ئەو وای بۆدەچوو بەبێ کوشتنی تیپ و تاقمە پیسەکان و لە ڕێگەی ڕێز و نەرمی نواندن دەکرێت ئەوان لە دەسەڵات دووربخاتەوە. نەتیجەی ئەم دڵسافیە ئەوەبوو کوڕەکانی برۆتۆس – لایەنگرانی بنەماڵەی مێدیچی – نەمردن و (سوردینی)یان کوشت و پاش ڕوخانی حکومەت دەسەلاتی ستەمکارانەی مێدیچی گەڕایەوە. سوردینی نەیدەزانی کاتێک ئازادی شارەکەی لەژێر هەڕەشەدایە، پابەندبوون بە ئەخلاق و هەڵنەسان بە ئەرکەکانی خۆی، گەمژەیی و نەزانینە. ئەو نەیدەزانی کردەوە بەپێی دەرەنجامەکەی هەڵدەسەنگێت. ئەگەر بەخت یارمەتیدەری بوایە دواتر دەیتوانی قەناعەت بە جەماوەرەکەی بکات کە ئەو کوشتن و بێ بەزەیی نواندنە خڕ هەمووی لە پێناوی ولاتەکەیدابوو نەک بۆ پلەوپایە و بەرژەوەندی تاکی خۆی . سوردینی زیرەکی برۆتۆسی نەبوو بۆیە هەم پلە و ناوی چاکی خۆی دۆڕاند و هەمیش شارەکەی خۆی بەرەو وێرانی برد. ئازادی خستە مەترسیەوە و هاوڵاتیەکانیشی بەرەو کۆیلەیی و دیلی برد .
بەم جۆرە لێرەشدا، وەکو گوتاری سێهەمی، باسەکە بە لۆمە و مەحکوم کردنی ڕێبەر و حکومەتێک کۆتایی پێدێت کە تەمەنەێکی زۆر، مەکیاڤیلی خۆی خزمەتی کردبوون.

## دامەزراندنی ئیمپراتۆری

لە سەرەتای دووەمین گوتاریدا، باس لە (ئۆردینی) لەلایەن مەکیاڤیلیەوە کۆتایی پێ ناهێنرێت. ئەو دەڵێت بۆ ئەوەی وڵاتێک بە گەورەیی و سەربەرزی تەواو بگات پێویستە ڕێکخراوەگەلی یاسایی ببن



تا هاوڵاتیان چ لە پەیوەندی لەگەڵ خۆیاندا و چ لەگەڵ دەرەوەی وڵاتدا «واتە پەیوەندی سیاسی و سوپایی لەگەڵ حکومەتە کۆماری و پاشایەتیەکاندا» بەپێی ئەو یاسایانە هەڵسووکەوتی باش بنوێنن و فێری ڕەوشت بەرزی ببن و ڕێژەی (ڤێرتو)ی خۆیان بەرز بکەنەوە. زەرووڕەتی بوونی ئەم ڕێکخراو و یاساگەلەش بەڕای مەکیاڤیلیەوە لەمەوە دێت کە وڵاتەکان (میرنشین یا کۆماری) بەردەوام لەگەڵ یەکتر کێشە و ناکۆکیان هەیە. «مرۆڤەکان بە سەروەت و سامانی خۆیان ڕازی نین» و هەوڵ دەدەن «بەسەر گەلانی تردا حوکم بکەن» . ئەمەش وادەکات کە هیچ ولاتێک بەوە ناوەستێ کە چێژ لە ئازادیەکانی خۆی وەربگرێت. هەر شارێکیش عەدالەت و تەبایی و ئاشتی پەیڕەوبکات پاش ماوەیەک دەبێتە قوربانی ڕەوتی ژیانی سیاسی و لێرەشەوە یان ئەستێرەی بەختی هەڵدێت یان ئاوادەبێت بەڵام بە جێگیری نامێنێتەوە .

تاقە ڕێگا ئەوەیە باشترین جۆری پارێزگاری لە هێرشکردندا ببینین ئەمەش دڵنیامان دەکاتەوە کە زێدەکەمان هەم دەتوانێت لە خۆی دیفاع بکات و هەم ئەوانەی کە دژ بە سەربەرزی شارەکەمان دەوەستنەوە، تێکیان بشکێنین و سیاسەتی فراوانخوازی بگرینەبەر . لێرەوە ئاشکرادەبێت کە مەرجی فراوانخوازی لە دەرەوە، هەبوونی ئازادی لە ناوخۆدایە. لێرەدا مەکیاڤیلی دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ڕۆم و دەڵێت: ڕۆم قەرزداری یەکەم یاسادانەری خۆیەتی واتە (ڕۆمۆلۆسە). ئەوبوو کە بە زیرەکی و چاوکراوەیی، بە دانانی ڕێکخراوگەلی تایبەت، سوپاکەی بە شێوەیەکی ڕێک و پێک و چالاک پەروەردەکرد و ڕەوشت بەرزی تێدا جێگیرکردن. ئەمانە و بەختی باش دەستیان دایە دەستی یەکتر و پاش چەند سەرکەوتنی گەورە لە شەڕدا، ڕۆمای بە لوتکەی بەرزی و سەربڵندی گەیاند و کردیە گەورەترین هێز . ڕۆمۆلۆس بە باشی دەیزانی بۆئەوەی کاروباری دەرەوەی وڵاتێک بە باشی ڕێک و پێک بکرێت دەبێت هاوڵاتیەکی زۆر بۆ فراوانکردنی وڵات و هەروەها دیفاع لە وڵات ئامادەبکرێن. ئەمەش لە دوو ڕێگەوە دەستەبەر دەکرێت. هاندانی خەڵک و دانیشتوانی وڵاتانی تر بۆ کۆچ کردن بۆ وڵاتی خۆ و ئاسانکاری بۆ ئەم مەبەستە. چونکا ئەگەر ڕێگەکان بەڕووی خەڵکدا کراوە و ئەمن بن، بێگانەکان بۆ ژیان دێنە وڵاتەکەمان و ئەمەش بە سوودی ئێمەیە . ڕێگەی دووەم ئەوەیە کە دۆستان و هاوپەیمانگەلێک بدۆزیتەوە تا ئەوان پەیڕەویت لێ بکەن و لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی یاسا ڕێزیان لێبگریت و بیانپارێزیت تا لەکاتی پێویستدا، کۆمەکی و یارمەتی سوپاییان لێ وەربگریت . بەڵام مەکیاڤیلی لەگەڵ ڕێگەی سێهەمدایە کە پڕ مەترسیترە. ئەویش کۆکردنەوەی زۆرترین هێزی چەکدارە بۆ خزمەتکردنی باشتری بەرژەوەندیەکانی وڵات. باشترین تەکتیک لە شەڕدا بەڕای مەکیاڤیلیەوە ئەوەیە بە شێوەی سوپای ڕۆم شەڕی «کورت خایەن و بە زەبر و زەنگ» بکەیت. ڕۆمیەکان هەر کە شەڕ هەڵدەگیرسا خێرا بە پێشوازیەوە دەچوون و بەبێ دوودڵی شەڕێکی قورسیان دەکرد. ئەمەش قازانج و بڕوابەخۆبوونی تێدایە و ڕێگە دەدات لە پێگەیەکی بەهێزەوە و بە

کەمترین هەزنیە بەرەورووی دوژمن ببیتەوە .
لێرەوە مەکیاڤیلی بەکورتی باس لە ڕێکخراوی سوپایی و تەلتیکەکانی شەڕ دەکات کە پاشتر لە (ناميلکەی شەڕ)دا بە درێژیی و بە چڕوپڕی قسەی لێدەکات.
مەکیاڤیلی بە نیسبەت (ڤێرتو)ی عەسکەری و ژیاندنەوەی لەئێستادا، تاڕادەیەک ڕەشبینە. ئەمەش لەو نەتیجە نەرێنیانەوە دەردەکەوێت کە دەربارەی شەڕەوە نووسراوە. لەبری ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە بە چ شێوەیەک دەتوانین ورە و ڤێرتوی سوپا بەرز بکەنەوە زۆرتر داڵغەیان لای تاکتیک و ئیستاتیژی شەڕە کە دەرەنجامێکی جگە لە مەرگ و وێرانی نیە. بەرهەمی ئەم خوێندنەوەیەش لە چەند ئامۆفگاری و ئاگادارکردنەوە زیاتر شتێکی تر نیە. وەکو ئەوەی گوتراوە: «کۆڵەکەی بنەڕەتی و سەرەکی شەڕ، سەروەت و سامانە» یان «بڕیاردان بە گومان و دوودڵیەوە یان بە خاوی و پاش بەفیڕۆدانی کات هەڵەیە» «بەکارهێنانی هێزی چریکی و سوپای بەکرێگیراو لە شەڕدا، بێهوودەیە». «ڕێگەنەدان بە هاوڵاتیەک کە تۆمەت دراوە پاڵی و سووکایەتی پێکراوە بۆ سەندنەوەی تۆڵە مەترسیدارە» . «پشت بەستن بە قەڵا و سەنگەر و بینای دیفاعی لە شەڕدا بێ فایدە و زەرەری لیدەکەوێتەوە». «کاتێک لەلایەن سوپایەکی بەهێزەوە هێرش کرایە سەرمان هەرچەند دڵنیابین لە دۆڕانمان لەبری سازش لەگەڵ دوژمندا، باشتر وایە بیر لەوەبکەینەوە کە شکستیان پێبهێنین» . مەکیاڤیلی دژ بە هەموو ئەو گوزارشتانەی سەرەوە دەوەستێت و قسەشی ئەمەیە: لە تواوی ئەم دێڕانەدا، ئەوەی کە پەراوێزخراوە بۆ سەربەرزی وڵات زەرووره، ڤێرتویە ئەمەش یانی بۆ دیفاع لە ئازادی وڵات دەبێت چاوپۆشی لە ملاحەزەی ئەمنی و بەرژەوەندی تاک بکرێت. بۆ وێنە ئەگەر هاوڵاتیەک سووکایەتی پێبکرێت، ڕەنگە ئەو تووڕەیی و ستەمە پەنگ خواردووە، بگاتە گیانی و بەبێ ڕەچاوکردنی دەرەنجامی کارەکەی، شێتانە زەرەر لە بەرامبەرەکەی بدات، هەروا کە (پاوسانیاس Pausanias)ی گەنج کاتێک بینی بە ناحەق ناوی زڕاوە و ڕیسوابووە، فیلیپی مەکەدۆنی باوکی ئەسکەندەری لە ٣٣٦ پ.زدا کوشت .
هەروەها مەکیاڤیلی دەڵێت: «بەکارهێنانی هێزی چریکی و بەکرێگیراو هەڵەیە، چوون ئەوان خڕ هەموویان گەندەلن و لە شەڕدا گەر بۆیان دەست بدات ڕاووڕووت لە هەردوو بەرەی شەڕ دەکەن» .
هەبوونی سیفەتی ڤێرتو چ لە کاروباری سوپا و چ لە ئوموراتی حکومەتدا، لە هەمووشتێک گرینگترە. هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن لەسەر بنەمای ماڵ و سەروەت ماڵوێرانی لەدوایە. ئەوەی کە پێویستە هەڵبسەنگێنرێت ڕەوشت بەرزی دوژمنە، چون ئێوە لەگەڵ ورەی «پۆڵایین بەشەڕدێن نەک لەگەڵ زێڕ» . هەروەهاش، خۆبواردن لە وتووێژ لەگەڵ دوژمنی بەهێز، هەڵەیە لەبەرئەوەی ئەوە چاوەڕێکردنی غەڵەت لە سوپایەکە و هیچ پیاوێکی ژیر و دووربین، ئەم ڕێگە پڕ مەترسیە هەڵنابژێرێت و چارەنووسی سوپاکەی ناداتە دەستی قەدەر .



لێرەوە دەگەڕێتەوە بۆ شکستی فلۆرانس لەبەرامبەر ڕۆمدا و ڕای وایە فلۆرەنسیەکان لە چەک و کەرەستەی جەنگی و... تەکنیکی ڕۆما پەندیان وەرنەگرت و کەوتنە داویانەوە. ڕۆمیەکان دەیانزانی بێ ئیرادەیی و دوودڵی شکستی لێدەکەوێتەوە بەڵام فلۆرانسیەکان بەهۆی وەرنەگرتنی ئەم دەرسە لە مێژوو، زەرەر و زیان و سەرشۆڕیان بۆ کۆمارەکەیان بە دیاری هێنا . ئەمان بە پێچەوانەی ڕۆمیەکان، بە قەڵا و سەنگەر پشت گەرم بوون و ڕێزی سوپا و هاوپەیمانەکانیان نەگرت. هەروەها مەکیاڤیلی بە توندی هێرشدەکاتە سەر ئەو بۆچوونە کە نابێت لەگەڵ دوژمن، هەرچەندە بەهێزیش بێت وت و وێژ و سازش بکرێت. مەکیاڤیلی بیرمان دەخاتەوە کاتێک لە (١٥١٢)دا سوپای (فێردیناند) هێرشی کردە سەر فلۆرانس بەهۆی کەمی خواردن و زەخیرەی شەڕ ویستیان شەڕ ڕابگرن بەڵام فلۆرانسی بوغرا، قەبووڵی نەکرد و لە دەرەنجامدا، فلۆرانس و پراتۆ داگیرکران و کەوتنە بەر ڕاوڕووت، دەسەڵاتی کۆماری تێکشکا و بنەماڵەی ستەمکاری مێدیچی گەڕانەوە بۆ دەسەڵات، مەکیاڤیلی لێرەشدا بە نائومێدی و تووڕەییەوە باس لەو خزمەتانەی خۆی دەکات کە بەو دەسەڵاتە نەزان و بێ ئەزموونەی کردووە.

**سەرچاوە:**


Quentin, Skinner -Machiavelli -Oxford university press -London 1983


**تێبینی:**

ئێسکێنێر، پرۆفیسۆری بەریتانی و نووسەری ئەم کتێبە دەڵێت: هەوڵێکی زۆرمدا بۆئەوەی لە زمانی ئینگلیزیدا، هاوتایەک بۆ وشەی (ڤێرتو)ی ئیتاڵی ببینمەوە چون لە زۆر شوێندا مەکیاڤیلی بەکاریهێناوە بەڵام سەرکەوتوو نەبووم چون ئەم وشە چەند مانا لە خۆی دەگرێت. وشەی (ڤێرتوس- Viritus) لاتینیە و (ڤێرتو - Virtu)ی ئیتاڵی لەوە وەرگیراوە. کە هاوتای وشەی (ئارەتێ - Aretê)ی یۆنانیە. لە وشەی (ڤێر- Vir) وەرگیراوە کە بە مانای (پیاو)ە. لە ئەدەبی لاتیندا بە مانای (مێرد) و (پیاوی پیاوان) و (شێرەپیاو) و لای سیسرۆنی مێژوونووس بە مانای گەریلا و شەڕکەر هاتووە. بە لەبەرچاوگرتنی ڕەگی وشەکە مانای (کەماڵ) و (هونەر) و (گەورەیی) و (هێز)یش لەخۆدەگرێت. لەفارسیدا هەندێجار بە مانای (فەزڵ) و (پاکی) و (لەخواترسی) و (ڕەوشت بەرزی) و (لێهاتوویی) و (پاکداوێنی) و (چاونەترسی) و... هاتووە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم هەموو مانایە دەبێ بڵێین حەق بە ئێسکێنەرە کە هەر خودی وشە ئیتاڵیەکەی بەکارهێناوە. (و. ک)

# ئازادی
# بیروڕا و وتووێژ

نووسینی: جۆن ستیوارت میل
و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

هیوادارم ئیتر ئەو سەردەمەمان بەجێهێشتبێت کە پێویست بوو بەرگری لە ئازادی ڕاگەیاندن بکەین، وەک یەکێک لە زەمانەتە گەورەکانی کۆمەڵگا لەبەرامبەر حکومەتە گەندەڵ و ستەمکارەکاندا. ئیمرۆ چیدی پێویست بە ڕونکردنەوە و سەلماندنی ئەو بۆچونە نیە کە ئێمە نابێت ڕێگە بە ئەنجومەنی یاسادانان یان جێبەجێکردن بدەین کە بەرژەوەندیان جیاوازە لە بەرژەوندی خەڵکی، ڕەچەتەی بیروڕا بۆ خەڵکی بنوسێت یان بڕیار بدات کە چ جۆرە بۆچون و ئەرگۆمێنتێک بە گوێی خەڵکی بگات. جگە لەمە لایەنە پسپۆریەکانی ئەم مەسەلەیە بەڕادەیەک لەلایەن نووسەرانی پێش ئێمەوە دووبارە کراوەتەوە و بە سەرکەوتوانە جێگەی خۆی لە بیرکردنەوەی خەڵکدا داگیرکردوە، کە چیدی پێویست بەوە نەکات جارێکی تر پێداگری لەسەر بکەین. گەرچی یاسای هەنوکەی چاپەمەنی ئینگلتەرا هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە کامڵەی ئازادی ڕەهای زمان و قەڵەم زامن بکات و بەهەمان ئەندازە ئامرازی بێویژدانیە کە لە سەردەمی سەڵتەنەتی «تۆدۆرۆکان»[1]دا

١) تۆدۆرەکان زنجیرەیەکی پاشایی بون کە لەلایەن هانری حەوتەهەمەوە دامەزرا کە ناوی هانری تۆدۆرۆ بوو. کە یەکێک بوو لە سەرانی شەڕی ناوخۆی ئینگلتەرا. (و.ک)

هەبوو، بەڵام چیدی مەترسی ئەوەی یاسایەک بە کردەوە دژی وتوێژی سیاسی بەکاربهێنرێت، زۆر کەم بۆتەوە، مەگەر تەنها لەکاتی قۆناغەکانی ترس و تۆقاندنی کاتیدا کە ترسی یاخیبون و سەرکێشی، ڕێگە لە وەزیر و دادوەران ئەگرێت ڕەفتاری ڕاست ئەنجامبدەن[٢].

بە گشتی ئەکرێت بگوترێت لەو وڵاتانەی خاوەن حکومەتی یاسایین، چیدی ئەم مەترسیە لە ئارادا نیە کە دەوڵەتی وەخت چ بگات بەوەی بەرپرسیاری خەڵک بێت یان نا، دەست بۆ حەرەمی بیروڕای خەڵکی ببات، مەگەر ئەوکاتەی دڵنیا بێت کە لەم کارەدا داواکاری خەڵک جێبەجی ئەکات کە لە دەست بیروڕایەک بێزار بوون و چیدی ناتوانن لەبەرامبەریدا لێبوردوو بن. لەبەرەئەوە با گریمانەی ئەوە بکەین کە حکومەت بەتەواویی لەگەڵ خەڵکدا یەکە و هەرگیز ئەو بیرە بە خەیاڵیدا نایەت کە ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بیروڕایەک بە زۆر بگرێت، مەگەر ئەوەی بەڕاستی بڕوای بەوە هەبێت کە کارەکەی ئەنجامدانی خواستی خەڵکیە و ئەو هەراوهوریایەی دژی بیروڕایەک بەرزبۆتەوە، دەنگی ڕاستەقینەی خەڵکە. بەڵام ئەوەی هەیە من دژی خودی ئەم ڕوانینەم کە خەڵک مافی خۆیانە بیروڕایەک ڕاستەوخۆ (بەدەستی خۆیان) یان ناڕاستەوخۆ (بەدەستی حکومەت) بخنکێنن. ئەمجۆرە دەسەڵاتە لە ڕەگوڕیشەوە ناپاکە و هیچ فەرق ناکات کە جێبەجێکەری چ

---

٢-) هێشتا مورەکەبی ئەم قسانە وشک نەبوو بووە کە لەناکاو ڕوداوی دادگایکردنی چاپەمەنیەکان لە لایەن دەوڵەتەوە (١٨٥٨) هاتە پێشەوە و وەک ئەوەی چارەنوس ویستبێتی بەڵگەیەکی بەرجەستە بۆ ڕەدکردنەوەی قسەکانم بهێنێتە پێشێ. بەڵام بەهەرحاڵ ئەو تێوەردانەی لە لایەن دەوڵەتەوە لە ئازادی وتوێژی گشتیدا کرا، لەسەر بنەمای خراپ هەڵسەنگاندن بوو و هیچ پیویستی نەئەکرد کە لە یەک وشە لە بابەتەکانی ئەم کتێبە بگۆڕم. هەروەها یەک تۆز لەو بڕوا بەهێزەم کەم نەبۆتەوە کە سەردەمی سزادانی نووسەران و پەخشکەران (بەتاوانی ئەو شتانەی کە نوسیویانە و ئەو بیروڕایانە بڵاویان کردۆتەوە) بەشێوەیەکی گشتی لەم وڵاتەدا (ئینگلتەرا) کۆتای پێهاتووە و هاوشێوەکانی ئەم سزادانانە لە ساتەوەختی ترس و تۆقینی گشتیدا نەبێت، دوبارە نابێتەوە،

لە پلەی یەکەمدا نابیت ئەوە فەرامۆش بکەین کە دەوڵەت بە دەستپێشخەری خۆی وازی لە بەدواداچونی ئەو ڕۆژنامانە هێنا.

لە پلەی دوهەمدا گەر ڕاستی مەسەلەکەمان بوێت هیچ یەک لەو دادگایانە ڕەهەندی سیاسی نەبوو، چونکە بەڵگەکانی داواکاری گشتی لەسەر تۆمەتباران لەسەر ئەوە نەبوو کە ئەم ڕۆژنامانە ڕەخنەیان لە دەزگا سەرەکیەکانی وڵات، لە کرداری دەسەڵاتداران یان ڕەخنەیان لە خودی دەسەڵاتداران گرتووە، بەڵکو لەسەر ئەوە بوو کە ئەم ڕۆژنامانە بۆچون و بیروڕایەکیان بڵاو کردبووە کە ئەنجومەنی حوکمڕانی ئەوکاتە بە ناکۆک لەگەڵ ئەخلاق و دابونەریتی گشتی دانابوو. بە دەربڕینێکی تر ئەمانە تۆمەتبار بون کە بیرۆکەی «ڕەوایەتی کوشتنی دەسەڵاتدارانی ستەمەکار»یان لە ستونی ڕۆژنامەکانی خۆیاندا بلاوکردۆتەوە.

ئەگەر ئەرگۆمێنتەکانی لەم فەسلەدا هێنراوەتەوە. لەلایەن خوێنەرەوە بایەخ و بەهیز بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا وتوێژ و گفتوگۆی ئازاد لەبارەی هەر مەسەلەیەکەوە یان هەر بیرۆکەیەکەوە -چەند ئەو بیرۆکەیە ناکۆک بە ئەخلاقیش بژمێرێت- ئەبێت ڕێگەپێدراو بێت و دوور بێت لە مەترسی سزادانەوە. لەبەرئەوە باسکردن لەوەی ئایا بیرۆکەی «ڕەوابوونی کوشتنی ستەمکاران» ئەتوانریت بە ناکۆک بە ئەخلاق بژمێرێت یان نا، بەدەرە لە بابەتی ئەم نامەیە و من تەنها لێرەدا بە وتنی ئەو خاڵە واز ئەهینم کە ئەم مەسەلە هەستیارە-واتە ڕێگەدان بە کوشتنی فەرمانڕەوای ستەمکار- لەهەر سەردەمێکدا بەشیک بووە لە مەسەلە گرنگەکانی فەلسەفەی ئەخلاق کە باس و وتوێژی ئازادانەی لە دەور کراوە.

بە دەربڕینێکی تر هەر کاتێک کەسێکی تۆڵەکەر، تاوانبارێکی دەسەڵاتداری لەناوبردوە کە نەتوانراوە سزای یاسایی بدرێت (چونکە جێبەجێکەرانی یاسا لە دەسەڵاتی ترساون)، کارەکەی لە ڕوانگەی هەندێک لە باشترین و عاقڵترین پیاوانی جیهانەوە نەک بە تاوان ئەژمار نەکراوە، بەڵکو بەجۆریک لە فەزیلەت و دلێری ئەخلاقی ئەژمار کراوە. ئیستا بەدەر لەوەی بنەمای کارەکە ڕاست بێت یان هەڵە، بەهەرحاڵ ناکرێت بە پیاوکوژی دابنرێت، بەڵکو کوشتنێکە کە حوکمی یەکێک لە زیانەکانی شەڕی ناوخۆی هەیە. لێرەوە بڕوام وایە کە هاندانی کەسێک بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، لە دۆخێکدا کە نیەتی خراپی ئەوانەی نەخشەیان بۆ کێشاوە بسەلمێنرێت، بەڕاستی ئەبێت مەحکوم بکرێت و شایەنی تەمێکردنە. بەڵام ئەم تەمێکردنە تەنها کاتێک ڕێگە پێدراوە کە هاندانی تاوانبار یان تاوانباران بووبێتە هۆی تاوانێک، واتە بە کردەوە کوشتنێک ڕویدابێت یان لانیکەم جۆریک پەیوەندی شێمانەیی لە نیوان کردار و ئەو هاندانانەدا بدۆزرێتەوە کە بۆتە هۆی ئەنجامدانی تاوانەکە. تازە لەم حاڵەتەشدا تەنها ئەو حکومەتەی هێرشی کراوەتە سەر (نەک حکومەتیکی دەرەکی) مافی ئەوەی هەیە لەسەر بنەمای «پاراستنی خود» ئەو هێرشانەی دژی مانەوە و بونی کراوە، سزا بدات.



جۆن ستیوارت

جۆره حکومەتێکە. باشترین و خراپترین حکومەتەکان هیچ کامیان مافی ئەوەیان نیە بیروڕایەک بە زۆر خامۆش بکەن. کارێکی وا لەبەرئەوەی خۆبەخۆ وێرانکارانە و زیانبەخشە، کاتێک بە ڕەزامەندی ڕای گشتی ئەنجام بدرێت، زیانەکەی نەک هیچ کەمتر نیە لەوەی بە پێچەوانەوەی هەمان ڕای گشتیەوە ئەنجامبدرێت، بەڵکو زیاترە. ئەگەر هەموو تاکەکانی مرۆڤ- جگە لە یەک کەس- یەک بیروڕایان هەبوو، و تەنها یەک کەس بیروڕای لەگەڵ هەموو مرۆڤەکانی تردا جیاواز بوو، ئەوا هەوڵدان بۆ سەرکوتکردنی ئەم دەنگە، هەر بە ئەندازەی ئەوە ناڕەوایە کە گەر گریمان ئەو کەسە دەسەڵاتی ئەوەی هەبوایە دەنگی ئەو هەموو خەڵکە بە زۆر سەرکوتبکات. ئەگەر بیروڕای مرۆڤ بەڕێکەوت شتێکی وەک سامانی تایبەتی خۆی بێت کە جگە لە خاوەنەکەی بۆ کەس نرخی نیە و ئەگەر بێبەشکردنی لە تێگەیشتن لە لەزەت و خۆشیەکانی ئەو سامانە زیانێک دروستبکات کە تەنها پەیوەندیی بە چەند کەسێکەوە هەیە، ئەوا مەسەلەکە جیاواز ئەبوو. چونکە لەم حاڵەتدا ئەکرا بگوترێت کە زیانی ئەمکارە لەبری ئەوەی زیان بە ژمارەیەکی زۆر بگەیەنێت، تەنها تووشی یەک یان چەند کەسێک ئەبێت. بەڵام مەترسی گەورەی بێدەنگکردنی بیروڕایەک لەوەدایە کە زیانەکەی سەرجەم ڕەگەزی مرۆڤ ئەگرێتەوە، و ئەوەی نەوەکانی داهاتوو لەمڕووەوە لە دەستی ئەدەن، کەمتر نیە لەو زیانەی کە توشی نەوەی هاوچەرخ ئەبێت. جگە لەمە کاتێک ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بیروڕایەک بە زۆر ئەگیرێت، ناڕازیەکان زۆر زیاتر لە خاوەنەکانی ئەو بیروڕایە زیانیان پێئەگات. چونکە ئەو بیروڕایەی بە زۆر بێدەنگ ئەکرێت، ئەگەر ڕاست بێت، لەم حاڵەتەدا هەمان ئەو کەسانەی لەم بیروڕایە ناڕازین، ئەو هەڵە بەنرخە لە دەستئەدەن کە هەڵەکەیان ڕاست بکەنەوە. بەڵام گەر بیروڕایەک هەڵە بێت، سەرکوتکەرانی دیسان بەهەرشێوەیەک بووە زیانیان پێئەگات، چونکە گەر بەریەک کەوتنی بیروڕاکانیان ئازاد بکردایە، لەبەرکەوتنی ڕاستی و هەڵەدا، سیمای هەقیقەت زیندوتر و ڕوونتر ئەبینرا.

لێرەوە پێویستە بەشێوەیەکی ورد تاوتوێی ئەم دوو گریمانەیە بکەین کە هەریەکەیان ئەرگۆمێنتی تایبەت و گونجاو لەگەڵ زەمینەکەیدا خۆیدا هەیە. یەکەم بە چیدا دیارە ئەو بیروڕایەی هەوڵئەدەین خامۆشی بکەین، بێ بناغە و هەڵەیە. تەنانەت گریمان دڵنیابوین کە هەڵەیە، دیسان خنکاندنی کارێکی ناشرین و زیانبەخش ئەبوو.

سەرەتا با گریمان ئەو بیروڕایەی سەردارانی کۆمەڵگا ئەیانەوێت بیخنکێنن، بیروڕایەکی ڕاستە و بایەخی خۆی هەیە. دیارە ئەو کەسانەی ئەیانەوێت ئەم بیروڕایە بێدەنگبکەن، نکوڵی لەڕاستیبوونیشی ئەکەن. بەڵام دواجار خودی ئەمانیش ئەوەندە دوور نین لە هەڵەوە کە مافی ئەوەیان هەبێت بەناوی سەرجەم مرۆڤەوە لەبارەی مەسەلەیەکەوە بڕیار بدەن و ئەوانی تر لە ئامرازەکانی هەڵسەنگاندن بێبەش بکەن. گوێنەگرتن لە بیروڕایەک بە بیانوی ئەوەی کە نەیارەکانی بڕوایان بە هەڵەبوونی هەیە، مانایەکی نیە جگە لەوەی کە گروپی نەیار دڵنیای خۆیان بە دڵنیایەکی ڕەها ئەزانن. کەسانێک کە وتوێژی ئازاد بە زۆر بێدەنگ ئەکەن، ئەو گریمانە بێهودەیەیان لە سەرەتاوە قەبوڵکردوە کە خۆیان قابیلی هەڵەکردن نین. بەڵام ئەکرێت ئەم کارە ستەمکارانەیەی ئەوان بەو ئەرگۆمێنتە سادە و ساکارە وەڵام بدرێتەوە کە هیچکەس لە دنیادا لە ئەگەری هەڵەکردن دوور نیە، بە بێ ئەوەی ئەم سادە و ساکاریە هیچ لە بەهێزی ئەرگۆمینتەکە کەمبکاتەوە. بەدبەختانە هێزی هەڵسەنگاندنی مرۆیی لەو ڕووەوە زۆر بەختی کەمە کە تەنها بەشێوەیەکی ڕوکەشی ڕاستی

وەک ئەم هەقیقەتە ئەسەلمێنێت کە مرۆڤ قابیلی هەڵەکردنە، بەڵام لەکاتی هەڵسەنگاندنی پراکتیکیدا، ئەو ڕێزەی لێ ناگیرێت کە شایستەی ئەمجۆرە ڕاستیانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموان ئەزانن کەس لە هەڵە پارێزراو نیە، بەڵام لە کرداردا زۆر کەم ئەبینرێت کە هەر ئەم «کەسانەی ئەو ڕاستیە ئەزانن» بۆ ڕێگرتن لە هەڵەکانی خۆیان، بەشێوەیەکی کاریگەرانە هەنگاو بنێن، یان ئەو گریمانەیە قەبوڵبکەن کە ئەو بڕوایەی دڵنیان لە ڕاستی بوونی، هیچ دوور نیە یەکێک لەو هەڵانە بێت کە مرۆڤ زۆرجار ئەیانکات. بەڵام ئەو گروپەی خەڵک کە بەختەوەریان لەمجۆرە پاشایانە زیاترە، و هەندێکجار قسە و بیروڕای نەیارەکانیان بە گوێیان ئەگات، ئەوانیش بۆ بەدبەختی دڵنیایەکی سەرسوڕهێنەریان بەرامبەر بە هەڵسەنگاندنی هاوڕێکانی خۆیان هەیە و تەنها ئەو بیروڕایانە بەڕاست ئەزانن کە ئەم گروپە ئەیسەلمێنێت. هەروەها دڵنیایی خۆیان بەرامبەر بیروڕای کەسانێک پیشانئەدەن کە بە مەرجەعی خۆیانی ئەزانن، چونکە بە هەمان ڕێژە کە دڵنیایی مرۆڤ بەرامبەر هەڵسانگاندنی ڕاست و پتەوی خۆی بلەرزێت، بەهەمان ئەندازە پشت بە هەڵسەنگاندنی گشتی جیهان ئەبەستێت و بە دوور لەهەڵەی دائەنێت. بەڵام «جیهانی» تاکەکەسێک بەگشتی بەشێکە لەو دنیایەی سەروکاری لەگەڵدایە: واتە حیزبەکەی، مەزهەبەکەی، گروپە مەزهەبیەکەی، چینە کۆمەڵایەتیەکەی، و ئەگەر هەندێکجار پیاوێکی ئاسۆ فراوان پەیدا بێت کە مەبەستی لە دنیا، سەرتاسەری وڵات یان سەدەیەک بێت کە تیایدا ژیاوە، ئەوا ئەکرێت پیاوێکی وا بە بەراورد بەوانی تر بە لیبراڵ و خاوەن بیر دابنێین. هەروەها هوشیاربوونی کەسێکی وا بەوەی کە سەدەکانی تر، وڵاتەکانی تر، گروپەکانی تر، چینەکانی تر، حیزبەکانی تر، ڕێک پێچەوانەی ئەو بیریان کردۆتەوە (و ئیستاش هەروا بیرئەکەنەوە)، بچوکترین لەرزین لە بناغەی ئەو بڕوایەدا دروست ناکات کە مەرجەعی ئەو بریتیە لە هەڵسەنگاندنی دەستەجەمعی (دنیاکەی خۆی). ئەو بەرپرسیارێتیەک بۆ دنیای تایبەتی خۆی دائەنێت کە بیروڕای ئەندامانی ئەم دنیایە، ئەبێت لەبەرامبەر بیروڕای کەسانێکدا ڕاست بێت کە سەر بە دنیای تر و جیاوازن، و هەرگیز زەحمەتی ئەو بیرکردنەوەیە بە خۆی نادات کە تەنها ڕێکەوتێکی پەتی بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو نەبێت بە ئەندامی یەکێک لەو» دنیا نەیارانە»، ئەگینا هەمان ئەو هۆیانەی کە وای لێکردووە کەسێکی مەسیحی بێت لە لەندەن، ئەیتوانی بارودۆخەکە وا بێنێتە پێشێ کە ئەو بۆ نمونە کەسێکی هندی «پەیڕەوی بودا» یان کەسیکی چینی «لایەنگری کنفشیۆس» بێت.

ئەوەی لەم مەسەلەیدا بەڵگەنەویستە ئەوەیە کە «سەدەکان»یش وەک «تاکەکان» تووشی هەڵە ئەبن و ئەو بیروڕا زۆرانەی کە لەلایەن خەڵکانی یەک سەدەوە قەبوڵکراون، نەک هەر لەسەدەی دواییدا بەها و نرخی خۆیان لەدەستداوە، بەڵکو پوچ بونیشیان سەلمێنراوە. هەر لەبەر ئەمە بەگشتی بەڵگە نەویستە کە زۆرێک لەو بیروڕایانەی ئێمە کە ڕەهەندی گشتی هەیە لەلایەن سەدەکانی داهاتووەوە ڕەد ئەکرێتەوە، وەک چۆن سەدەی ئێمە ئەو بیروڕایانەی ڕەد کردۆتەوە کە ڕۆژگارێک ڕەهەندی گشتی هەبووە.

پێئەچێت ئەو ڕەخنەیەی ئاراستەی ئەم ڕایە ئەکرێت، بەمشێوەیە بێت. نەیارانی ئازادی بیروڕا ئەڵێن: «کاتێک ئێمە ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی بیروڕایەکی هەڵە ئەکەین، خۆمان بە پارێزراو لە هەڵە نازانین، بەڵام ئەگەری هەڵەکردن هەر تایبەت نیە بە ئێمە، بەڵکو هەر کەسێک بەرپرسیارێتیەکی گشتی هەبێت و لەسەر بناغەی هەڵسانگاندن و بەرپرسیارێتی خۆی کارێک ئەنجامبدات، ئەشێت هەڵە بکات. هەستی



جۆن ستیوارت

هەڵسەنگاندن بە خەڵک بەخشراوە بۆ ئەوەی سودی لێ وەربگرن و ناکرێت لەبەرئەوەی کە ڕەنگە هەڵە لەم هەڵسەنگاندنەدا بکەن، بەخەڵک بگوترێت کە نابێت سود لە هەستی هەڵسەنگاندنی خۆتان وەربگرن. کاتێک بەرپرسیارانی بەرژەوەندی کۆمەڵگا بڵاوبوونەوەی شتێک قەدەغە ئەکەن کە لە دیدی ئەوانەوە بێئەندازە زیانبەخشە، مانای کارەکەیان ئەوە نیە کە خۆیان لە هەڵە بەدوور ئەزانن، بەڵکو بە ڕەچاوکردنی ئەو ئەگەرە کە ڕەنگە هەڵە بکەن، ئەو ئەرکە بەسەر بیروڕا ویژدانیەکانی خۆیاندا جێبەجی ئەکەن کە لە ئەستۆیان گرتووە. ئەگەر بڕیار بێت ئێمە لەبەرئەوەی ڕەنگە بیروڕاکانمان هەڵە بێت، بترسین لەوەی بەپێی ئەو بیروڕایانە کاربکەین، ئەوا لەو حاڵەتەدا ناچار ئەبین ڕاستەوخۆ چاو لە ئەنجامدانی ئەرکە سەرەکی و بەرژەوەندیە بنەڕەتیەکانمان بپۆشین.

ئەو ڕەخنەیەی ئەکرێت ئاراستەی هەموو جۆرە ڕەفتارێکی مرۆیی بکرێت، بەڵگەیەکی بەهێز نیە بۆ بە هەڵە تەماشاکردنی ڕەفتارێکی تایبەت. ئەرکی حکومەت و تاکەکان شتێکی لەوە زیاتر نیە کە ڕاسترین بیروڕا کە بۆیان ڕێک ئەکەوێت بەوپەڕی وردی و وردبونەوەوە هەڵبژێرن و تا ئەوکاتەی لە دەرئەنجامی کردەوەیی کارەکەی خۆیان دڵنیا نەبن، هەرگیز بەسەر ئەوانی تردا نەیسەپێنن. بەڵام کاتێک بەرپرسیارانی کۆمەڵگا لە زیان و دەرئەنجامە خراپەکانی بیروڕایەک دڵنیا بوون، ئەگەر ئەو بیروڕایە لەکۆمەڵگادا بێدەنگ نەکەن، بەڕاستیی ترسنۆکی خۆیان پیشانداوە و ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ نەکردووە. هیچ ڕابەرێکی بەرپرسیار مافی ئەوەی نیە و نابێت خۆی لە خامۆشکردنی بۆچون و ئەو بیروڕایانە بدزێتەوە کە بەڕاستیی هەستئەکات بۆ خۆشبەختی مرۆڤ لەم دنیایە یان لەو دنیای تردا ترسناکە، و بەڵگەشی بۆ ئەم خۆدزینەوەیە ئەوە بێت کە کەسانی تر لە سەداکانی پێشوتردا کە کەمتر لەسەدەی ئێمە دروەشاوە بووە، ئەو بیروڕایانەیان تەکفیر کردووە کە ئەمڕۆ سەلمێنراوە کە ڕاست بوون. ئەم نەیارانەی ئازادی بیروڕا ڕەنگە بڵێن: «گرنگترین ئەرکی ئێمە چاودێریکردنی ئەوەیە هەڵەکانی ڕابردوو دووبارە نەبنەوە. حکومەت و نەتەوەکان لە زۆر حاڵەتدا کە بۆ بەکارهێنانی دەسەڵات گونجاو بووە، توشی چەندان هەڵە بوون: بۆ نمونە باجی خراپیان داناوە و جەنگی نادادپەروەرانەیان ڕاگەیاندووە. کەوابوو ئەبێت ئێمەش هەرگیز باج دانەنێین یان لەبەرامبەر هەر شەڕفرۆشیەکدا کە کرا، هیچ کاتێک نابێت شەڕ ڕاگەیەنین؟ تاکەکان و حکومەتەکان لەسەرشانیانە کە بەوپەڕی توانای خۆیانەوە کاربکەن. لە دنیادا هیچکات شتیک نەبووە ناوی «دڵنیایی ڕەها» بێت، بەڵام بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکانی مرۆڤ، چەندان زەمانەتی پێویست هەیە. ئێمە ئەتوانین (و ئەرکی سەرشانمانە) کە شێوەی ڕەفتاری کۆمەڵگا لەژێر ڕۆناکی ئەو بیروڕایانە ڕێکبخەین کە دڵنیاین لە ڕاستی بونیان، و لە ئەنجامدانی ئەوکارەش مافێکی زیاتر لەوەمان نیە کە ڕێگەنەدەین خەڵکانی گەندەڵ بیروڕایەک کە لە ڕوانگەی ئێمەوە هەڵەیە و زیانبەخشە بەئازادانە بڵاوبکەنەوە و کۆمەڵگا گومڕا بکەن«.

وەڵامی من ئەوەیە ئەم ئەرگۆمێنتە مافێکی زیاتر لەوەی ڕوکەشی قسەکان دەریئەخات، بە خۆی ئەدات. ئاسمان تا ڕێسمان جیاوازی هەیە لەنێوان بیروڕایەکدا کە ڕاستیەکەی قەبوڵکراوە، لەبەرئەوەی هەر هەلێک بۆ تاقیکردنەوە و ڕەدکردنەوەی ئەو بیروڕایە پەیدا بووە کەسێک نەیتوانییوە هەڵە بوونی بسەلمێنێت، لەگەڵ ئەو بیروڕایانەی کە پەیڕەوانی پێشوەخت ڕاستیبونیان سەلماندووە، تەنها بە مەبەستی ئەوەی ڕێگە نەدەن هەڵەبونی دەرکەوێت. تەنها مەرجێکی بایەخدار کە ئەکریت لە ژێر ڕۆشنایی ئەودا بیروڕایەک بەڕاست

دابنرێت، ئەوەیە مرۆڤ بتوانێت ئەو بیروڕایە لەگەڵ بیروڕای کەسانی دیدا بەراورد بکات و هەڵەی بەڵگەکانی بەرامبەرەکانی ئەگەر پوچ بوون، بسەلمێنێت. هیچ مەرجێک جگە لەمە ناتوانێت بەشێوەی لۆژیکی ئەو هەستە بە بونەوەرێکی عاقڵ و هۆشیار بدات کە بیروڕاکەی ڕاست و سەقامگیرە.
کاتێک تاوتوێی مێژووی بیروڕاکانی مرۆڤ یان سەرگوزەشتەی ڕەفتاری ئاسایی مرۆڤ ئەکەین و ئەبینین کە هەمیشە ئەگەری ئەوە هەبووە کە ئەو بیروڕا یان ڕەفتارە زۆر خراپتر بووبێت لە دۆخی ئێستای و بەڵام خراپتر نەبووە، بە ناچار ئەبێت بپرسین هۆی ئەم ڕێکەوتە بەختیارە چیە؟
بێگومان ناکرێت (ئەم ڕێکەوتە) بگەڕێنینەوە بۆ هێز و توانایەکی تایبەت کە لە تێگەیشتنی مرۆڤدا هەیە، چونکە لەهەموو ئەو مەسەلانەدا کە خۆبەخۆ بەڵگەنەویست و ئاشکرا نین، لەبەرامبەر هەر یەکێکدا کە بتوانێت توانای هەڵسەنگاندنی ڕەسەنی خۆی بکاتە پێوەری دیاریکردن، نەوەدونۆ کەسی تر هەن کە توانای هەڵسەنگاندنی لەمچەشنەیان بەهیچ شێوەیەک نیە. تازە توانای ئەو یەک کەسەش ڕێژەییە، چونکە زۆربەی زانایان و بیریارانی هەر یەک لە نەوەکانی ڕابردوو، بیروڕای زۆریان هەبووە کە دواتر دەرکەوتووە هەڵە بووە، و کاری زۆر یان بڕیاری زۆریان داوە کە هیچ کەسێک ئەمڕۆ بە پاساویان نازانێت. کەوابوو لەگەڵ هەموو ئەم وردەکاریانەدا بۆچی بەگشتی لەنێوان تاکەکانی مرۆڤدا بیروڕا و ڕەفتاری لۆژیکی لەسەرترە؟ ئەگەر ڕێز و بەهایەک بۆ ئەمجۆرە بیروڕایانە هەیە -ئەشبێت هەبێت- ئەوا بەناچاری قەرزاری چۆنایەتیەکە لە بیری مرۆڤدا کە سەرجەم ئەو کار و بیرانەی شایستەی ڕێزین (وەک بونەوەرێک کە خاوەن بەهرەی ئەخلاقی و عەقڵانیە) سەرچاوەی لێوە وەرئەگرن: (ئەو چۆنایەتیەش بریتیە لەوەی مرۆڤ بونەوەرێکە) هەڵەکانی قابیلی چاککردنن. مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە هەڵەکانی خۆی بە یارمەتی گەڕان و ئەزمون چاکبکاتەوە. بەڵام ئەزمون بەتەنیا بەس نیە. بەڵکو وتوێژیش ئەبێت هەبێت کە مرۆڤ بتوانێت بەشێوەیەکی دروست تەعبیر لە ئەزمون بکات. کار و بیروڕای هەڵە کەم کەم جێی خۆی بە هەقیقەت و ئەرگۆمێنت ئەدات. بەڵام گەر بڕیار بێت هەقیقەت و ئەرگۆمێنت کار لە فکری مرۆڤ بکەن، ئەوکاتە هەردووکیان ئەبێت لەبەردەم عەقڵ و بیرکردنەوەی مرۆڤدا ئامادەبن. ئەو ڕاستیانە زۆر کەمن کە ئەتوانن بەسەرهاتی خۆیان بە بێ یارمەتی ئەو تەفسیرانەی کە بۆ ڕونکردنەوەیان پێویستە دەربڕن. کەوابوو کاتێک سەرجەم هێز و بەهای هەڵسەنگاندنی مرۆڤ بەسترابێت بەم ئیمتیازەوە کە ئەو هەڵسەنگاندنەی کاتێک ڕاست نیە، ئەکرێت چاک بکرێت، لەم حاڵەتەدا تەنها ئامرازی دڵنیابون لەمجۆرە هەڵسەنگاندنە هەر ئەوەیە کە مەحەکی تاقیکردنەوە و ئامرازی چاککردن هەمیشە لەبەردەستدا بن. لەبارەی هەر مرۆڤێکەوە کە هەڵسەنگاندنی بەڕاستی شایستەی متمانەپێکردنە، ئەو پرسیارە دیتە پێشێ کە چۆن بووە بیروڕای ئەم مرۆڤە ئەوەندە جێگەی متمانەپێکردن بووە؟ لەبەرئەوەی بیری بۆ بیستنی هەرجۆرە ڕەخنەیەک لە ڕەفتار و کارەکانی کراوە بووە. چونکە ئەوە خوی بەوەوە گرتووە کە گوێی لە هەموو ئەو قسانە بێت کە دژی بیروڕاکانی کراون، بۆ ئەوەی بتوانێت سود لە قسەی نەیارەکانی وەربگرێت و لە هەمانکاتدا خۆی ببینێت کە چ بەشێک لە وتە و ئەرگۆمێنتەکانی هەڵەیە و هەڵەکەش لە دەرفەتێکدا پیشانی ئەوانی تر بدات. چونکە هەستی کردوە کە تەنیا ڕێگەیەک مرۆڤ بتوانێت بە هۆیەوە تاڕادەیەک «سەرتاپای بابەتێک» بناسێت، ئەوەیە گوێ لە هەموو ئەو قسە و بۆچونانە بگرێت کە نەیارەکانی بە بیروڕای ناکۆکەوە لەبارەی ئەو بابەتەوە هەیانە، سەرجەم


جۆن ستیوارت

ئەو شیوازانەش تاوتوێ بکات کە ئەو بابەتە لە بیروڕای جیاوازدا وەریئەگرێت و لە دیدی ئەوانەوە تەماشای بکات. هیچ کەسێکی عاقڵ لەم ڕێگەیەوە نەبێت عاقڵ نەبووە و لەبنەڕەتدا هێزی داهێنەرانەی تێگەیشتنی مرۆڤ بەجۆرێک خوڵقاوە کە بتوانێت لە ڕێگەیەکی ترەوە عاقڵ بێت.

ئەو نەریتە ڕێکخراوە کە مرۆڤ بیروڕاکانی خۆی بەبەرکەوتن لەگەڵ بیروڕای کەسانی دی چاک و کامڵ ئەکات، نەک هەر گومان ناخاتە سەر ئەو بیروڕایە لە قۆناغی پراکتیکدا، بەڵکو تەنها بناغەیەکی پتەوە کە ئەتوانرێ بەدڵنیایەوە پشتی پێ ببەسترێت، چونکە ئەو کەسەی گوێی بۆ هەموو جۆرە بیروڕایەکی نەیار گرتووە و هەر چیەک کە لانیکەم توانراوە بە ئاشکرا دژی بیروڕاکەی بگوترێت، بیستویەتی، و لەگەڵ ئەوەشدا پێگەی خۆی لە بەرامبەر هەموو نەیارەکان و دژەکانیدا پاراستووە و ویژدانی ئاسودەیە کە لەبری دوورکەوتنەوە لە گرفت و دژایەتیەکان، بە مەیل و ئارەزوو و ڕەزامەندی لەو شتانە کۆڵیوەتەوە. و بەکورتی هیچ درزێکی نەهێشتۆتەوە کە ڕەنگە تیشکی هەقیقەت لێوەی بەسەر بابەتەکەدا بدرەوشێتەوە، کەسێکی لەمجۆرە مافی خۆیەتی هەڵسەنگاندنی خۆی لە هەڵسەنگاندنی هەر کەسێکی تر (یان هەر گروپێک) کە ئەم ڕێوڕەسمەی بۆ بیروڕاکانی نەگرتۆتە بەر، باشتر و بەهێزترە.

ئەگەر ئێمە لەو کۆمەڵە ناجۆرەی مرۆڤ کە لە مشتێک دانا و ئاپورایەکی بێئەژماری نەزان دروستبووە (و بە زاراوە بە ناوی کۆمەڵگاوە ناوئەنرێت) داوا بکەین کە بۆ دڵنیابون لە ڕاستی بیروڕایەک کە ئەیانەوێت لە کۆمەڵگادا باڵادەست بکەن، لانیکەم هەمان شێواز بگرنە بەر کە داناترین گروپە مەسیحیەکان لەمجۆرە دۆخانەدا ئەیگرێتە بەر، ئەوا بێگومان چاوەڕوانیەکی زۆرمان لە نەیارەکانمان نەکردووە. لەنێوان گروپە عیسایەکاندا وەک ئەزانین کاسۆلیکەکان لە هەموویان نالێبوردەترن. بەڵام هەر ئەم گروپە نالێبوردەیە بەرلەوەی بەندەیەکی نزیک بۆ پێگەی پێغەمبەر بەرز بکاتەوە، ئەو ئەگەرە لەبەرچاو ئەگرێت کە ڕەنگە ئەرگومێنتێک دژی پێدانی ئەم پێگەیە هەبێت، بە سەبر و تەحەمولەوە گوێ لە «پارێزەری شەیتان» ئەگرێت. خودی ئەم ڕێوڕەسمە دەریئەخات کە تا ئەوکاتەی شەیتان هەموو قسەکانی دژی کەسی نزیک نەکات و ئەو قسانە نەخرێتە تەرازوی کارە خراپەکانی هەمان کەسەوە، تەنانەت پاکترین ڕۆحە مەسیحیەکانیش ناتوانن شانازیەکانی پاش مەرگ بەدەست بێنن[3]. ئەوەش دیارە کە ئەگەر فەلسەفەی نیوتن بێ چەندوچون قەبوڵبکرایە و ڕێگەیان بە کەس نەدایە کە ڕەخنەی ئاراستە بکات، ئەوا هەرگیز ڕەگەزی مرۆڤ نەیئەتوانی ڕاستی ئەو فەلسەفەیە بەو دڵنیایەوە کە ئەمڕۆ بەرامبەری هەیەتی، قەبوڵبکات. ئەو بیروڕایانەی ئەمڕۆ لەسەر پتەوترین بناغە دامەزراون، زەمانەتێکی زیاتر لەوەیان نیە کە هەمیشە ئامادەن خۆیان لەبەردەم ڕەخنەکاری و وردبونەوەی زانایاندا دانێن و داوا لە ناڕازی و نەیاران بکەن کە هەڵەی هەریەک لەو بیروڕایانە، (ئەگەر توانیان) بە بەڵگە و ئەرگومێنتەوە پیشانبدەن. ئەگەر ئەم داوایە قەبوڵنەکرا یان قەبوڵکرا بەڵام هەوڵی نەیاران بەهیچ نەگەیشت، ئەوا ئێمە هێشتا لە لوتکەی دڵنیایەوە زۆر دورین، بەڵام لانیکەم ئەزانین

٣- بۆ پێدانی ناونیشانی ساینت «saint» بە بەندەیەکی مەسیحی نزیک پاش مردن، ڕێوڕەسمێکی دوورودرێژ هەیە کە لە سیانزە یان چواردە قۆناغ پێکدێت. لە یەکێک لەم قۆناغانەدا (قۆناغی چوارهەم) پارێزەری شەیتان دیاری ئەکرێت و ئەرکی ئەوەیە هەموو ئەو ناڕەزایەتیانەی دژی ئەو بەندە نزیکە هەیە، بێ هیچ تێبینی و دەستپاراستنێک بهێنێتە پێشی و دادوەرەکان لە چەند و چونیان ئاگادار بکاتەوە. ئەم کەسە هەموو بەرهەمە چاپکراو و دەستنوسەکانی ئەو کەسەی پاڵێوراوە بۆ وەرگرتنی ناونیشان لەدوای مردنەوە بە وردی تاقیئەکاتەوە و ڕاپۆرتی خۆی بۆ کونگرەی کاردینالەکان پیشکەش ئەکات. کۆی ئەم ریورەسمە ناو ئەنێنCanonisation (و.ف)

هەموو ئەو شتانەی لەژێر ڕۆشنایی بارودۆخ و هەلومەرجی ئێستای لۆژیکی مرۆڤایەتیدا مومکین بووە، گرتومانن‌نەتە بەر و هیچ شتیکمان فەرامۆش نەکردووە کە ڕێگرە لە گەیشتنی ئێمە بەڕاستیی. ئێستا ئەگەر پەروەندەکانی وتێژ هەروا بەکراوەیی بمێنەوە، ئەکرێت هیوامان بەوە هەبێت کە فکری مرۆڤ کاتێک بۆ ڕاکێشان و قەبوڵکردنی ڕاستیە تازەکان ئامادە بێت، ئەوا بێگومان ئەیاندۆزێتەوە و ئەیانخاتە جێی بیروڕا کۆنەکان. لەم ناوەدا ڕەنگە خودی خۆشمان لەسەر ئەو دڵنیاییە کاربکەین کە لەسەردەمی خۆماندا تا ئەو جێگەیەی مومکینە، لە هەقیقەت نزیک بوینەتەوە. بەرزترین ئاستی دڵنیایی کە مرۆڤ ئەتوانێت –وەک بونەوەرێک کە ئەشێت هەڵە بکات– بەدەستی بێنێت. هەر ئەمەیە و ڕێگەی بەدەستهێنانیشی هەر ئەوەیە.
خاڵی سەرسووڕهێنەر ئەوەیە کە خەڵکی بەگشتی بایەخ و ڕاستی ئەو هۆیانەی کە بە قازانجی وتوێژی ئازاد ئەهێنرێتەوە قەبوڵ ئەکەن، بەڵام دژی ئەوەن دامێنی ئەم وتوێژانە تا «جەمسەری زیادەڕەوی» بکێشرێت. ئەوان لە تێگەیشتنی ئەو خاڵە هەستیارە غافڵن کە تا ئەوکاتەی ئەرگومێنتەکانی مرۆڤێک بۆ حاڵەتێکی زیادەڕەوی باش نەبێت، بۆ هیچ حاڵەتێک باش نیە. هەروەها سەیرە لەکاتێکدا خۆیان دان بەوەدا ئەنێن کە هیچ چارەیەک نیە بۆ نەهێشتنی گومان لەسەر ئەو بیروڕایانەی جێی گومانن، جگە لە ئەنجامدانی وتوێژی ئازاد لەبارەی ئەو بیروڕایانەوە، کەچی بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بە هیچ چەندوچونێک لەبارەی هەندێک بنەما و بیروڕای بونیادیەوە نادەن، چونکە بڕوایان وایە ئەو بنەما و بیروڕایانە بێئەندازە بەڵگەنەویستن. واتە بەڕاستیی «بەڵگەنەویستن» لەبەرئەوەی «خۆیان» لە بەڵگەنەویست بوونیان دڵنیان و ئەگینا بە بەڵگەنەویست دانانی بابەتێک کە نەیاری بێئەژماری هەیە (بەڵام ڕێگەی دەرخستنی نەیارێتی لە هەموویان گیراوە) مانای ژێرەوەی ئەوەیە کە ئێمە و ئەو کەسانەی هاوڕامانن، بوین بە دادوەری دیاریکردنی «بەڵگەنەویستەکان»، دادوەرانێک کە بە بێ سەرنجدان لە بەرگری پارێزەر و بێ ئەوەی ڕێگە بدەین گوێ لە ئەرگومێنتەکانی بگیرێت، حوکمی خۆمان دەرکردووە.
لە سەدەی هەنوکەدا کە خەڵکەکەیان «بە نەبوونی باوەڕ، بەڵام ترساو لە نەبوونی بیروباوەڕ» وەسفکردووە – لە سەدەیەکدا کە خەڵکەکەی دڵنیا نین لە ڕاستی ئەو بیروڕایانەی هەیانە، بەڵام نازانن بە بێ ئەو بیروڕایانە چی بکەن، لە سەدەیەکی وادا ئەو بەڵگانەی بەشێوەی ئاسایی بۆ پاراستنی بیروڕایەک لەبەرامبەر هێرشی گشتیدا ئەهێنرێنەوە، ئەوەندەی پابەندە بە دەرخستنی گرنگی ئەو بیروڕایە بۆ کۆمەڵگا، ئەوەندە پابەند نیە بە سەلماندنی ڕاستی بیروڕاکە. ئەوانەی ئەم بۆچونەیان هەیە ئەڵێن هەندێک لە بیروڕا و بنەما مەزهەبیەکان ئەگەرچی زۆر پێویستیش نەبن یان لە پێویستیە سەرەکیەکان نەبن، بەڵام لەبەرئەوەی بۆ خۆشبەختی مرۆڤ سودمەندن، ئەوا ئەرکی سەرشانی حکومەتەکانە وەک چۆن پاریزگاری لە سود و بەرژەوەندیەکانی تری کۆمەڵگا ئەکەن، ئەمجۆرە بیروڕایانەش بپارێزن. کاتێکیش پێی ئەم ناچاریە لە ئارادا بێت کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشێکە لە ئەرکەکانی حکومەت، ئەو هەستی بەرپرسیارتیەی کە حکومەتەکان ڕێگەپێدراو ئەکات (بەڵام ناچاریان ناکات)، کار لەسەر بیروڕایەک بکەن کە نەریت و بیروڕای دێرینی مرۆڤایەتی ئەیسەلمێنێت، هەرگیز بەمانای ئەوە نیە پارێزەرانی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا هەڵسەنگاندنی خۆیان بە قابیلی هەڵە نەزانن. هەروەها زۆرجار ئەرگومێنت ئەهێنرێتەوە و زۆرێکیش لە خەڵکی هەروا بیریان کردۆتەوە کە هیچکەس جگە لە خەڵکی بەد ئارەزوو ناکات ئەم بیروڕا تەندروست و سودبەخشانە لاواز بێت، مادام واشە



جۆن ستیوارت

هیچ زیانێکی تیا نیە کە ئێمە ئەم خەڵکە بەدە لە جێی خۆیان دانیشێنین و قەدەغەی ئەو شتانە بکەین کە تەنها ئەمجۆرە خەڵکە ئارەزووی هاتنە دی ئەکەن. ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە سیمای وتوێژەکە ئەگۆڕێت و پاساو بۆ ڕێگرتن لە وتوێژی ئازاد نەک لەسەر بناغەی «دروستی» ئەو ڕوانینانەی کە وتوێژەکە لە دەوریان ئەسوڕێتەوە، بەڵکو لەسەر بناغەی «سودمەندی» ئەهێنێتەوە. ئەو کەسانەی ئەم ئەرگومێنتە ئەهێننەوە دڵیان بەوە خۆشە کە بەرپرسیاری ئەو تۆمەتەیان لە خۆیان دوورخستۆتەوە کە بونەتە دادوەری بیروڕای ئەوانی تر و خۆیان لە هەڵە بە دوور ئەزانن، بەڵام لەوە ئەچێت ئەمانە ئەوە نەبینن کە لەژێر تیشکی ئەم ئەرگۆمێنتەدا تۆمەتی «قابیلی هەڵەنەکردن» تەنها جێگەی خۆی گۆڕیوە و چرای وتوێژ لەم خانەیەوە بۆ ئەوی تر براوە، چونکە «سودمەندی» بیروڕایەک، خۆی بیروڕایەکە و بەهەمان ئەندازەی بیروڕاکە خۆی جێگەی وتوێژە. لە ڕووی بنەماییەوە سەلماندنی ئەوەی فلان بیروڕا بۆ کۆمەڵگا زیانبەخشە، هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ سەلماندنی هەڵەی ئەو بیروڕایەدا و لە هەردوو حاڵەتەکەدا مادام ڕێگە بە بیروڕای قەدەغەکراو نەدرێت کە بەرگری لە خۆی بکات، هەرجۆرە بڕیارێکی نەگونجاو لەبارەیەوە بگیرێت، بێهودەیە و ناکۆکە بە بنەماکانی ئازادی. ڕاستیی هەر بیروڕایەک بەشێکە لە سودمەندی ئەو بیروڕایە و ئەگەر کەسێک بەڕاستیی ویستبێتی بزانێت کە ئایا باوەڕکردن بە بیروڕایەک باشە یان نا، چۆن ئەکرێت باسکردنی ڕاستیی یان هەڵەی ئەو بیروڕایە بکرێتە دەرەوە؟

باشترین پیاوانی جیهان بە ئێمە ئەڵێن هەر بیروڕایەک پێچەوانەی هەقیقەت بێت، بەڕاستیی ناتوانێت سودمەند بێت. لە بەرامبەر ئەم قسەیەدا ئایا ئەکرێت ڕێگە لە شکاتکردن لەو کەسانە بگیرێت کاتێک سەرزەنشت باران ئەکرێن کە بۆچی فلان بیرکردنەوەیان بە درۆ داناوە کە لە ڕوانگەی کەسانێکەوە سودمەند بووە؟ ئاخر چۆن ئەکرێت چاوەڕوانی ئەوە لەمانە بکرێت کە بیرکردنەوە یان بیروڕایەک کە خۆیان بە هەڵەی ئەزانن، بە سودمەند بژمێرن؟ کەسانێک کە بیروڕای باویان قەبوڵکردووە، هەرگیز لەوە غافڵ نین کە لە شکاتی داواکاران زۆرترین سود بە قازانجی خۆیان وەربگرن. کاتێک ڕووبەڕووی ئەم گروپە ئەبیتەوە ئەبینیت کە مەسەلەی «سودمەندی» بەشێوەیەکی تەواو جیاواز لە مەسەلەی «هەقیقەت» دانانێن. بەپێچەوانەوە لەسەر ئەو ئەرگۆمێنتە ئەڕۆنە پێشێ کە لەبەرئەوەی دیدی «ئەوان» خودی هەقیقەتە، ئەوا زانین یان بڕوابوون پێی ئەوەندە پێویستە. بەڵام کاتێک ئەرگۆمێنتێکی وا تەنها یەک لایەنی مەسەلەکە بەکاری بهێنێت و لایەنەکی تر مافی بەکارهێنانی نەبێت، چۆن ئەکرێت بە ویژدانەوە تاوتوێی مەسەلەی سودمەندی بکەین؟ ئەگەر ڕاستیی مەسەلەکەمان بوێت، کاتێک یاسا یان هەستی گشتی ڕێگە نادات چەندوچون لەسەر ڕاستیی بیروڕایەک بکرێت، هەمان ئەو یاسا و هەستە ڕێگە بەوەش نادەن کە کەس سودمەندی ئەم بیروڕایە بە درۆ بخاتەوە. ئەوپەڕی ڕێگەدان کە ئەشێت لەم دۆخەدا بە نەیاران بدرێت، ئەوەیە کە گومان لەبارەی پێویستی ڕەهای ئەو بیروڕایەوە بکەن یان ئەوەی توشی تاوانی ڕەدکردنەوەی ئەو بیروڕایە بن.

بۆ ئەوەی زیانی ئەم مەسەلەیە واتە ڕێگرتن لە بڵاوبونەوە و دەربڕینی بیروڕا (تەنها لەبەرئەوەی ئێمە بە هەڵسەنگاندنی خۆمان بە هەڵەمان زانییوە) بەشێوەیەکی بەرجەستەتر دەرکەوێت، وا باشە کە باسکردن لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە سنوردار بکەین بە مەسەلەیەکی تایبەت و واقعی. من وای بە باش ئەزانم کە بۆ ئەم مەسەلەیە حاڵەتێکی تایبەت کە ئەوەندەش لە قازانجی من نیە هەڵبژێرم. کەوابوو ڕێگە بدەن وای

دابنێن ئەو بیروڕایەی ئەمانەوێت ڕەدی بکەینەوە بەشێک بێت لە بنەما سەرەکیەکانی دین (وەک بڕوابوون بە خودا، بڕوابوون بەو دنیا) یان یەکێک لەو بنەما ئەخلاقیانە بێت کە لەلایەن هەموانەوە قەبوڵکراوە. لەسەر ئەم جۆرە بابەتانە جەنگکردن لەگەڵ نەیاراندا هەر لە سەرەتاوە ئیمتیازێکی گەورە بە حەریفێکی بێویژدان ئەدات. چونکە بێگومان ئەڵێت (زۆرێکیش کە بەگشتی بێ ویژدان نین، لەناوەڕۆکدا هەمان قسەی ئەو دوبارە ئەکەنەوە): «واتە ئەو بیروڕایانەی کە بە پێی پێویست لە ڕاستیبونی دڵنیان و ئەتانەوێت لەژێر پەردەی یاسادا بپارێزرێت هەر ئەمانەن؟ نکوڵیکردن لە خودا و ئەو دنیا؟ ئایا بڕوابوون بە خودا و دڵنیابوون لە باوەڕ، ماناکەی لای ئێوە ئەوەیە کە باوەڕدارانی خوداناس و ئەوانەی لە دۆزەخ و بەهەشت ئەترسن، خۆیان لەسەرو هەڵەکردنەوە ئەبینن؟» ئەمجۆرە وەڵامدانەوانە بەئاشکرا ئەوە ئەگەیەنێت کە مەبەستی باسەکەی من بە باشی دەرک نەکراوە یان نەیاران ئەیانەوێت خراپ تەفسیری بکەن.

کاتێک ئەڵێین خاوەنانی فلان بیروڕا خۆیان بە دوور لە هەڵە ئەبینن، مەبەستم دڵنیابونیان نیە لە ڕاستی ئەو بڕوایەی کە قەبوڵیان کردووە (ئێستا ئەو بڕوایە هەرچیەک بێت) بەڵکو ئەوەیە کە مافی ئەوە بە خۆیان ئەدەن بڕیاری سەپاندنی بەسەر خەڵکانی دیدا بدەن، بێ ئەوەی ڕێگە بەو خەڵکە بدەن گوێیان لەو ئەرگۆمێنەتانە بێت کە دژی بەو بیروڕایانە ئەهێنرێتەوە. منیش ئەمجۆرە کارە چەند بە قازانجی پیرۆزترین بیروڕاکانی خۆشم بێت، هەر بەهەمان توندی بەهەڵە ئەزانم.

هەرچەند تاکێکی دەسەڵاتداریان بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ قەناعەت پێکردبێت کە نەک هەر بیروڕایەک هەڵەیە، بەڵکو دەرئەنجامەکانیشی زۆر وێرانکارانە و زیانبەخشە، و تەنانەت لەمەش زیاتر ڕۆیشتبن و بەڕاست بڕوایان پێهێنابێت کە ئەو بیروڕایە «دژی ئەخلاقە» و بۆنی یاخیبون و بێ خودایی لێدێت، کەسێکی لەمچەشنە تەنانەت گریمان لەلایەن ڕای گشتیشەوە پشتگیری بکرێت، مافی ئەوەی نیە لەسەر بنەمای بڕیار و هەڵسەنگاندنی خۆی، بەرگریکردن لەبیروڕایەک قەدەغە بکات و ئەگەر توشی ئەم بێویژدانیە بوو، تۆمەتی «هەڵەنەکردنی» خۆی بە کردەوە پیشانداوە، و منیش دژی ئەم کارەم، نەک هەر سەبارەت بەم حاڵەتە تایبەتیە، بەڵکو لەهەموو حاڵەتەکاندا. چونکە ئەزمونی مێژوویی پیشانیداوە کە سەرجەم ئەو هەڵانەی پیاوانی دەسەڵاتدارانی یەک نەوە ئەیکەن و سەرسووڕمان و ترسی نەوەکانی ئایندە ئەوروژێنێت، ڕێک لەم ساتەوەختانەدا ڕوودەدەن. بەسەرهاتی ژیانی مرۆڤ پڕە لەم یادەوەریە تاڵانە، و زۆر لەو حاڵەتانە پیشان ئەدات کە قامچی یاسایان بەکارهێناوە بۆئەوەی باشترین پیاوەکان و شەریفترین بنەما و بیروڕای سەردەمێک لە ڕەگەوە هەڵکێشن. سەرکەوتنی ئەمجۆرە کارانە (تا ئەو جێگەیەی پەیوەندی بە چارەنووسی ئەوجۆرە پیاوانەوە هەیە) هەمیشە جێی ئەسەف بووە. گەرچی بەشیک لەو بنەما و ڕوانینانە هەروا بەجێماون بۆ ئەوەی ئەمرۆ (وەک ئەوەی خەیاڵێکی گاڵتەپێکردن لەئارادا بووبێت) بۆ بەرگریکردن لەڕەفتارە هاوشێوەکانی ئەو کەسانەی بە هەمان بنەما و ڕوانین یان لە تەفسیری قەبوڵکراوی ئەوان یاخی ئەبن، سودی لێوەربگیرێت.

گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە خەمناکە هەرگیز بێ سود نیە کە سەردەمێک پیاوێک هەبوو بەناوی سوقراتەوە کە لەنێوان ئەو و بەرپرسیارە یاساییەکانی وڵاتدا کە لەلایەن ڕای گشتیەوە پشتگیری ئەکران، پێکدادانێک ڕویدا کە فەرامۆش ناکرێت. ئەم پیاوە لە وڵاتێکدا ژیا و لەسەدەیەکدا لەدایک بوو کە هەردووکیان شکۆیەکی تایبەتیان هەبوو و ژمارەیەک لە خاوەن بیران کە سوقرات و سەدەی سوقراتیان لەهەموو کەس باشتر



جۆن ستیوارت

ئەناسی، هەموویان وەک کەسێک ناساندیان کە خاوەن باشترین فەزیلەتەکانی مرۆڤە. ئێمەش وەک مامۆستا و فێرکارێکی مەزنی ئەو سەردەمە ئەیناسین کە پەروەردەکەری باشترین فێرکارانی مرۆڤ و سەرچاوەی ئیلهامە گەورەکانی ئەفلاتۆن و ئەرستۆ بووە، کە ئەم دوو فەیلەسوفەی دوایی بە سەرچاوەی پرشنگداری هەموو جۆرە فەلسەفەیەک ئەژمێرێن کە لە کۆنەوە بە ئێمە گەیشتووە. ئەم پیاوە مەزنە، ئەم فەیلەسوفە کە مامۆستا و ئیلهامدەری بیروڕا فەلسەفیەکان بووە لە سەردەمی خۆیەوە تا هەنوکە، و ناوبانگی پاش دوو هەزار و چەندێک ساڵ ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ئەبێت، لە سەردەمێکدا کە بە لوتکەی کامڵبونی فکری خۆی گەیشتبوو، ڕووبەڕووی بڕوای فەرمی وڵاتەکەی بووبۆوە کە پشتیوانی زۆر بەهێزی هەبوو. هاوڵاتیەکانی پاش دادگایکردن سوقراتیان بە تاوانی خاوەندارێتی بیروڕای ناکۆک بە ئەخلاق و نەبوونی بڕوابوون بە خودا مەحکومکرد و بە مەرگیان سپارد. وتیان خوانەناسە چونکە ئامادە نەبوو ئەو خوایانە بە فەرمی بناسێت کە ئەنجومەنی فەرمانڕەوای ئەوکاتە قەبوڵیان کردبوو. ئەوانەی دادگاییان کرد بەڕاستی پیشانیاندا (بگەڕێنەوە بۆ نامەی بەرگری سوقرات) کە ئەو بڕوای بە هیچ خوایەک نیە. بەڵام بە خاوەنی بیروڕای ناکۆک بە ئەخلاقیان دانا لەبەرئەوەی «بە تێز و بیروڕاکانی لاوەکان گەندەڵ ئەکات». ئەو دادگایەی سوقراتی دادگایی کرد هەر دوو ئەم تۆمەتەی ڕووبەڕوو کردەوە، و ئێمە بچوکترین بەڵگەمان لەبەردەستدا نیە کە بیسەلمێنێت دادوەرانی ئەو دادگایە مەبەستیان بوو یان بە ئەنقەست ویستویانە سوقرات بکوژن. ئەوان لە ڕووی بڕوا و بیروڕای پەتی خۆیانەوە (کە ئەمڕۆ ئەزانین سەرتاپا هەڵە بووە) سوقراتیان بە تاوانبار دانا و بەم دیاریکردنەش ژەهری مەرگیان بە پیاوێک نۆشی کە نەک هەر شایستەی مەرگ نەبوو، بەڵکو لە هەموو کەسە عاقڵەکانی تر زیاتر کە لەو سەدەیەدا ئەژیان، شایستەی وەرگرتنی تاجی شانازی بوو.

هەنوکە با واز لەم ڕوداوە بهێنین و باسی نمونەیەکی گرنگی تر بکەین کە دیسان هەڵەی دادوەرانی سەردەم پیشان ئەدات. ئەم ڕوداوە گەرچی دوای ڕوداوی تاوانبارکردنی سوقرات ڕوویدا، بەڵام باسکردنی ئەسەفێکی کەمتر دروست ناکات. مەبەستم ئەو ڕوداوەیە کە نزیک هەزار و هەشت سەد ساڵ لەمەوپێش لە «کالڤەری»[٤] ڕوویدا. لەوێ پیاوێکیان لە خاچدا کە مەزنێتی ئەخلاقی کارێگەریەکی ئەوەندە سەقامگیری لە یادەوەری ئەو کەسانەدا بەجێهێشتووە کە شایەتی ژیان و قسەکانی بوون، کە هەنوکە هەژدە سەدەیە جیهانی مەسیحیەت وەک «خوایەکی باڵا» قەبوڵیانکردووە و سەر لەبەردەم کەسایەتیدا دائەنوێنن. گوناهەکەی چی بوو؟ سوکایەتی بە پێگەی خوداوەندێتی! خەڵک لەو مێژووەدا نەک هەر خێرخوازەکەی (واتە مەسیح) خۆیان نەناسی، بەڵکو ئەویان ڕێک بە پێچەوانەی ئەوەی کە وتبووی وەرگرت، وەک کافرێکی کاریگەر ڕەفتاریان لەگەڵ کرد، لەکاتێکدا ئەمڕۆ خودی ئەو کەسانەی ئەو تۆمەتانەیان خستە پاڵ، بە کافر دائەنرێن. شێوەی هەستی مرۆڤایەتی لەبەرامبەر ئەم دوو کارەدا، بەتایبەتی لەبەردەم کارەساتی دووهەمدا، بۆتە هۆی ئەوەی باوەڕدارە بێئاگاکان. هەڵسەنگاندنێکی نادادپەروەرانە لەبارەی ئەو کەسانەوە بکەن کە دادوەری ئەو دادگایە بوون و حوکمی لە سێدارەدانی مەسیحیان دەرکرد. بەڵام پێئەچێت ئەم دادوەرە بەدبەختانە خەڵکی خراپ نەبووبن یان لانیکەم خراپتر نەبووبن لە خەڵکی ئاسایی تری دنیا. تەنانەت ئەکرێت بگوترێت کە لە زۆربەی

٤-) Calvary ناوی گردێکی نزیک ئۆرشەلیمە کە لەسەردەمی کۆندا جێگەی لە سێدارەدانی گشتی یەهودیەکان بوو بە پێی یاساکانی گەلی یەهود. لەم جێگەیەدا بوو کە عیسایان لە خاچدا.

خەڵکانی دوایی باشتر بوون. پیاوانێک بوون کە خاوەن هەستی مەزهەبی ئەخلاقی و نیشتیمان پەروەری سەردەمی خۆیان بوون و ڕێک نمونەی کەسانێک بوون کە لە هەموو سەردەمەکانی مرۆڤایەتیدا، لەوانە سەردەمی خۆمان، هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخسا کە تەمەنێک بە حورمەت و ناوی باشەوە بەسەر بەرن.

قەشەی گەورەی ئۆرشەلیم کە لە کاتی بیستنی وشەکانی مەسیحدا یەخەی خۆی دادڕی -چونکە گوێی لەو قسانە بوو کە بە بەراورد بە بیروڕای باوی وڵاتەکەی بە ڕەشترین تاوانەکان ئەژمێرا- هیچ مەبەستی نمایشکردن نەبوو و وە لەم حاڵەتی ترس و تورەییەدا کە لە بیستنی ئەو قسانە توشی بوو، ڕەنگە زۆر پاک و بێ ڕیا بووبێت، وەک زۆرینەی خەڵکی شەریف و پاکی ئەمڕۆ هەمان هەستیان بەرامبەر ئایین و ئەو یاسا ئەخلاقیانە هەیە کە قەبوڵیان کردووە. زۆریک لە مەسیحیەکان کە ئەمڕۆ کاتێک بیر لە ڕەفتاری ئەو قەشەیە ئەکەنەوە پشتیان ئەلەرزێ، ئەگەر خۆیان لەو سەردەمەدا بژیانایە و وەک یەهودی بهاتنایە دنیاوە، بێگومان بەهەمان ئەوشێوەیە ڕەفتاریان ئەکرد کە ئەو قەشە بەدبەختە کردی. ئەو ژمارە مەسیحیە ئەرسۆزکسەی کە فکریان تووشی ئەو وەسوەسەیە بووە کە بەردبارانکەرانی شەهیدەکانی سەرەتای مەسیحیەت، بێگومان خەڵکانی بودەڵە بوون، وا باشە ئەوە بە بیر بهێنینەوە کە خودی ئەو حواریە مەزنە -واتە سن پۆڵ-یش لەسەرەتادا هاوبیر و هاوکاری ئەو دەمارگیرانە بوو کە مەسیحیەکانیان ئازار ئەدا، و هەوڵیئەدا ئەم مەزهەبە تازەیە لە ڕەگەوە هەڵکێشێت.

هەنوکە ڕێگەم بدەن نمونەیەکی تر لێرەدا بهێنمەوە کە لە هەموو هەڵە مێژووییەکانی تر بەرجەستەترە، بەتایبەتی کاتێک کاریگەری قووڵی ئەو هەڵەیە بەراورد ئەکەین بە عەقڵ و فەزیلەتی ئەو پیاوەی کە هەڵەکەی کردووە. ئەگەر بڕیار بێت لەنێوان پیاوانی بەدەسەڵاتی سەردەمی دێرینددا پیاوێک هەڵبژێرین کە لە هەموویان باشتر و ڕۆشنبیرترە، ئەوا ئەو کەسە جگە لە مارکۆس ئۆرۆلیوسی ئیمپراتۆری ڕۆمی کۆن کەسی تر نیە.

مارکۆس کە فەرمانڕەوای ڕەهای دنیای شارستانی ئەو سەردەمە بوو، لە ژیانیدا نەک هەر دادپەروەرانە و بە ویژدانەوە کە جێگەی بچوکترین ڕەخنە نیە حکومەتی کرد، بەڵکو دروستکەری سیفەتی وا بوو کە بە تێبینیکردنی ئەو پەروەردە وشکە ڕواقیەی لە منداڵیەوە وەریگرتبوو، کەمتر چاوەڕوانی ئەو سیفەتانە لە کەسانی وەک ئەو ئەکرێت. مارکۆس ئۆرۆلیوس یەکێک لە نەرمترین و هەستیارترین دڵەکانی هەبوو، و ئەو یەک دوو کەموکوڕیەی ئەیانگەڕانەوە بۆ ئەو، هەر پەیوەندی بەم سەبر و هەستیاریەوە هەبوو. بەڵام نووسینەکانی کە ناوەڕۆکی بەرزترین بیروڕا ئەخلاقیەکانی سەردەمی دێرینە، بە دەگمەن لەگەڵ ئەو تێزانەدا جیاوازە کە تایبەتە بە ئاینی مەسیحی، ئەویش بە گریمانەی ئەوەی کە لەبنەڕەتدا جیاوازیەکی هەبێت. ئەم پیاوە کە لە ڕووی بیروڕا ئەخلاقیەکانەوە لەهەر پاشایەکی مەسیحی زیاتر کە لەسەردەمی ئەوەوە تا هەنوکە فەرمانڕەوای کردووە، مەسیحی تر بوو- جگە لەوەی کە نەبوو بوو بە مەسیحی، بڵاوبونەوەی بیروڕاکانی مەسیحیەتی قەدەغەکرد و لایەنگرانی ئەم دینەی سزادا. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر لوتکەی سەرجەم ئەو گەنجینانە ڕاوەستابوو کە تا ئەو ڕۆژە بەردەستی مرۆڤ کەوتووە، و فکری کراوە و ڕوون و ئازاد بوو، هەروەها خەسڵەتێکی سەغی و مرۆڤپەروەری هەبوو کە بووە هۆی ئەوەی هەمان ئەو ئامانجە مەزنانەی مەسیحیەت لە نووسینەکانیدا بهێنیتەوە، بەڵام بەدبەختانە بوونی ئەم هەموو خەسڵەتە باشانە، ڕێگەی بۆ



جۆن ستیوارت

خۆشنەکرد لەوە تێبگات دینی مەسیحیەت بۆ ڕێکخستنی ئەو دنیایەی کە ئەو لێی بەرپرسیار بوو، نەک هەر زیانی نیە، بەڵکو بە قازانج و چاکەی هەمان ئەو دنیایەیە.
مارکۆس ئەوەی دەستنیشان کردبوو کە کۆمەڵگای ژێر فەرمانڕەوای خۆی لە دۆخێکی ئەسەفباردایە، بەڵام لەگەڵ ئەم وەسفەدا لەڕووی باوەڕ یان بەهۆی سیاسیەوە، تەسلیمی ئەو بڕوایە بوو کە ئەوەی ئەم کۆمەڵگایەی پێکەوە گرێداوە، باوەڕ و ڕێزگرتنە لەو پیرۆزیانەی خەڵک قەبوڵی کردون و ڕێگە نادات کە دۆخەکە لەوەی کە هەیە خراپتر بێت. مارکۆس ئۆرۆلیوس وەک یەکێک لە فەرمانڕەوایانی ڕەگەزی مرۆڤ خۆی بە بەرپرسیار ئەزانی کە نەهێڵێت چوارچێوەی کۆمەڵگا تێکبچێت. ئێستا ئەگەر ڕێگە بدرێت ئەو زنجیرانەی کۆمەڵگای پێکەوە گرێداوە بپچڕێت، ئیتر چۆن ئەشێت بەشە دابڕاوەکانی جارێکی تر پێکەوە گرێ بدرێت. مەزهەبی تازە بە ئاشکرا ئەیویست ئەم زنجیرانە بپچڕێنێت و ئەرکی ئیمپراتۆریش لەم دۆخەدا هیچ نەبوو جگە لەوەی یان خۆی ئەو مەزهەبە هەڵبژێرێت یان ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئەم مەزهەبە تازەیە قەدەغە بکات. لەبەرئەوەی فەلسەفەی ئیلاهی مەسیحیەت بە بڕوای ئەم فەرمانڕەوا حەکیمە بەڕاست یان بەوە نەئەزانرا کە لە بنەمایەکی ئاسمانیەوە هاتبێت، و عەقڵیشی باوەڕی بە چیرۆکی خودایەک نەئەکرد کە لە خاچ دراوە، و نەیئەتوانی پێشبینی ئەوە بکات کە هەر ئەم سیستەمە مەزهەبیە کە بناغەکەی لەسەر ئەفسانەیەکی باوەڕپێنەکراو دامەزرابوو، ڕەنگە دواجار وەک هۆکاری تازەبوونەوە بەکار بهێنرێت کە زۆر پێویستی سەردەمەکەی بوو. هوشیارانە یان ناهوشیارانە فەرمانیدا دینی مەسیحیەت خامۆش بکەن و پەیڕەوەکانی سزا بدەن. ئەو هەڵەیەی ئەم فەیلەسوفە تاجدارە ئەنجامیدا، بە بڕوای من یەکێکە لە خەمناکترین ڕوداوەکانی مێژوو، مرۆڤ لە وێنای ئەم بابەتە بەڕاستی بەداخە کە ئەگەر مەزهەبی مەسیحیەت لەبری ئەوەی قوستەنتین قەبوڵیبکات و بڵاوی بکاتەوە، مارکۆس ئۆرۆلیوس قەبوڵی بکردایە و بیکردایە بە مەزهەبی فەرمی ئیمپراتۆرەکەی، ئەوا تێز و نەریتەکانی ئەم مەزهەبە تاچەند لەگەڵ دۆخی جێی ئەسەفی ئێستایدا جیاواز ئەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی هەقیقەت نەشێوێت و مەرجی ویژدان لە بەرامبەر ئەم پیاوەدا ڕەچاو بکرێت، وتنی ئەو ڕاسیتە پێویستە کە خەڵکی ئەو سەردەمە بەهەمان توندی داوایان لە ئیمپڕاتۆری خۆیان ئەکرد ڕێکخستنەکانی مەسیحیەت تێکبشکێنیت و مەسیحیەکان سزا بدات کە هەنوکە مەسیحیەکان هەمان شت بەرامبەر ئەوانە ئەکەن بۆ ئەوەی ڕێگری لە بڵاوبونەوەی تێزەکانی دژ بە مەسیحیەت بکەن.
باوەڕی هیچ بەندەیەکی مەسیحی بەوەی کە بێ خودایی هەڵەیە و ئامانجی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگایە، لەو بڕوایە بەهێزتر نەبوو کە خودی مارکۆس ئۆرۆلیوس لەبارەی هەڵەی دینی مەسیحیەوە هەیبوو، ئەویش ئامانجی دینی مەسیحی بە هەڵوەشاندنی زنجیرەکانی مانەوەی کۆمەڵگا ئەزانی. مارکۆس کە لەناو هەموو خەڵکانی دەسەڵاتداری سەردەمی خۆیدا زیاد لە هەموویان مومکین بوو ئاینی مەسیحیەت قەبوڵبکات، بەو ئەندازەیە لەڕووی هەڵەوە دژی ئەم دینە کاری کرد. کاری ئەم ئیمپراتۆرە و ئەو دەرئەنجامە خەمناکەی لێی کەوتەوە، ئاوێنەی پەندێکە بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە و ئەیانەوێت بە دوای جێ پێی مارکۆس ئۆرۆلیوسدا بڕۆن. گەرچی زەحمەتە وێنای ئەوە بکەین لە سەردەمی هاوچەرخدا یان تەنانەت لە سەردەمەکانی داهاتوودا کەسێک هەبێت لێزانی لەڕووی عەقڵ، زانین و ئاشنابوون بە ڕەمزەکانی حیکمەت و فەلسەفە بگات بەئاستی ئەم حوکمڕانە حەکیمە، بەڵام بەهەرحاڵ گەر کەسێکی واش پەیدا بێت، لێگەڕێ

لە هەڵەی ئانتۆنیۆسی مەزنەوە پەند وەربگرێت و ئەو بیرۆکە بێهودەیە بخاتە لاوە کە فەرمانڕەوا و خەڵکی ئاسایی لە هەڵەکردن دوورن.

دوژمنانی ئازادی مەزهەب لەو ڕووەوە کە ئەزانن شێوازی بەکارهێنانی سزادان بۆ ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی بیروڕای مەزهەبی شایەنی بەرگریکردن نیە – چونکە لەم حاڵەتدا ناکرێت لە هەمانکاتدا کاری ئەولیای مەسیحی بسەلمێنرێت و کاری مارکۆس ئۆرۆلیوس ئەفەرۆزە بکرێت– هەر کاتێک فشاریان لێبکرێت لەگەڵ دوکتۆر جۆنسۆندا هاودەنگ ئەبن و ئەڵێن:

«ئەوانەی مەسیحیەکانیان سزا دا ڕاستیان کرد. سزادانی بیروڕایەک قۆناغێکی ناچاریە کە کاروانی هەقیقەت بە ویست یان ناویست ئەبێت پیایدا بڕوات و هەمیشەش بەو پەڕی سەرکەوتنەوە پیاییدا ئەڕوات. سزا یاساییەکان لەبەرامبەر هەقیقەتدا، بێ توانان و دواجار پەکیان ئەکەوێت، بەڵام سودی گەورەیان ئەوەیە کە هەندێکجار بە سەرکەوتویی ڕێگە لە هەڵەی زیانبەخش ئەگرن».

ئەمجۆرە ئەرگومێنتە کە بۆ پاساوهێنانەوە بۆ کاری کەسانی دەمارگیر لە کوشتنی بیروڕای مەزهەبی کەسانی تردا بەکار ئەهێنرێت، بەرادەیەک گرنگە کە ناتوانرێت بێ وەڵام بەجێ بهێڵرێت. ئەو بیرۆکەیەی ئەڵێت سەرکوتکردنی بیروڕا دادپەروەرانەیە (چونکە مەحاڵە ئەم سزادانە ڕێگە لە سەرکەوتنی کۆتایی ئەم هەقیقەتە بگرێت) ناکرێت تاوانبار بکرێت کە دوژمنی ڕاستیە تازەکانە. بەڵام ئەو شتەی هەیە ئەوەیە ناتوانین ڕێز لە کەرامەتی ناباوی ئەو کەسانە بگرین، کە بەمشێوەیە بیر ئەکەنەوە و دۆزەرەوەی ئەو ڕاستیانە دووچاری ئەو چارەنوسانە ئەکەن کە ناومان هێنان. شتێک کە بێئەندازە کاریگەریی لەسەر ژیانی خەڵکی جیهان دائەنێت، بریتیە لە دۆزینەوە و دەرخستنی ئەوەی کە ڕوانینیان بۆ بابەتێک کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی دنیایی و ئەو دنیاوە هەیە هەڵە بووە. ئەمانە خزمەتی بچوک نین کە تاک بۆ هاوڕەگەزەکانی خۆی ئەنجامی بدات، و تەنانەت لە هەندێک حاڵەتدا بە بڕوای ئەوانەی کە وەک دکتۆر جۆنسۆن بیر ئەکەنەوە، گرانبەهاترین دیاریە کە دۆزەرەوەیەکی بلیمەت ئەتوانێت بە هاوڕەگەزەکانی ببەخشێت. بەڵام بەپێی بیرکردنەوەی سەرەوە شەهیدکردنی کەسانێک کە ئەمجۆرە بەرژەوەندیە مەزنە بۆ مرۆڤایەتی بەدەست دێنن، و ڕەفتار کردن لەگەڵیاندا وەک ترسناکترین تاوانباران، بەدبەختی یان هەڵەیەکی جێی داخ نیە کە کومەڵگای مرۆڤایەتی پرسەدار بکات، بەڵکو دۆخی ئاسایی سەردەمەکەیە! لەسەر بنەمای ئەم بیرکردنەوەیە دۆزەرەوە یان ڕاگەیاندکاری هەقیقەتێکی تازە، ڕێک وەک پێشنیارکەری یاسایەکی تازە لە ئەنجومەنی یاسادانانی (لۆکرین)ەکان°، ئەبێت بە پەتێکەوە کە بە توندی لە گەردنی بەستراوە بوەستێت، بۆ ئەوەی گەر ئەنجومەنی گشتی خەڵک پاش گوێگرتن لە ئەرگومێنتەکانی، لەهەمان سات و هەمان جێدا، پیشنیارەکەی قەبوڵنەکرد، لە سێدارەی بدات. خەڵکێک کە بەرگری لەمجۆرە ڕەفتارە دڕندانە بەرامبەر بە خزمەتکارانی مرۆڤایەتی ئەکەن، مومکین نیە کە بەهایەکی زۆر بۆ ئەو خزمەتانە دابنێن و بڕوای خۆشم وایە کە ئەم بیرکردنەوانە تایبەتە بەو کەسانەی وا بیر ئەکەنەوە ڕاستیە تازەکان سەردەمێک خوازراو بوون، بەڵام هەنوکە بەپێی پێویست ئەو ڕاستیانەمان هەیە.

بەڵام بەدەر لەمانەش ئەو بیرۆکەیەی کە وەک بنەمایەکی پۆزەتیڤ سەلمێنراوە و پێمان ئەڵیت کە هەقیقەت

°- Locri ناوی بەشێکی یۆنانی دێرینە کە دانیشتوانی بە کۆنترین خەڵکی یۆنان ئەژمێرێن.



جۆن ستیوارت

هەمیشە لە وتوێژ و ناکۆکی بە سەرکەوتووی دێتە دەرێ، یەکێکە لەو ئەفسانە دڵپەسەندانەی کە خەڵکی دنیا یەک لە دوای یەک ئەوەندە دوبارەی ئەکەنەوە کە دواجار بووە بە قسەیەکی ڕوون و بێکەڵک، لەکاتێکدا ئەزمونەکانی مرۆڤ بەتەواوی پێچەوانەی ئەم بیرۆکەیە ئەسەلمێنێت. مێژووی جیهان پڕە لەو حاڵاتانەی کە تیایدا هەقیقەتیان بە فشار و سزادان خامۆش کردووە. لەم دۆخانەدا ئەگەر هەقیقەت بۆ هەمیشەش نەخنکابێت، ئەوا ڕەنگە چەندان سەدە دوا کەوتبێت. تەنها نمونە بۆ بیروڕا مەزهەبیەکان ئەهێنمەوە: بزوتنەوەی ڕیفۆرمی دینی لانیکەم بیستجار پێش لۆسەر سەریهەڵدا و هەموو جارێک خنکاندیان. «ئارنۆڵدی برشیا»[٦]یان لە سێدارەدا. «فرادۆلچینۆ»[٧] یان لەناوبرد. «ساوناروڵا»[٨]یان ئەشکەنجەکرد و لەسێدارەیاندا. «ئالبی ژنس»ەکانیان خامۆش کرد و لەناویان بردن. «ڤاڵدۆیس»[٩]ەکانیان خامۆش کرد. «لۆلارد»[١٠]ەکانیان بێدەنگ کرد. «هوسیت»[١١]ەکانیان خامۆشکرد و تەنانەت پاش سەردەمی لۆسەریش لە کوێ بە توندی سزای بیروڕایاندا، کاریگەری و ئەنجامی هەبوو. لە ئیسپانیا، ئیتاڵیا، لە فیلاندا، لە ئیمپراتۆری نەمسا، بزوتنەوە ناڕازیەکانیان لە ڕەگەوە هەڵکێشا و لە ئینگلتەراش ئەگەر ماشا (مەلیکە) ماری زیندوو بوایە یان ئەگەر ماشا ئەلیزابیت مردبوایە، ڕەنگە چارەنوسیان وەک چارەنوسی شوێنەکانی تر بوایە. سزادانی بیروڕا هەمیشە سەرکەوتوو بووە، مەگەر لەو جێگە و وڵاتانەی کە ژمارەی یاخیبوان زۆرتر بووە لەوەی بتوانرێت بە شێوەیەکی کاریگەر سزا بدرێن. هیچ مرۆڤێکی بە ویژدان ناتوانێت گومان لەو خاڵە بکات کە تەنانەت ئەکرا مەسیحیەتیش بەتەواوی لە پەڕەکانی (مێژووی) ڕۆمای کۆن بسڕێتەوە. مەزهەبی مەسیحیەت لەبەر ئەوە بڵاوبۆوە و دواجار سەرکەوت، چونکە سزادانی مەسیحەیەکان بەشێوەیکی هەمیشەیی و بەردەوام ڕوینەدا، بەڵکو هەرجارێک کە سزایان ئەدرا، قۆناغی سزادانیان کورت و لە دوای ئەوەوە قوناغێکی ئاسایشی بەردەوام دەستی پێئەکرد کە تیایدا بە گشتی کەس دژی پڕوپاگەندەکانیان نە ئەوەستا. بەڵام خودی

٦) Arnold of Brescia (١١٠٠-١١٥٥)چاکسازێکی دینی ئیتاڵی کە لە برشیا ئەژیا و داوای لابردنی هەندێک نەریتی دینی ئەکرد و دژی ئەوەبوو کەنیسە موڵکی هەبێت و داوای ئەکرد قەشەکان وەک سەرەتای مەسیحەیەت بە هەژاری بژین و چاو لە ماڵی دنیا نەکەن. (و.ک)

٧) Fra Dolcino (١٢٥٠-١٣٠٧) ڕابەری یەکیک لە گروپە دینیە ڕیفۆرمخوازە ڕادیکاڵەکان کە هێرشی ئەکردە سەر دەسەڵاتەکانی قەشەکان و بانگەشەی گەڕانەوەی بۆ نەریتی سنت پۆل ئەکرد. لە سەردەمی پشکینی بیروڕادا وەک زەندیق مەحکوم کرا و لە سێدارە درا. (و.ک)

٨) Savonarola (١٤٥٤-١٤٩٨) قەشەی ئیتاڵی و ڕابەری فلۆرانس کە لەدوای خێزانی میدچیەوە ڕابەرایەتی فلۆرانسای گرتە دەست. سەرسەختانە دژی ڕێنسانس بوو کە بەردەوام خەڵکی لە ئاگری دۆزەخ و شەیتانەکان ئەترسان، ئەو قەشەیە هەموو جەژن و کەرناڤاڵ و سەماکردنیکی قەدەغەکرد و سەرجەم قومارخانە و کۆفیەکانی داخست و هەموو ئەمانەی کرد بە ناوەندی فێرکردنی زانستە دینیەکان. لە ساڵی ١٤٩٧دا لەگەڵ پەیڕەواکنی خانوو بە خانوو گەڕان و هەموو ئامێرەکانی ئارایش و تابلۆ و وێنە و پەیکەر و کاڵاوی ژنانە و کتیب و ئامێرەکانی مۆسیقا و شەترەنجی کۆکردەوە و هەمویانی لەناوەرستی شاردا گڕ تێبەردا. ئەگوترێت زۆریک لە تابلۆ گرنگەکانی رینسانس لەم ئاگرەدا سوتان. بەڵام لەگەڵ سەرانی کەنیسەدا کەوتە ململانێ و ڕەخەنەی ئەو گەندەڵیانەی ئەکرد کە لەناو پیاوانی کەنیسە دا هەیە. لە ساڵی ١٤٩٧دا حوکمدرا و ساڵیک دوای ئەوە وەک مورتەد ناسرا. (و.ک)

٩) Les Vaudis گروپیکی مەسیحی کە لەگەڵ کەنیسەی کاسۆلیکیدا کێشەیان هەبوو.

١٠) Lollards گروپیکی سیاسی و دینی کە لەناوەڕاستی سەدەی چواردەدا دروستبوو. ئەم گروپە ڕەخنەیان لە کەنیسەی کاسۆلیکی هەبوو و بڕواین وابوو سەرچاوەی دین کتێبی پیرۆزە نەک مەرجەعە دینیەکان.

١١) hussites سزادراوەکان هەموویان تاک و گروپی ناڕازی بوون کە لە قۆناغی جیاوازدا دژی ستەمی مەزهەبی پاپەکان ڕاپەڕین و هەموویان بە فەرمانی ڤاتیکان لە سێدارە دران یان ناچارکران مەزهەبەکەیان بگۆڕن (و.ف)

ئەو قسەیە کە هەقیقەت لەبەرئەوەی کە هەقیقەتە، خاوەنی هێزێکی ناوەکیە کە بە هەڵە نەبەخشراوە، و دواجار ئەم هەقیقەتە بەسەر تەلی درکاوی زیندان و دەهلیزە تاریکەکانیدا سەرئەکەوێت، لە خەیاڵێک زیاتر نیە. دەمارگیری خەڵک بۆ رێبازی هەڵە لە دەمارگیریان بۆ هەقیقەت کەمتر نیە و ئەگەر بە پێی پێویست سزادانی یاسایی، تەنانەت سزادانی کۆمەڵایەتی بەرامبەریان بەکار بهێنرێت، بڵاوبونەوەی هەردوکیان بە تەواوی رائەوەستێنێت. بەڵام ئیمتیازی ڕاستەقینەی هەقیقەت لەوەدایە کە بیروڕای ڕاست ئەگەر یەکجار یان دووجار یان چەندین جار خامۆش بکرێت، ئەوا بە درێژای سەدەکانی دوایی کەسانێک پەیدا ئەبن کە دوبارە بیدۆزنەوە و ئەم دۆخە هەروا بەردەوام ئەبێت تا ئەوکاتەی یەکێک لە دەرکەوتە تازەکانی ئەو بیروڕایە لە سەردەمێکی گونجاودا جێی خۆی ئەکاتەوە کە تیاییدا بەهۆی بارودۆخی گونجاوەوە، بیروڕای زیندوو بوەوە لە سزادان ڕزگاری ئەبێت و ئەوەندە لە گەزەندی بیروڕا کوژان ئەپارێزرێت، تا بناغەکانی بەهێز و پتەو ئەکات و هێرشی نەیارەکانی بە سەرکەوتویی بەرپەرچئەداتەوە.

ناڕازیەکان ئەڵێن: «ئێمە ئێستا ئەو کەسانە ڕەوانەی مەرگ ناکەین کە خەڵک بە بیروڕای تازە ئاشنا ئەکەن، و وەک باوانمان نین کە پێغەمبەرەکانیان ئەکوشت. بەپێچەوانەوە مەرقەد و ئارامگایان بۆ دروستئەکەین».

ڕاستە کە ئیتر ئێمە یاخیبوانی مەزهەبی و نەیارەکانی بیروڕا ناکوژین، چونکە خۆشبەختانە ئەمرۆ ئەو سزایانەی بە پاڵپشتی ڕای گشتی دژی ئەمجۆرە بیروڕایانە -تەنانەت دژی دزێوترین کەسیان- بەکار ئەهێنرێت، ئەوەندە توند نیە کە بتوانێت خاوەنانی ئەو بڕوایانە لەناو ببات یان بفەوتێنێت. بەڵام لەگەڵ سەرجەم ئەم وردەکاریانەدا وا باشترە خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین، چونکە هەقیقەتی مەسەلەکە ئەوەیە ئێمە هێشتا خۆمان لە ئالودەبون بە سزادانی یاسایی ڕزگار نەکردووە. هێشتا بە پێی یاساکانی ئینگلتەرا ئەشێت بە تۆمەتی بوونی بیروڕا یان لانیکەم دەربڕینی ئەم بیروڕایە سزای خەلک بدرێت، و جێبەجێکردنی ئەم سزایەش لە کرداردا تەنانەت لەم ڕۆژگارانەی خۆماندا بێ پێشینە نیە کە بتوانریت بگوترێت هاوشێوەکانی بەهامان توندی و دڵرەقی سەردەمی دێرینەوە لە هەلێکدا سەرلەنوێ دەست پێئەکاتەوە.

لە ساڵی ١٨٥٧ دا لە دادگای شارۆچکەی کۆرنڤاڵ پیاوێکی بەدبەخت و بێدەسەڵات[١٢] کە ڕەفتارەکانی لە هەموو مەسەلەکانی ژیاندا ڕاست و ئاسایی بووە، بە تاوانی ئەوەی قسەی سوکایەتیئامێزی دژی مەسیحیەت کردووە و هەروەها لەسەر هەمان بابەت نووسینی توانجئامێزی لەسەر دەرگایەکی ئاسنی نووسیوە، بە بیست و یەک مانگ زیندانیکردن مەحکوم کرا. مانگێک پاش ئەم مەسەلەیە، لە دوو بۆنەی جیاوازدا سەلاحیەتی دوو پیاوی تر[١٣] بۆ قەبوڵکردن لە ئەنجومەنی دادا ڕەد کرایەوە و یەکێکیان بە توندی لە لایەن دادوەر و پارێزانەوە سوکایەتی پێکرا. بۆچی؟ چونکە هەردوکیان بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە لەبەردەم دادگادا ڕایانگەیاند کە بڕوایان بە هیچ باوەڕ و بیروڕایەکی دینی نیە. دواجار کەسی سێهەم[١٤] کە بێگانە بوو هەر لەبەر هەمان

١٢- تۆماس پۆلی (Thomas pooley) مێژووی حوکمدان سی و یەکی تەموزی ١٨٥٧ لە کانونی یەکەمی هەمان ساڵدا لیبوردنی سەڵتەنەتی گرتیەوە.

١٣- ژۆرژ ژاکۆب هالی ئۆک (George Jacob Holyoake) مێژووی حوکمدان حەڤدەی ئابی ١٨٥٩ و ئیدوارد ترولاو (Edward Truelove) مێژووی حوکمدان تەموز ١٨٥٧.

١٤- بارۆن دۆ گلایشن (Baron de Gleischem) مێژوو و شوینی حوکمدان دادگای بنکەی پاسەوانی شەقامی مال بۆرۆ-چواری ئابی ١٨٥٧.



جۆن ستیوارت

هۆ کە بڕوای بە مەزهەب نەبوو، لەو شکاتە نەکۆڵرایەوە کە دزیان لێکردووە. لێنەکۆڵینەوە لە شکاتی ئەم پیاوە بەو بنەما دادوەریە ئەنجامدرا کە ئەڵێت کەسێک کە بڕوای بە خوا نیە (جا هەر خوایەک بێت کێشە نیە) و بڕوای بەدنیای دوایی نیە، ڕێگەی نیە شایەتی لە دادگادا بدات. ناوەڕۆکی ئەم بنەمایە لە کرداردا جیاوازی لەگەڵ ئەوەدا نیە کە ئێمە ئەمجۆرە کەسانە لە مافە مەدەنیەکانیان بێبەش بکەین و داوا لە دادگا یاساییەکانی وڵات بکەین کە پاریزگاریان لێنەکەن. بە دەربڕینێکی تر نەک هەر ئەکرێت دەست بەسەر ماڵ و سامانی ئەمجۆرە کەسانەدا بێ هیچ دوودڵیەک بگیرێت یان زیانیان پی بگەیەنرێت (ئەگەر بەڕێکەوت کەسێکی جگە لە خودی زیانلێکراو یان کەسانێک کە بیروڕای هاوشێوەیان هەیە لە شوێنی ڕوداوەکاندا ئامادە نەبن) بەڵکو لە دۆخی هاوشێوەدا ئەکرێت دەستدرێژی بۆ سەر گیان و ماڵی هەر کەسێک بکرێت و دڵنیا بین کە شکاتەکەی بە هیچ شتێک ناگات، چونکە هەر بەڵگەیەک دژی دەستدرێژیکەران بهێنرێتەوە، لە دادگادا ڕەد ئەکرێتەوە.
لێنەکۆڵینەوە لە شایەتی ئەمجۆرە کەسانە لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە سوێند خواردنی کەسێک کە بڕوای بەو دنیا نیە، بی نرخە. ئەم بانگەشەیە دەریئەخات ئەوانەی قەبوڵیان کردووە زۆر لە مێژووی جیهان بی ئاگان، چونکە لە ڕووی مێژوویەوە هیچ گومان لەوەدا نیە کە ژمارەیەکی زۆری کافر و بێ دینەکانی سەدەکانی ڕابردوو، بە شەریفی و پاکیەتی بەناوبانگ بوون و هەرکەسێک کە کەمێک ئاگاداری مێژووی ژیانی کەسانی مەزن بێت، بێگومان ئەزانیت کە زۆرێک لە ناودارانی جیهان کە هەم لە ڕووی فەزیلەتی شەخسیەوە و هەم لە ڕووی ئەو ئامانجانەوە کە لە ژیاندا بەدوایەوەن، ناسراو بوون و بە ئاشکرا بەوە بەناوبانگ بوون کە بڕوایان بە خوا و دین نەبووە و لانیکەم هاوڕێ نزیکەکانیان ئاگایان لەم نهێنیە هەبووە. بەدەر لەمەش ئەم بنەما دادوەریە خەسڵەتێکی خۆشکێنی هەیە و ئامانجی خۆی بە کردەوە پیشێل ئەکات، چونکە لە لایەک وا دەریئەخات کە ئەو کەسانەی بڕوایان بە خوا نیە، بێگومان درۆزنن و لەلایەکی ترەوە شایەتی کەسانێک کە لەدەروندا بڕوایان بە خودا نیە، بەڵام ئامادەن درۆ بکەن و خۆیان وەک خواناس بناسێنن قەبوڵئەکات. بە دەربڕینیکی تر لە دادگاکانی ئێمەدا شایەتی ئەو ژمارە لە شایەتە ڕەد ئەکرێتەوە کە لەبەر شەهامەتی ئەخلاقی لە بەرپرسیارێتی قەبوڵکردنی پێشهاتەکانی کاری خۆیان و گوێ لێبوون لە سەرزەنشتی کۆمەڵگا ڕاناکەن و ئەمە لەوە بە باشتر ئەزانن کە بڕوا یان مەسەلەیەک بسەلمێنن کە بڕوایان پێ نیە.
لێرەوە پاراستنی بنەمایەک کە ئەوەندە نالۆژیکی و بۆگەن و بی بناغەیی خۆی (تا ئەو جێگەیە پەیوەندی بە مەبەستە ڕاگەیەنراوەکانیەوە هەیە) بە ئاشکرا سەلماندووە، مانایەکی نیە جگە لەوەی کە میراتێکی دزێوی دادوەری کە یادگاری سەردەمی سزادانی بیروڕایە، هەروا لە ناوەخنی یاساکانی ئینگلتەرەدا ماوە. ئەم بنەما دادوەریە و ئەو فەلسەفەی لە پشتیەوە ڕائەوەستێت، نەک هەر بۆ بێ دینەکان، بەڵکو بۆ باوەڕدارانیش سوکایەتی پێکەرە، چونکە گەر گریمانەکە لەسەر ئەوە بێت کە ئەو کەسانەی بڕوایان بە ئەو دنیا نیە بێگومان درۆ ئەکەن، ئەنجامی لۆژیکی ئەمە ئەوەیە کە ئەوانەی بڕوایان بەو دنیا هەیە ئەگەر لەکاتی وتنی بیروڕایە درۆ ناکەن (ئەویش بە گریمانەی ئەوەی کە درۆ ناکەن) ڕاستگۆییان تەنها لە ترسی ئاگری دۆزەخە. لێرەوە ئەگەر وابزانین کە ئەو تیۆرەیەی داهێنەران و پشتیوانانی ئەم بنەمایە بۆ فەزیلەتە مەسیحیەکان دایان ناوە، دەرئەنجامی ویژدانی ڕەنجاوی خۆیانە، هیچ زیانێکمان لە بەهای ئەم

بنەمایە نەداوە. ئەمجۆرە بنەمایانە ئەگەر بە وردی سەیر بکرێت، پاشماوەی زیندووی کۆمەڵێک بیروڕای مردووە و بەڕاستی ئەتوانرێت بگوترێت کە پاراستنیان بەرلەوەی ئارەزووی سزادانی بیروڕا بگەیەنێت، ئەو لاوازی و نەخۆشیە فکریە ئەگەیەنێت کە لەناو ئینگلیزەکاندا بڵاوە: لاوازیەک کە ئەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی لەزەت لە پاراستنی پارچەکانی بیروڕایەک یان نەریتێکی هەڵە (کاتێک کە ئەبینن چیدی جێبەجێکردنی ئەو نەریت و بیروڕایە مومکین نیە) وەرئەگرن. بەڵام بەدبەختانە هیچجۆرە زەمانەتێک لەم وڵاتەدا نیە کە وەستانی ئەمجۆرە داب و نەریتە ناشرینەی سزادان کە بە ئەندازەی تەمەنی نەوەیەک بەردەوام بووە، هەروا بەردەوام بێت. لە سەدەی ئێستادا ئەو هەوڵانەی بۆ زیندووکردنەوەی نەریتە زیانبەخشەکانی ڕابردوو، بەهەمان ئەندازە ڕوکەشی ئارامی ژیان ئەشڵەژێنێت کە هەوڵدان بۆ ئاشناکردنی خەڵک بە شتە تازەکان کە هەڵگری خێر و بەرژەوەندیانە.

بۆ نمونە ئەو دۆخەی ئەمڕۆ خەڵک شانازی پێوە ئەکەن و ناویان ناوە ڕاچەنینی مەزهەبی، بەگشتی لە هوشیاری خەڵکی نەخوێندەواردا مانای دەمارگیری مەزهەبی هەیە و لەبەرئەوەش کە پاڵنەری نالێبوردن بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە ئینگلتەرادا هەیە-چونکە بناغەی ئەم پاڵنەرە لە ناوەخنی چینی دووهەمی ئەم وڵاتەدا هەمیشە هەیە- بە کەمێک وروژاندن ئەکرێت بوروژێنرێن بۆ ئەوەی ئەو کەس و بیروڕایانەی هەمیشە لە ڕوانگەی ئەواندا ئامانجیکی گونجاون بۆ سزادان، بەکردەوە سزا بدەن[15].

۱۵- )بۆ دیاریکردنی ئەم مەترسیە ئەکریت پەند لەو هەستانە وەربگیرێت کە لەکاتی شۆرشی هنددا لەم وڵاتە وروژا و ئەم هەستانەش بوو کە خراپترین خەسلەتەکانی ئیمەی ئاشکرا کرد، ئەکرێت توندڕەوی کەسانی دەمارگیر و شارلاتانەکان وەک کۆمەڵێک دەرکەوتە کە زۆر گرنگ نین فەرمۆش بکرێن. بەڵام سەرانی گروپی عیساوی ئەم وڵاتە ئەو بنەمایەی کە بە ڕوکەش ئەبێت بناغەی حکومەتی ئێمە بێت بەسەر هندۆس و موسوڵمانەکاندا بەم ناوەڕۆکە ڕاگەیاند کە هەر قوتابخانیەک ئەنجیلی تیا نەخوێنرێت، نابێت لەلایەن دەوڵەتەوە یارمەتی دارایی بدرێت. ئەنجامی زۆردارانە و ناچارانەی ئەم حوکمە ئەوەیە کە لە ئایندەدا دەوڵەت هیچ کار و بەرپرسیارێتیەکی بەرانبەر بە هیچ کەس جگە لەوانە نیە کە مەسیحین یان ئامادەیی ئەوەیان تیایە ببنە مەسیحی. بەپێی ڕاپۆرتێک کە لەبەردەستدایە یەکێک لە هاوکارانی وەزارەتێکی ئێمە لە وتەیەکدا کە لە بازنەی هەڵبژاردنی خۆیدا لە ۱۲ تەموزی ۱۸۵۷ دا پێشکەشی کردووە لەبارەی مەزهەبی سەدملیۆن موسڵمان و هندیەوە کە سەر بە ئینگلەتەران وتوێتی: «ئەو ئەنجامەی دەوڵەتی ئینگلتەرا لە تەحەمولی دین و مەزهەبی ئەمانە وەرگرتووە (کە شتێکی جیا لە خورافات نیە کە ناویان ناوە مەزهەب)، بەرهەمهێنانی بەدناو و شکانی شکۆی ئینگلتەرا و ڕێگرتن بووە لە نەشونمای تەندروستی مەسیحیەت لە هندستاندا. تەحەمولی باوەڕ و بیروڕای مەزهەبی ئەوانی تر پتەوترین بناغەی ئازادیە مەزهەبیەکان لەم وڵاتدا پیک ئەهێنێت، بەڵام ئەبێ چاودێری بکەین و ڕێگە نەدەین کە ئەم هندی و موسڵمانانە کەڵکی خراپ لە ناوی پڕ بەهای «تەحەمول» وەربگرن..»

مانای تەحەمول و لیبوردن بەرامبەر دین و مەزهەبەکانی تر (بەپێی تیگەیشتنی ئەم پیاوە سیاسیە) ئازادی کامڵی ستایش و پەرەستنە بۆ هەموو کەسێک، بەو مەرجەی ئەوانەی ئەپەرستن هەمویان مەسیحی بن و سەرەڕای جیاوازیەکانیان بنەمایەکی هاوبەش بپەرستن.

مەبەستم لە هینانەوەی ئەم نمونەیە ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەرە بۆ ئەو ڕاستیە کە پیاویک کە دەوڵەتی ئەو کاتە (ئەویش دەوڵەتیکی لیبرال) وەک کەسێکی شایستە بۆ یەکێک لە گرنگترین پۆستە دەوڵەتیەکانی ئەم وڵاتە پاڵاوتووە، لە ناوەخنی قسەکانیدا ئەو بیروڕایە هەیە کە باوەڕ و مەزهەبی هەموو ئەوانەی بڕوایان بە (خوداوەندێتی مەسیح نیە) هەڵەیە و قابیلی تەحەمولکردن نیە. هەنوکە ئەبێت پاش ئەم دیمەنە دزێوە ئایا دیسان کەسێک هەیە زیادەڕەوی لەو خەیاڵە هەڵەیەدا بکات کە نەریتی سزادانی مەزهەبیی لەنیوان ئێمەی ئینگلیزیەکاندا نەماوە و هەرگیزیش ناگەڕێتەوە

بەشێک لە فەسڵی دووهەمی ئەم کتێبەی خوارەوە:

جان ستیوارت میل: رساله درباره ازادی. ترجمە: جواد شیخ الاسلامی. شرکت انتشارات علمی و فرهنگی. تهران. چاپ پنجم ۱۳۸۵

## ئاگاداری

دۆسیەی ژمارەی داهاتوو لەسەر چەمکی دادپەروەریی دەبێت. تکا لە هەموو ئەو برا نووسەرانە دەکەین کە بابەتی وەرگێڕانیان لەسەر ئەم چەمکە هەیە بیگەیەننە دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، یان رەوانەی ئەم ئیمەیلەی خوارەوەی بکەن:

Govarysardam@yahoo.com

# جۆن لوك باوكی لیبرالیزم

نووسینی: یۆهان نۆربێری
و.لەسویدییەوە: ئەژین عبدالخالق

جۆن لوک (١٦٣٢-١٧٠٤) بە باوکی لیبرالیزم ناو دەبرێت، کارە سیاسییە سەرەکییەکانیشی هەندێکجار بە «کتێبی پیرۆزی لیبرالیزم» ناودەبرێت. بێگومان ڕاستیەکیش لەپشت ئەو ناوزەندکردنەوە هەیە. بێگومان ئەوە جۆن لوک بوو بۆ یەکەمجار بەشێوەیەکی سیستەماتیک ڕوونیکردەوە، بۆچی مرۆڤ پێویستی بە ئازادییە؟ بۆچی مافی خاوەندارێتی مافێکی سروشتییە؟ بۆچی تاکە ئەرکی دەوڵەت، پاراستنی ئازادی ئێمەیە؟ لەکاتێکیشدا دەبێت دەوڵەت ئەم پارێزگاری و پاراستنە بۆ هاوڵاتیان دابین بکات، کەچی نایکات.
ئەم نووسین و شیکردنەوانەی جۆن لوک، کاریگەرییەکی فرە گەورەی لەسەر وەرچەرخانێک هەبوو، کە ئەنجامەکەشی بریتی بوو لە لەدایکبوونی بزوتنەوەی لیبرالیزمی مۆدێرن و دواتریش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەمریکی بەدوای خۆیدا هێنا. ئینجا لەقۆناغی دواتریشدا، سەرهەڵدانی شۆڕشی فەرەنسیی لێکەوتەوە.

## ئایدیاکانی جۆن لوك لەبارەی ئازادییەوە

تێڕوانینە لیبرالییەکانی جۆن لوک لەبارەی ئازادییەوە، لە تێزی (سروشتی مرۆڤ)ەوە دەستپێدەکەن و سەرچاوە دەگرن. لوک پێیوایە بنچینەی ئەرک و ماف لەمرۆڤدا خۆپاراستنە، بۆ ئەوەی بەگونجاوترین شێوە بژی و ژیانی خۆی بەسەر بەرێت.
بەبڕوای جۆن لوک، مرۆڤەکان لەبنەڕەتدا هەمان مۆرک و تایبەتمەندییان هەیە، بێگومان مەرجیش هەیە بۆ ئەو مۆرک و تایبەتمەندییانە. ئێمە لەگەڵ لەدایکبوونماندا، هیچ ئایدیایەک ناهێنێن تا ڕێگای ڕاستمان نیشان بدات، بەڵام هزری ئەوەمان هەیە، کە باش و خراپ لە یەک جیابکەینەوە، یان بریار لەسەر شێوە ژیانێک بدەین. بۆ نموونە وەک ئەوەی لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و بازرگانیدا دەبینرێت.
ئەگەر مرۆڤ بتوانێت خۆی، خۆی بپارێزێت ئەوا دروستیشە هزری خۆی بەکاربهێنێت و هەڵسوکەوتی پێبکات. ئەمەش بەو مانایە دێت، کە ئێمە ڕێگا لە کەسانێکی تر ناگرین، دەیانەوێت هزری خۆیان بەکاربێنن. هیچ کەس بۆی نییە ناچارم بکات، یا زەبر و توندوتیژی بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی کردارێکم پێبکات، یا ناچارم

بکات من ئەم کارە بەرانبەر کەسێکی تر بکەم. من مافم هەیە بە ئازادی ژیانی خۆم بکەم، ئەو ئازادی و خاوەندارێتییەی خۆم دەمەوێت و هەڵیدەبژێرم، تا ئەو سنورەی کاریگەری نابێت لەسەر ئازادی و ژیان و خاوەندارێتی ئەوانی تر. ئەوانی تر چیدەکەن، ئەوە کێشەی تایبەتی خۆیانە. هەروەک لوک لە نامەیەک لەبارەی لێبوردن نوسیوێتی :

A Letter concerning Toleration «If any man err from the right way, it is his own misfortune, no injury to thee»

واتا: (هەرکەسێک هەڵە دەکات یان لەسەر ڕێگای ڕاست لادەدات , خۆی باجەکەی دەدات و زیانی بۆ ئێمە نیە)

**خاوەندارێتی**

خاوەندارێتی یەکێکە لە مافە بنەڕەتییەکانی فەلسەفەی جۆن لوک. لوک پێیوایە مافی خۆمانە خاوەندارێتی و نمایشی جەستەی خۆمان بکەین، بەو شێوەیەی خۆمان دەیخوازین، نەوەکو بەو شێوەیەی کەسێکی تر گەرەکێتی، ئێمە لەسەر داخوازی ئەو کەسانەی تر نمایشی جەستەی خۆمان ناکەین. بەڵکو ئازادین لەم کارەی خۆماندا. هەروەها لوک باس لەو یەکەمین قوڵترین تیۆرییە ئەکات کە بۆچی ئێمە هەقی نیشاندانی خاوەندارێتیمان هەیە. مەبەستی لوک بە شێوەیەکی نەریتخوازانە بریتییە لەوەی خودا زەمینی دروستکرد، بەڵام , لەهەمان کاتدا لوک پێی وایە خودا جیهانی بەخشی بە مرۆڤەکان. بەو شێوەیە نا کە ئێمە لەناوەڕۆکدا مافی ئەوەمان هەیە بڕیاری لەسەر بدەین، بەڵکو دەتوانین سوودی لێوەرگرین. هەروەها ئێمە دەبێت سوودی لێوەرگرین و بیپارێزین بۆ ئەوەی بتوانین جوان بژین. لەگەڵ ئەوەی جیهان سوود لەم چالاکی و ئەقڵانیەتە وەردەگرێت، لە هەمانکاتیشدا لەمیانەی خاوەندارێتیدا بەرجەستە دەبێت. لەبەرئەوەی ئێمە هەموو مافێکمان هەیە لە کارەکەماندا، لە هەمان کاتدا ئەو مافانەی ئێمە دەستدرێژی نییە بۆ سەر مافی تاکەکەسی و کەسانی تر، کەواتە ئێمە خاوەنی ئەو مافانەین. بۆ نموونە لە کاتی ڕاوکردندا، مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ئەو ئاژەڵەی ڕاوی دەکات. یا لە کاتی کۆکردنەوەی مەتریاڵ و کانزای خاودا، یا وەک ئەوەی لە کاتی کشتوکاڵ و خانو دروستکردندا، هەموو ئەو مافانەمان هەیە، کە کار نەکاتە سەر مافی کەسانی تر. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت حیسابی ئەوە بکەین، ئێمە خاوەنی بەشێکی دیاریکراوین لەڕووبەری زەویدا.

ئەو بیروبۆچوونانەی لوکیش تەواو ناکۆکە لەگەڵ باوەڕ و بۆچوونی جان جاک ڕۆسودا، کە پێیوایە تەنیا ئەو پەرژینەی لە دەوری پارچە زەوییەک کێشراوە، مافی ئازادی ئێمە دەستنیشان دەکات. لە دەرەوەی ئەم پەرژینە مرۆڤ خاوەندارێتی هیچ ناکات. کەواتە تاک مافی خاوەندارێتیکردنی جەستەی خۆی و کار و پیشەکەی هەیە.

ئەوە تاکە کە هەقی بەسەر جەستە و کارەکەیەوە هەیە، هەروەها تەنها تاکیشە کە مەرجی لەسەر ئەنجام و بەرهەمی کار هەیە. هەقی پەیداکردنی سەروەت و سامان، یان ئەو جۆرە سەروەت و سامانەی کە ئینسان ئازادانە چنگی کەوتووە یان ئەیانخاتە سەر خۆی لەڕێگەی خاوەنەکەیەوە، ئەمەش موڵکی کەسی بێت یان قابیلی تەسەروف پێکردنی نەبێت.




## ئەرکی دەوڵەت

مەبەستی جۆن لۆک ئەوەیە کە هەقی ئێمە بۆ ژیان و ئازادی و سەروەت و سامان شتێکی «ئاسای»یە. واتا سروشتی مرۆڤ داوای ئەو مافانە دەکات. ئێمە ئەو مافانەمان بۆ ئەوە نییە تا لە کۆمەڵگایەکی دڵنیادا لەگەڵیدا بژین، یان چونکە ئێمە ئەندامی هەمان گرووپی ئاینین یان هەمان ڕەگەز و زایەندەی هاوبەشمان هەیە، بۆیە ئەو مافانەمان هەیە، بەڵکو ئێمە مافمان هەیە، چونکە ئێمە مرۆڤین.
ئەم بۆچوونانەی لوک بە ڕوونی لە «تێزی دووهەم»دا هەیە، کاتێک ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە بۆچی ئێمە پێویستمان بە دەوڵەت هەیە. لەو خاڵەوە بۆچوونی «دۆخی ئاسایی» دێنێت، لە دەرەوەی دەوڵەتەکان و ئەرکەکانی سەرشان و ...هتد. سەرباری ئەوەی کە لوک مەبەستی ئەوەیە کە ئێمە هەقمان بەسەر خۆمان و سەروەت و سامانمانەوە هەیە، تەنها لەبەرئەوەی کە ئێمە بونەوەرێکین خاوەنی هزرین.
دۆخی سروشتی لەلای جۆن لوک بە شێوەیەکی سەرەکی دۆخێکی ئاشتیخواز و ئارەزوومەندانەیە، بە هاوبەشی و پێکەوەیی و لە بازرگانیدا، دوور لە ئەنارشیست[1]، بێ ئەوەی هەرکەسێک بێ سەروبەرانە و لە ڕاست خۆیەوە بیکات بە شەڕ لەگەڵ ئەوانی تردا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاساشکێنی و تاوانکاری لەو کێشانەن، کە هەر کۆتاییان نایەت و بەردەوام کەسانێک هەن ڕێزی مافی بەرانبەرەکەیان ناگرن، ئەوەش نائارامی و مەترسی لە نێو کۆمەڵگادا دروست دەکات. بۆ ئەوەی خۆمان لەم نائارامییە بپارێزین، جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەو تێکستەی جۆن لوک بکەین، کە جەخت دەکاتە سەرئەوەی «پێکەوە ژیان لەنێو یەک دەوڵەتدا، کە یاسا تێیدا پارێزراوە و تاوانبار بە سزای خۆی دەگات مافێکی سروشتیە«. بەپێی تێڕوانینی لوک بێت تەنها ئەرکێکی دەوڵەت: ئەوەیە کە دادگای هەبێت، پۆلیس و بەرگری ـ ئەمەش ئەبێت بە دەوڵەتۆچەیەکی لیبرالیزمی کلاسیکی. دەوڵەت ژیان و سەروەت و سامانمان ئەپارێزێت لە شەڕانگێزان. بۆ ئەوەی ئێمەش نەبینە شەڕانگێز ئەبێت ڕێ بەخۆمان نەدەین گوزارشت لە سەرنجی خۆمان بکەین، جوڵەی خۆمان سنورداربکەین، سەروەت و سامانمان «بەکاربهێنین لە کاتی پێویستا بۆ پارێزگاریکردن لە خۆمان».
لەم حاڵەتەشدا، دەوڵەت بۆی نییە خۆی ببێتە بەشێک لەو توونددوتیژیە و توونددوتیژی بەرانبەر هاوڵاتیانی خۆی بەکاربهێنێت، لە کاتێکدا دەوڵەت بانگەشە بۆ ئازادی ڕادەربڕین دەکات، لە هەمانکاتیشدا , ڕێگە بگرێت لەبەردەم کار و چالاکی هاوڵاتیانی و دەست بەسەر ماڵ و سامانیاندا بگرێت. لەگەڵ هەموو ئەو پێشێلکارییانە، کە دەوڵەت نابێت بەرانبەر هاوڵاتیانی بیانکات، بگرە ئەرکی دەوڵەتە پارێزگاریشیان لێبکات.
ئێمە وەک هاوڵاتی بۆ ئەوەی بتوانین کۆنترۆڵی تێکڕای باری دەوڵەت بکەین، نەک بە تەنیا کۆنترۆڵی تاوان، دەبێت جۆرێک لە دابەشکاری هەبێت لە نێو دەوڵەتدا. هەروەها دەبێت هاوڵاتیان کۆنترۆڵی دەسەڵاتی یاسادانان بکەن. ئەوەش واتای ئەوە ناگەیەنێت کە زۆرینە دەبێت بڕیار لەسەر هەموو شتێک بدات کە دەیەوێت. دەوڵەت بۆ ئەوە دروست بووە تا مافەکانمان بپارێزێت، ئەگەر دەوڵەت لەم ئەرکەی سەرکەوتوو نەبوو بەرانبەر بە هاوڵاتیانی، بەڵکو لەبری جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە و سەرکەوتن تێیدا، ئەوا دەوڵەت خۆی بووە بە بەشێک لە سوکایەتی و سەرپێچیکردن بەرانبەر بە مافی هاوڵاتیان، ئەوا بە بڕوای جۆن لوک لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا پەیمانی کۆمەڵایەتی داڕماوە و تێکشکاوە و هاوڵاتیان مافی خۆیانە شۆڕش بکەن و یاخی بن و داوای گۆڕینی ئەو دەسەڵاتە بکەن لە نوێوە. وەکو ئەوەی یاخیبووان و شۆرشگێڕانی ئەمریکا لە سەدەی حەڤدەیەمدا ئەنجامیاندا.

١- ئەنارشیست: فەوزەوی , قانوننەناس , نۆرمنەناس , هەرکەس بۆ خۆی.

### ئەفسانە لەبارەی (لوک)ەوە

«لوک تێکڕای سیستەمی لیبرالیەکەی لەسەر بنەمای بروا ئایینییەکەی خۆی بونیاد دەنێت».

بێگومان ئەوە ڕاستە، کە جۆن لوک پیاوێکی دیندار بووە و ئاین و خودا لە هەموو ڕوویکەوە، بە ڕێژەیەکی بەرچاو کاریگەری و تێکەڵاویی هەبووە لەسەر نووسینەکانی. بەڵام، سیستەم لەلای لوک ناکەوێتە ژێر کاریگەری خوداوە. لوک لە سیستەمەکەیدا زۆر بە وردی بەڵگە دێنێتەوە لەسەر هەموو خاڵێک لە دونیای مەتریاڵی و ئەقلانیدا، لێرەشدا خودا زۆر تر بۆ بەهێزکردنی بەڵگەکانی خۆی بەکار دێنێت. هەروەک خودا وەک بەڵگەیەک بۆ بەهێزکردنی نووسینەکانی خۆی دێنێتەوە و دەڵێت: «جگە لەوەش، خودا ئەوەی دەوێت».

ئەگەر مرۆڤ بەراوردێک لەنێوان ئەو گفتۆگۆیانەدا بکات، کە لە تێکستەکانی لوک و پیاوانی کۆنسێرڤاتیڤی ئەو سەردەمەدا هەیە، ئەوا مرۆڤ جۆن لوک بە پیاوێکی زۆر سیکۆلاریزم «نائاینی« دەبینێت و دێتە بەرچاوی. تاکە باس و بەڵگەی ئاینپەرستی کە لوک لە نووسینەکانیدا دەیدات بەدەستەوە، بریتییە لەوەی کە «خودا دەزانێت تاکەکان دەبێت بژین و تەندروستییان باشبێت».

ئەگەر ئێمە بە جێگای ئەم دێڕە بنوسین «تاک دەبێت بژی و تەندروستی باش بێت» ئەوا دەتوانین بە شێوەیەکی پراکتیکی، تێکڕای فەلسەفەی جۆن لوک لە فۆرمێکی نائاینیدا دابنێین و تەماشاکەین.

زۆرجار لوک لە ڕێی بیرکردنەوەی لەسەر مافەکان کە لەسەر تاکگەراییەکی بێ سنور بنیاتنراوە ئەناسێنرێت. ئەم جۆرە باسکردنانە لەگەڵ ئەو ڕاست نایەنەوە، یەکێک لە چەقی باسەکانی ئەو لەسەر دۆخی سروشتییە، بەو پێیە ئەم بۆچوونەش بێ هیچ چەندوچوونێک لە ئازادی و نیازپاکی و پشتگیریکردنی یەکتری و کۆمەکردنەوە مۆرکی خۆی دیاریکردووە. ئەکرێت ئەمە وەک هێنانەوەی بەڵگەیەکی باش لە دەرەوەی گریمانەکانی لوکەوە سەیربکرێت.

نەخێر ناکریت ئەمە بکرێت. لوک زۆر بە ڕوونی باس لەوە ئەکات ئەگەر ئێمە هەقی «ژیان»، ئازادی و سەروەت و سامانمان هەبێت، دەوڵەتیش تەنها ئەرکێکی هەبێت کە پارێزگاری ئەمانە بکات، نەک تەنگیان پێ هەڵبچنێت وەک لە ڕێگەی پێدانی باجەوە بە دەوڵەتی ڕەفا. لە پێشنیازە پراکتیکییە سیاسییەکەیدا لوک ئەمە بەئاشکرا ئەخاتە ڕوو. هەڵەی ناو کتێبی ئەم نووسەرە زۆر ئاسان و ناجۆر ئەبینرێت، ئەوان پێیانوایە لیبرالیزم و تاکگەرایی لەگەڵ «ئازادی و نیازپاکی»دا گرێنادرێنەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە دەوڵەتی ڕەفا ئەتوانیت ئەمە دروستبکات.

لە دەرەوەی گریمانەی مارکسیش , ئێمەی ئازادیخوازیش بانگەشە و پێداگرتنمان لەسەر «بەڵگە و پاساو هێنانەوە بۆ بوونی پاسەوانی شەوانەی دەوڵەت و گریمانەکردنی« تەنیا گەمژانە و نازانستیانەیە.

چونکە، ئێمە باوەڕمان بەوە هێناوە، کە تەنیا ئازادییە دەتوانێت مرۆڤ بەرەو پێش ببات و سەرکەوتووی بکات وەکو ئەوەی مارکس ئاماژەی بۆ دەکات. لێکۆڵینەوە لەسەر نووسینەکانی جۆن لوک، نیشانی دەدات کە لوک بەداخەوە پڕبوە لە دژایەتی و دەبڵ مۆڕالی بە شێوەیەکی زۆر ساویلکە و سادە و خۆشباوەڕانە. بەشێوەیەکی گشتیش زۆر بەئاشکرا دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە لوک سامانی تایبەتی بە مافی سروشتی دەزانێت و هەروەها بڕیاری زۆرینە بە شێوەیەکی پەسەندکراو دەزانێت بۆ بەڕێوبردنی وڵات. لاسلێت پێیوایە لوک دەبێت قبوڵی هەموو بڕیارەکانی زۆرینە بکات و بەرپرسیشە لە کەموکوڕییەکانیان. ئەگەرچی ئەم بڕیارانەی زۆرینە




دەیاندات، بریتی بێت لە ناسیۆنالیزە «خۆماڵیکردن» یان کۆنفیرماسیۆن[٢]، بەڵام لەلای لوک بڕیاری زۆرینە هەر جێگای قبوڵە.

لاسلێت لە ڕۆڵی زۆرینە لەلای لوک و ئایدیا دیموکراتییە لیبرالیزمەکانی تر، تێناگات کە چۆن دەوڵەت دەبێت کۆنترۆڵی زۆرینە بکات. ئەگەر دەوڵەت چەوتی نەنواند و هەوڵیشیدا هاولاتیان بچەوسێنێتەوە لە ڕێگای دەسەلات و حوکمی پاشاکانەوە، لەبەرانبەر ئەوەشدا زۆرینە مافی ئەوەی نییە بریار لەسەر زوڵم و ستەمکاری بدات، کە دەبێتە هۆی سوکایەتی پێکردن بە کەمایەتی «کەمینە«. ئەوەش ئەو خاڵە مەزەندە کراوەیە «براوە«یەیە کە لەگەڵ دابەشکردنی دەسهڵات، دەسەلات خۆشبەخت و براوە دەبێت تیایدا و لە ڕێگایەوە دەتوانێت دەست بەسەر بنەماکانی دەستور و مافدا بگرێت. ماف بۆ ئێمە و بۆ موڵک و سامانمان بریتییە لە مافی سروشتی لەلای جۆن لوک و کەسیش بۆی نییە سوکایەتی بەو مافە سروشتیانە بکات، بەبێ ڕەچاوکردنی سیستەمی حوکمی پاشایەتی و بنەمای زۆرینەی دەسەلاتدار.

بەم شێوەیە لوک مەبەستێتی بڵێت «مرۆڤ مافی خۆیەتی خاوەندارێتی زەوی بکات، ئەوەندەی دەیەوێت و بەرگەی دەگرێت و مانابەخشە بۆی«. بەڵام لەم نێوەندەدا پوچگەراییەک هەیە لەنێوان مۆنۆپۆڵ[٣] «قۆرخکردن» و تاکگەراییدا، کە دەیەوێت زۆر شت لە ژێرەوە بشارێتەوە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەک بگاتە پێگەی دەسەلات بەبێ بناغەی دیموکراسی. دیسان ئەوەش دژایەتیەکی زۆر بەرچاوە، کە لە فەرهەنگی ڕۆژانەی جۆن لوک بەرچاو دەکەوێت , لە کاتی قسەکردنی لە بارەی تێزی خاوەندارێتیدا. بەڵام ئەوە بە شێوەیەکی تێکەڵاو لە دۆخی سروشتی و فەلسەفەی سیاسی لەلای لوکەوە سەرچاوە دەگرێت. لوک لە دۆخی سروشتیدا، مەبەستێتی بڵێت مرۆڤ تەنیا مافی هەیە ئەوەندە ببات کە دەتوانێت بەکاریبهێنێت. بۆ نموونە مرۆڤ ناکرێت ئەوەندە لە گۆشت و بەروبوومی پێشکەش بکرێت، کە بۆی بەکارنەبرێت و بۆگەن بکات. ئەوەش ئەوە دەگەینێت لەلای لوک، کە خودا هەموو ئەو بەروبومانەی بە مرۆڤ بەخشیوە، بۆ ئەوەی کەڵکیان لێورگرێت و بەخەسار نەچن. بەڵام ئەوە لەلای لوک تەنیا پەیوەستە بەو سادەییەی دۆخی سروشتی بەپێی گلدانەوە و پاراستنی ئەو دەرماڵەی مرۆڤ دەیخوات، لەبەرئەوەی مرۆڤ لەم دۆخەدا، دەتوانێت داراییەکی زەبەلاح پێشکەش بکات، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ دەتوانێت گۆڕینەوە و فرۆشتن بەکاربهێنێت بۆ شتیکی تر. پارە بۆگەن ناکات و لەڕێگای بەشەکانی کارەوە ئێمە دەتوانین شتەکانی تر بە دەست بهێنین و کەڵک لە سامانمان وەرگرین. بەم شێوەش مرۆڤ دەتوانێت گەلێک زەوی و خاک بەدەست بهێنێت و بەکرێی بداتەوە، یا کرێکار بگرێت بۆ بەکاربردنی زەوییەکەی و بەڕێوبردنی.

---

٢- کۆنفیرماسیۆن: یەکێکە لە حەوت ڕێو ڕەسمە ئاینیەیەکەی کلێسای کاتۆلیکی.

٣- مۆنۆپۆڵ: احتکار , مۆنۆپۆلی.

**سەرچاوە:**

http://www.frihetsfronten.se/liberalismen/locke.shtml

liberalismen – de individualistiska ideernas historia

# دوو بنەمای ئازادی و یەکسانی

نوسینی: روژە لاکۆمب
و. لە فارسییەوە: ئاران

ئایا دیموکراسی ئەوەندە نرخی هەیە کە هەوڵ بۆ زیندوکردنەوەی بدەین؟ پێش تاوتوێکردنی کێشەکانی دیموکراسی واباشترە باسی نرخەکەی بکەین، دیموکراسی پێناس بکەین و ببینین چ بنەمایەک ئیلهامبەخشی دیموکراسیە.

دیموکراسی بە ڕێگەی جیاواز پێناس ئەکەن کە هەندێکجار ناکۆکە بەیەک. هەندێک کەس بە چەمکێکی ئەزانن کە لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لە ئیرادەی فەردی و کەرامەتی مرۆڤی دامەزراوە. هەندێکی تر بڕوایان وایە کە ئەبێت لە دیموکراسیدا کەسایەتی تاک تێکبشکێنین، واتە کۆمەڵگا بە بنەما دابنێن و بە دروستکردنی یەکسانی گشتی هەمووجۆرە باڵاتربونێکی تاکەکەسی لەناوبەرین. بۆ ئەوەی بزانین کام یەک لەم ڕوانینە ڕاستە، ئەبێ ببینین لە هەردوو بنەمای ئازادی و یەکسانی کە بنەمای دیموکراسین، کامیان بنەڕەتیترە.

مەحاڵە بتوانین بەتەواویی دوو بیرۆکەی ئازادی و یەکسانی لەیەک جیا بکەینەوە. ئەو ئازادیەی دیموکراسی مەبەستێتی ئازادیەکە کە گشتی بێت، نەک تایبەت بێت بە ژمارەیەکی دیاریکراو و ئەم خاڵەش بە مانایەک لە ماناکان یەکسانی گشتی لە خۆیدا هەڵگرتووە. بە پێچەوانەوە هەر پێشکەوتنێک کە لە ڕێگەی دابینکردنی یەکسانیدا بێتەدی، لەو ڕووەوە کە هەڵگری سڕینەوەی ئیمتیازاتی تاکەکەسیە، بۆ ئەو کەسانەی کە لەم ئیمتیازاتانە بێبەشن، وەک ئازادی وایە. بەڵام پەیوەندی ئەم دوانە لەمە وردترە:

لە ڕووی مێژووییەوە بزوتنەوەی ئازادیخوازی هاوکات بووە لەگەڵ جێگیرکردنی یەکسانیدا. ئەم دوو بزوتنەوەیە کاتێک گەشەئەکەن کە ڕێزگرتن لە نەریتەکان کەم بوبێتەوە و بە ڕۆحێکی ڕەخنەگرانەوە ڕووبەڕووی مەسەلە سیاسیەکان ببینەوە. ئەوکاتە هوشیار ئەبین بە حەقیقەتی خود و ئەو بوونە تایبەتیەی لەبەرامبەر کۆمەڵگادا هەمانە و ئەمانەوێت کە کەسێتیمان جێگیر بکەین لە چنگی کۆنفورمیسم ڕزگارمان بێت و ئازادیی خۆمان بەدەست بێنین. لەمکاتەدا چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا بیر لە هەلومەرجی ژیانی خۆیان ئەکەنەوە و ئەبینن کە ئەکرێت ئەم دۆخە ناهاوسەنگە بگۆڕێت و لێرەوە خوازیاری لاچونی ئەم نایەکسانیە تاقەتپڕوکێنە ئەبن.

ئامانجەکانی ئـازادی و یەکسانی سەرچاوەی تیۆری یەکسانیان هەیە و هەردووکیان لە ئەخلاقێکی هیومانیستیەوە سەرچاوە ئەگرن. ئەگەر هەموو تاکەکانی مرۆڤ وەک یەک یەکە و یەک هەقیقەت لەبەرچاو بگرین، جیاوازی کۆمەڵایەتی نێوانیان لەبەرچاومان ون ئەبێت و ئەبینی کە هەموان ئەبێت بە ڕادەیەکی یەکسان ڕێزلێگیراو بن و ئیمکانی ژیانێکی ئاسودە و خۆشبەختیان هەبێت. ئەم بیرۆکەیە ئەگاتە ئەو شوێنەی کە هەر تاکێک بە بوونەوەرێکی سەربەخۆ دابنێن و بمانەوێت تاڕادەیەک ئیرادەی لە کۆتوبەندە دەرەکیەکان ئازاد بکەین. بەمشێوەیە چەمکی ئازادی کە مەرجی پێشکەوتنی کەسایەتی مرۆڤە، دێتە دی و گەشە ئەکات.

ڕاستە کە دوو چەمکی «ئازادی» و «یەکسانی» پەیوەستن بەیەکەوە، بەڵام یەک چەمک نین. ئەکرێت گریمانەی کۆمەڵگایەک بکەین کە تاکەکانی ئەگەرچی ئازادیان هەیە، لەڕووی پێداویستیەکانەوە نایەکسانن و بە پێچەوانەوە ئەکرێت گریمانەی کۆمەڵگایەک بکرێت کە تیایدا بە تەواویی ڕەچاوی بنەمای یەکسانی بکرێت و هیچ جیاوازیەکی چینایەتی و ئیمتیازێکی قووڵی کۆمەڵایەتی لەنێوان خەڵکدا نەبێت، بەڵام کۆنفرمیسیمێکی قورس بەسەریاندا باڵادەست بێت و تاکەکان کۆتی «کۆمەڵگایان» لە ملدا بێت و لەسەربەخۆی ڕاستەقینە بێبەش بن.

پێشکەوتنی ڕۆژئاوا بەرەو ئازادی و یەکسانی دوو گۆڕانی جیا بوو، بەڵام ئەم دوو گۆڕانە هاوکاتی یەک بوون. لەسەدەی ١٨ و ١٩دا هێشتا ئەرستۆکراتیەت بەسەر ئینگلتەرادا باڵادەست بوو و نایەکسانی هەبوو، بەڵام لەو سەردەمەدا ئینگلتەرا توانی ئازادیەکانی تاکەکەس پەرەپێبدا. لە فەرەنسا ڕژێمی دیکتاتۆری ئیمپراتۆری یەکەم (سەردەمی ناپلیۆن بۆناپارت) ئازادیەکانی تێکشکان، بەڵام درێژەی بە پێشکەوتن بەرەو «یەکسانی کۆمەڵایەتی» دا کە شۆڕشی مەزنی فەرەنسی بەدیهێنابوو. لەبەر ئەمە ڕژێمی ناپلیۆن بۆ فەرەنسیەکانی ئەو سەردەمە بە پێی ئەوەی سەبارەت بە کام یەک لە دوو چەمکی «ئازادی» یان «یەکسانی» هەستیار بوون، وەک تەواوکاری شۆڕش یان گەندەڵکردنی شۆڕش دەرئەکەوت.

لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا ڕۆیشتن بەرەو ئازادی و یەکسانی، بە ڕێگەی جیاواز ڕوویدا. بۆ نمونە لە بواری ئابوریدا پەرەسەندنی تەکنیک و دەرکەوتنی سەرمایەداری بووە هۆی نایەکسانی کۆمەڵایەتی. ئەگەر چاو لە هەندێک ئاوارتە غافڵ بکەین، ئەبینی کە لەم کۆمەڵگایانەدا بزوتنەوە یەکسانیخوازەکان ڕەوتێکی ناچاری هەبووە و بەدیهاتنی پێویست بووە. هەندێکجار شۆڕشێکی سیاسی بزوتنەوەی یەکسانیخوازی خێرا ئەکرد و هەندێکجاریش دوای ئەخست، بەڵام ئەم بزوتنەوەیە هیچکات ڕانەوەستا و هێواش هێواش یان بەشێوەیەکی لەناکاو پێشئەکەوت. بەپێچەوانەوە لەم وڵاتانەدا پێشکەوتن بەرەو ئازادی بەشێوەیەکی تر ڕوویدا و هەندێکجار نەک هەر وەستا بوو، بەڵکو بەجۆرێک گەڕایەوە دواوە کە گومانمان لەوە کرد بۆ هەمیشە سەرکەوتنی بەدەست هێنا بێت. ئێمە لە سەدەی بیستدا شایەتی ئەم دژایەتیە سەیرە بووین کە لە ناو دوو وڵاتی دراوسێدا– تەنانەت لە یەک وڵاتدا لە دوو قۆناغی جیاوازدا– دوو ڕژێمی سیاسی جێگیر بوون کە لە یەکێکیاندا ئازادی ئەوەندە گەشەیکرد کە لە مێژووی شارستانیتی مرۆڤدا بێوێنە بووە، لەوی تردا وا پاشەکشێی کرد کە وێنا نەئەکرا.

ئەم دوو جوڵەیە بەرەو ئازادی و یەکسانی، نە یەک مانایان هەیە و نە پاڵنەرێکی دەرونی یەکسانیان هەیە. بزوتنەوەی یەکسانیخوازی، کاری بەسەر گۆڕانی رۆحی تاکەکانی مرۆڤەوە نیە و تەنها داوای دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان ئەکات. لەکاتێکدا بزوتنەوەی ئازادیخوازی، سەربەخۆیی بیرکردنەوە و پەرەسەندنی کەسایەتی تاکی ئەوێت. هەوڵێکی لەم چەشنە زۆر ئەستەم و بەرهەمیشی زۆر هەستیار و ناسکە. هەر لەبەرئەمە ئارەزووی ئازادی، زۆر لاوازترە لە ئارەزووی یەکسانی کۆمەڵایەتی. لەمجۆرە بزوتنەوەیدا کە رەگەزی مرۆڤ لە کۆتوبەندی ڕابردوو ڕزگاری ئەبێت و دەستی بە بیرکردنەوەی سیاسی تازە ئەگات، سەرەتا چینە کۆمەڵایەتیەکان بە شوناسی خۆیان هوشیار ئەبن، ئەوکات هەر تاکێک هوشیار ئەبێت بە پێگەی چینایەتی خۆی و هەست بە نادادپەروەری ئەکات. بەڵام تێگەیشتن لەبەهای ئازادی و دیاریکردنی هەلومەرجی گەشەکردنی کەسایەتی تاکەکەس، پێویستی بە ئاستێکی فکری باڵاتر هەیە. لێرەوە بزوتنەوەی ئازادیخوازی لە چینی ڕۆشنبیر و بزوتنەوەی یەکسانیخوازی لەئاپۆرەی جەماوەرەوە سەرچاوە ئەگرێت. ئاپۆرەی جەماوەر هەمیشە سەرە ڕمی هێرشەکەیان ئاراستەی یەکسانی ئەکەن و تێگەیشتنیان بۆ ئازادی تەمومژاوییە و تەنانەت ڕەنگە بەتەواوی فەرامۆشی بکەن. بەڵام ئەوە ڕۆشنبیرانن پشکۆی ئارەزووی ئازادی بە گەشاوەیی ئەهێڵنەوە.

کەوابوو بە پێی ئەوەی براوامان وایە دیموکراسی لەسەر بناغەی ئازادی یان یەکسانی دامەزراوە، ڕووبەڕووی دوو چەمکی تەواو جیاواز ئەبینەوە. ئەم تەمومژاوی و ناکۆکیە لە پێناس و تیگەیشتنی ئێمەدا بۆ دیموکراسی، مەسەلەیەکی کۆنە. جیاوازیەک کە ئەمڕۆ وڵاتەکانی ڕۆژئاوا –بەتایبەتی ئینگلتەرا– لەگەڵ ڕوسیای بەلشەفی و وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتیدا هەیانە بۆ تێگەیشتن لە دیموکراسی، هەر لێرەوە سەرچاوە ئەگرێت.

دیارە پێناسکردن مەسەلەیەکی ڕێکەوتنە و ناکرێت هیچیەک لە بەکارهێنانەکانی وشەی دیموکراسی قەدەغە بکرێت، بەڵام بەبڕوای بەرجەستەترین بیریارانی ئەم قوتابخانەیە، چ یەکەم ئاڵاهەڵگرانی وەک ڕۆسۆ و کانت و چ بەرگریکارانی ئەم دواییانەی، ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم پێناسەیە چەمکی ئازادیە[1] نەک یەکسانی. کاتێک

١- ) بێگومان ڕۆسۆ چەمکی «یەکسانی»ش لەبەرچاو ئەگرێت، بەڵام لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا لە زۆر مەسەلەی هەستیاردا ئاماژە بۆ چەمکی ئازادی ئەکات و تەنانەت لە سەرەتای کتێبەکەدا ئەڵێت: «مرۆڤ ئازاد لەدایک ئەبێت، بەڵام لەهەموو شوێنێکدا دیلە» (کتێبی یەکەم، فەسڵی یەکەم). خاڵی سەرەکی کە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ پەیمانی کۆمەڵایەتی ئەیهێنێتەوە ئەمەیە «گەڕان بە دوای ڕەهەندیکی هاوبەشدا کە بە پێی ئەو هەر تاکێک لەگەڵ ئەوەشدا کە بەستراوە بەوانی ترەوە و بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆیەوە پەیرەوی ئەوانە، بتوانێت ئازاد بمێنێتەوە» (کتێبی یەکەم، فەسڵی شەشەم). تیۆرەی کانت زۆر لە دیموکرسی واقعیەوە دوورە، بەڵام بنەما فەلسەفیەکانی، لەڕووی لۆژیکیەوە بە دیموکراسی ئەگات. لەبەرئەوە ئەگەر کانت بە ئاڵا هەڵگرانی دیموکراسی نەزانین، هەڵەمان کردووە. بۆ کانت مەسەلەی ئازادی خاڵێکی سەرەکیە. لە «بنەماکانی میتافیزیکیانی مافدا» ئەنووسێت کە ئازادی مافی سەرەتایی هەموو مرۆڤێکە و لە خەسڵەتی مرۆڤەوە سەرچاوە ئەگرێت و یەکسانیش لەم مافەوە دیتە دەری. لەهەر کاتێکدا کە کانت ئاماژە بۆ پەیمانی کۆمەڵایەتی ئەکات، پەنا بۆ چەمکی ئازادی ئەبات: «ئەوەی ئەبێتە هۆی ئەوەی گەلێک وەک وڵاتیکی لێبێت... پەیمانی سەرەتاییە. بە پیی ئەم پەیمانە هەموان واز لە ئازادیە دەرەکیەکانی خۆیان ئەهێنن بۆ ئەوەی جارێکی تر وەک ئەندامی کۆمەڵگایەک بەدەستی بهێننەوە» (بەشی دوهەم، کتێبی حەوتەم). لە کەسانی دوایش هانری میشێل فەیلەسوفی فەرەنسی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردوودا ئەژیا ئەهێنینەوە. ئەو دەنووسێت: «یەکەم ئامانجی دیموکراسی ئازادیە (تیورەی سیاسی دیموکراسی) دیسان لە لاپەرە ٤٨ هەمان کتێبدا ڕەخنەی ئەو کەسانە ئەکات کە یەکسانی بە ئامانجی بنەڕەتیی دیموکراسی دائەنێن. کلسنیش کە یەکیکە لە گەورەترین تیۆریزانانی دیموکراسی لە سەدەی بیستدا ئەنووسێت: «لە ئایدۆلۆژیای دیموکراسیدا ئەوە مەسەلەی ئازادیە کە لە پلەی یەکەمدا دێت نەک یەکسانی» (La Demoocratie. P. ١٠٤).

ئاپۆرەی خەڵک بۆ ئامانجی دیموکراسی تێئەکۆشن، بیر لە ئازادی ئەکەنەوە، نەک یەکسانی. لە شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا ئاپۆرەی خەڵک بۆ ئازادی خەباتیانکرد و گیانی خۆیان خستە مەترسیەوە و بە پێی وتەی خۆیان جگە لە ڕزگارکردنی ئازادی مەبەستێکی تریان نەبوو. هەر بەم ناوەوە بوو کە جەنگی جیهانی دوهەمیان –کە ڕزگارمان بوو لێی– بەرپاکرد.

لێرەوە «یەکسانیخوازی» شکڵێکی سەرەتای و «ئازادیخوازی» باڵاترین شکڵی ئامانجی دیموکراسیە. ئامانجی دیموکراسی بەرهەمی فکری بژاردەکانی کۆمەڵگایە. کاتێک کۆمەڵگا ئامادەی باڵابونی کلتوری بێت، بیرکردنەوەی ئەم بژاردانە هێواش هێواش کاریگەری لەسەر تاکە ئاساییەکان ئەکات. بەڵام لەبەرئەوەی «ئازدیخوازی» پێویستی بە ئاستێکی فکری باڵا هەیە، ئازادیخوازان نابێت تەنها پشت بە هێزی خۆیان ببەستن، ئەوان کاتێک ئەتوانن کۆمەڵگا بگۆڕن و بە ئامانجی خۆیان بگەن، کە پشت بە ئارەزووەکانی یەکسانیخوازی، خەباتی خەڵکانی بێبەش لە دژی چینە باڵاکان ببەستن. تەنیا بزوتنەوەی یەکسانیخوازیە کە بۆ گۆڕانی کۆمەڵگایەک چ لە ڕێگەی شۆڕش و چ لە ڕێگەی گۆڕانی لەسەرخۆوە، هێزی پێویستی هەیە. هەر ئەم بزوتنەوەیە بوو کە شۆڕشی فەرەنسی دروستکرد. لەهەر کوێ دیموکراسی سەقامگیر بووە، پشتی بەم بزوتنەوەیە بەستووە. ئارەزووی ئازدیخوازی، ڕۆحی دیموکراسی و ماناکەیەتی، بەڵام یەکسانیخوازی ئەو پاڵپشتەیە کە دیموکراسی بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆی پشتی پێ ئەبەستێت.

کەوابوو لە دیموکراسیدا چەمکی ئازادی هاوڕێ لەگەڵ چەمکی یەکسانیدا گەشە ئەکەن. واتە ئەو ئازادیەی کە مەبەستی دیموکراسیە، ئازادیەکە بەشێوەیەکی یەکسان بۆ هەموان هەبێت. دیموکراسی ئەیەوێت ئیرادەی فەردی لەو بارانە ڕزگار بکات کە ئەسەپێنرێت بەسەریدا. دیموکراسی نەک تەنها ناکۆکە بە ڕژێمێکی سیاسی کە تیایدا تاکەکان یان چینە باڵاکان بەسەر کەسانی دیدا هەژمونیان هەیە، بەڵکو لەگەڵ ئەو ڕژێمانەشدا ناکۆکە کە تیایدا تاکەکەس لەژێر باری کۆمەڵگادا ورد ئەبێت، یان لەگەڵ کۆمەڵگایەکدا کە باری قورسی دابونەریت، هەلی هیچ داهێنانێک بە تاکەکان نادات. دیموکراسی بۆ لەناوبردنی ئەم سەپاندنانە، مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان، ئەکاتە ملکەچی ئیرادە فەردیەکان. ڕەهەندی دیاریکراوی دیموکراسی ئەوەیە کە تیاییدا هەموو بڕیارەکان بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پابەندە بە ڕای خەڵکەوە. بەگشتی لەهەموو دیموکراسیەکاندا بەهۆی گرفتی پراکتیکیەوە، شێوەی ناڕاستەخۆ ئەگیرێتە بەر، بەڵام ئەم ڕایانە ئەبێت بەو پەڕی ئازادیەوە ڕابگەیەنرێن. ئەگەر ئازادی بیروڕا زامن نەکرێت، چیدی دیموکراسیمان نابێت. نەک هەر بە بڕیاری پێویست و وەرگرتنی دەنگی نهێنیانە ئەم ئازادیە دابین بکرێت، بەڵکو ئەبێت ئازادی تەواو بۆ درووستکردن و گەشانەوەی بیروڕاکانیش دابین بکرێت: بەبێ ئازادی قەڵەم، دەربڕین، کۆبونەوە و حیزبە سیاسیەکان دیموکراسی بوونی نیە.

لە دیموکراسیدا هێزێکی سەرو تاکەکانمان نیە، ژیانی کۆمەڵایەتی بەرهەمی باڵاتربونی ئیرادە هەندێک نیە، بەڵکو کۆمەڵگا لە هاوئاهەنگی تاکەکان دروست ئەبێت کە خوازیاری ئەم هاوئاهەنگیەن، دیموکراسی بە پشتبەستن بە ڕەهەندی هاوبەشی ئیرادەی تاکەکان، زامنی ئازادی ئەکات.

پێدەچێت لە تیۆرەی دیموکراسیدا دژایەتی هەبێت، چونکە لەکوێ ئەم ڕەهەندی هاوبەشە هەیە، ئازادییش سنوردار بووە، چونکە بۆ بەدیهاتنی ئیرادەی گشتی، تاکەکان ناچارن بەشێک لە ئیرادەی خۆیان بکەنە قوربانی ئەم ئیرادە گشتیە. هەر تاکێک تەنها هیواداره ئەو ئەندازەیە لە خواستەکانی کە هاوبەشە لەگەڵ خواستی ئەوانی تردا قەبوڵبکرێت. لەبەرئەوە ئەچێتە ناو حیزبێکەوە، و هەر حیزبێکیش تەنها بەشێک لە خواستەکانی دابین ئەکات. لەلایەکی ترەوە دیار نیە ئیرادەی گشتی کە ئەبێت هەر کەس ئیرادەی تاکەکەسی و خەسڵەتە تایبەتیەکانی خۆی بکاتە قوربانی ئەم ئیرادەیە، ڕەنگدانەوەی سەرجەم واقع بێت، چونکە پاڵنەری هەنگاوەکانی دەوڵەت دابینکردنی ڕوانینی زۆرینەیە، واتە دیموکراسی ڕوانینی زۆرینە، بەسەر کەمینەدا ئەسەپێنێت.

لەبەر هەموو ئەمانە ڕرژێمی دیموکراسی، ئازادی مرۆڤ بەشێوەیەکی کەموکوڕ دابین ئەکات، بەڵام ئەبێت دان بەوەدا بنرێت کە ڕێگەیەکی باشتر لەمە نیە کە بکرێت بە سودوەرگرتن لێی، بە ئازادیەکی زیاتر بگەین. لەو ڕووە کە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، چالاکیەکانی بەستراوە بە هاوکاری ئەوانی دیەوە، کەوابوو ناتوانێت هەمیشە بە مەیلی شەخسی خۆی ڕەفتار بکات و پێویستە کە ڕەچاوی ئیرادەی گشتی بکات، تەنانەت گەر بەتەواویی ڕازیی نەکات. دیموکراسی لەبری ئەوەی تاکەکان بەشێوەیەکی دەربەست تەسلیمی نەریتە نەتەوەیەکان و ئیرادەی تاکەکەسێک بکات، زۆرترین ئازادی تاکەکەسی لە ژیانێکی کۆمەڵایەتیدا بەرهەم دێنێت. دیموکراسی تاکەکەس ناچار ئەکات واز لە بەشێک لە خواستەکانی خۆی بێنێت، بۆئەوەی لەگەڵ زۆرینەی خەڵکدا هاوئاهەنگ بێت، ئەم وازهێنانە پێداوسیتی ژیانی کۆمەڵایەتیە. بەمشێوەیە تاک بە بەشێک لە خواستەکانی خۆی ئەگات، دیموکراسی هەندیکجار تاکەکەس ناچار ئەکات بە تەواوی تەسلیمی ئیرادەی زۆریەن بێت، بەڵام لە کۆمەڵگایەکدا کە ڕوداوی فکری ناهاوئاهەنگی تێدایە و خواستەکان ئەوەندە ناکۆکبن بەیەک کە ڕازیکردنی هەموویان مەحاڵ بێت، ئەم ناچارکردنە کەمترین زیانی هەیە. بە دەربڕینێکی تر لە دیموکراسیدا ئیرادەی زۆرینە فەرمانڕەوایە و ئەم کۆتوبەندەی کەمایەتی سەبارەت بە زۆرینە، کەمترین سەپاندنە. تەنها ژمارەیەکی کەم ناچارن پەیڕەوی لەو یاسایانە بکەن کە قەبوڵیان نیە و ئەمەش زۆر کێشە نیە، چونکە ئەزانن کە زۆرینەی ئەمرۆ هەمیشە لەسەر کار نابێت و ڕەنگە ئەوانیش ڕۆژێک ببن بە زۆرینە، لەبەرئەوە ئەم تەسلیمبوون و ناچاریە بە کاتی ئەزانن[2]. لەو ڕووەوە کە زۆرینەی هەنوکە، ڕەنگە لە هەڵبژاردنی دوایدا تێکبشکێت، ئەوا ئەم زۆرینەیە هەوڵئەدات نەیارەکانی خۆی زۆر ناڕازی نەکات و بەشێک لە داوکاریەکانیان جێبەجێ بکات و بەمشێوەیە خۆی لە سنوردارکردنی ئازادیە تایبەتیەکان بپارێزێت. هەروەها زۆر بە دەگمەن بڕیار بۆ جێبەجێکردنی بەشە توندەکانی بەرنامەی حیزبی خۆی ئەدات و بەردەوام ئەو بەرنامانە جێبەجی ئەکات کە جێی سەرنجی حیزبە نەیارەکانیش بن. لێرەوە ئەبینین کە دیموکراسی

٢- بە پێچەوانەوە ئەگەر زۆرینە هەمیشە تایبەت بە گروپێکی دیاریکراو بێت، قەبوڵکردنی ئەم ملکەچیە زۆر سەختە. بۆ نمونە ئەگەر لەبری بیری سیاسی دینامیکی، ململانێی هەمیشەیی ڕەگەزی یان نەتەوەیی کۆمەڵگا دابەش بکات، ڕەگەز یان ئەو نەتەوەیەی لە کەمایەتیدایە هەست ئەکات ئەبێت بۆ هەمیشە ئەم ناچاریە قەبوڵبکات.

ڕژێمی پێکەوەژیانە. ئەندامی کەمینە هیوادارە کە ڕۆژێک سەربکەوێت. کەوابوو بە ئاشکراکردنی بیروڕای خۆی و هەوڵدان بۆ قەناعەتپێکردنی ئەوانی تر، یارمەتی ئەوە ئەدات کە ئامانجەکانی سەرکەوتوو بن. لە ڕژێمی دیموکراسیدا هیوا بە بردنەوە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا و توانای ئاشکراکردنی بیروڕا، ئەبێتە هۆی ئەوەی کە تاکەکەس خۆی بە بێ کارێگەر نەزانێت. بەمشێوەیە ئەزمون پیشانی ئەدات دیموکراسی سەرەڕای ئەو سنورداریێتیەی بۆ ئیرادەی تاکەکەسی دروستی ئەکات، فەزایەکی ئازاد دروست ئەکات.
قوتابخانەی دیموکراسی لەسەر بناغەی فەلسەفەیەکی ئەخلاقی دامەزراوە کە ئەیەوێت ژیانی کۆمەڵایەتی تا ئەو جێگەیەی کە شیاوە بە هاوئاهەنگی تاکەکان دابمەزرێنێت و بەمشێوەیە ڕێگەی ئیرادەی تاکەکان لە کۆمەڵگادا پڕ بەرهەمبکات. وەک هەندێک وتویانە قوتابخانەی دیموکراسی کۆمەڵگا بە دەرئەنجامی لۆژیکی هاوئاهەنگی خەیاڵی ئیرادەی تاکەکان نازانێت، بەڵکو بە تەواوی هوشیارە بەوەی کە هەر تاکێک پێش هەر پاڵنەرێکی لۆژیکی، لەژێر کارێگەری کۆمەڵێک دابونەریتی کۆمەڵایەتیدایە کە زەمینەسازی هەستەکانێتی. دیموکراسی ئەیەوێت بەرهەمی ئیرادەی تاکەکان لە کون و قوژبنی کۆمەڵگادا نفوز بکات، و بە دروستکردنی پەیوەندی بەهێز لە نێوانیاندا و سودوەرگرتن لە تواناکانیان، کۆمەڵگایەک دروستبکات کە لەسەر بناغەی یەکسانی نەک فشار و ناچارکردن دامەزراوە.

---

فەسڵی یەکەمی ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە

روژە لاکۆمب: بحران دیموکراسی. ترجمە: نور علی تابندە. تهران، باخ نو، ١٣٨٢

# وتوێژی رامین جهانبگلو لەگەڵ ئیزایا بەرلین

وەرگێرانی: سەردەم

## دوو چەمکی ئازادی

*** ئێستا کە باسی ئازادی ئەکەین، ئایا ئەکرێت جیاوازی نێوان ئازادی نێگەتیڤ و ئازادی پۆزەتیڤمان بۆ باسبکەیت؟**

– ئێمە لەبەردەم دوو پرسیاری جیاوازداین. یەکێکیان ئەوەیە کە چەند دەرگا بە ڕوومدا کراوەتەوە؟ ئەوی تر ئەوەی چ کەسێک پاسەوانی ئێرەیە؟ چ کەسێک چاودێرە؟ ئەم پرسیارانە تێکئالاون، بەڵام یەک شت نین، و پێویستیان بە وەڵامی جیاواز هەیە. چەند دەرگا بە ڕوومدا کراوەتەوە؟ پرسیارێکە لەبارەی سنوری ئازادی نێگەتیڤەوە – چ ڕێگرێک لەبەردەمایە؟ واتە ئەوەی کەسانی دی ڕێگە نادەن ئەنجامیبدەم — چ بە ئەنقەست، چ ناڕاستەوخۆ، چ سەرڕۆیانە و چ دەزگایانە.

پرسیارێکی تر ئەوەیە کە چ کەسێک فەرمانم بەسەردا ئەکات؟ ئایا کەسانی تر فەرمانڕەوای منن یان خۆم فەرمانرەوای خۆمم؟ ئەگەر کەسانی تر بە چ هەقێک و بە چ پاساوێک؟ ئەگەر من مافی ئەوەم هەبێت فەرمانرەوای خۆم بم، سەربەخۆ بم، ئایا ئەتوانم ئەم مافە لە دەست بدەم؟ ئەتوانم وازی لێبێنم؟ فەرامۆشی بکەم؟ یان بیدۆزمەوە؟ بە چ ڕێگەیەک؟ چ کەسێک یاساکان دائەنێت، و بەکاری ئەهێنێت؟ ئایا لایەنی راوێژکارم؟ ئایا زۆرینە حکومەت ئەکات، یان خوا؟ یان قەشەکان؟ یان حیزب؟ یان فشاری ڕای گشتی؟ یان نەریت؟ ئەمە پرسیارێکی جیاوازە. هەردوو ئەم پرسیارە و پرسیارە لاوەکیەکانی تر، بنەڕەتین و ڕاستن و ئەبێت وەڵام بدرێنەوە. ڕەنگە ڕەخنە لە من بگیرێت بۆ بەرگریم لە ئازادی نێگەتیڤ لەبەرامبەر ئازادی پۆزەتیڤدا کردووە،

و بگوترێت کە ئـازادی پۆزەتیڤ شارستانیترە. هۆی ئەمە ئەوەیە کە بەڕاست بروام وایە ئازادی پۆزەتیڤ کە بۆ ئاسایشی ژیان پێویستە، زۆربەیجار زیاتر لە ئازادی نێگەتیڤ توشی لادان و گەندەڵی و دارمـان بووە. هـەردوو پرسیارەکە بنەڕەتیە و ناکرێت چاو لە هیچیان بپۆشین، وەڵامدانەوەی هەر یەکێکیان، خەسڵەتی ئەو کۆمەڵگایە دیاری ئەکات - چ کۆمەڵگایەکی ئازاد بێت یان دیکتاتۆری، چ دیموکراتی بێت یان ستەمکاری، چ عەلمانی یان دینی، چ تاکەکەسی یان سوشیالیستی و شێوەکانی تر. بەڵام هەردوو ئەم چەمکانە لە ڕووی سیاسی و ئەخلاقیەوە هەڵگەڕاونەتەوە بۆ چەمکە دژەکانیان. جۆرج ئۆرێل ئەم خاڵەی زۆر بە باشی پیشان ئـەدا. کەسانێک ئەڵێن: من دەربـڕی ئـارەزووە ڕاستەقینەکانی ئێوەم. ڕەنگە ئێوە بزانن چیتان ئەوێت، بەڵام من، ڕابەر، یان ئێمە، کۆمیتەی حیزبی کۆمینیست ئێوە باشتر لە خۆتان ئەناسین، و ئێمە پێداویستیە ڕاستەقینەکانتان- کە ئەگەر ئەتانزانی بێگومان خوازیاری ئەبوون - بە ئێوە ئەدەین. ئـازادی نێگەتیڤ کاتێک قڵپ ئەبێتەوە کە بڵێن ئازادی گورگ و مەڕ یەکسانە، و ئەگەر دەسەڵاتی نـاچـارکـەرانـەی دەوڵـەت تـێـوەردان (تـەدەخـول) نەکات، گورگەکان، مەڕەکان ئەدرن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ڕێگری لە ئـازادی بکرێت. دیارە ئازادی بێسنوری سەرمایەداران، ئازادی کرێکاران لەناو ئەبات، ئازادی بێسنوری کارخانەداران، یان باوکان و دایکان ئەبێتە هۆی بەکارهێنانی منداڵان لە کانەکانی خەڵوزدا. گومانی نیە کە ئەبێت بێهێزەکان لە بەرامبەر بەهێزەکاندا بپارێزرێن، و ئـازادی بەهێزەکان تا ئەم ئاستە کەم بکرێتەوە. هەرکاتێک ئازادی پۆزەتیڤ بـەڕادەی پێویست، بەدی بێت، ئەبێت لە ئازادی نێگەتیڤ کەم بکرێتەوە. ئەبێت لە نێوان ئەم دوانـەدا هاوسەنگیەک هەبێت، بۆ ئەوەی نەکرێت هیچ بنەمایەکی سەلمێنراو بە لاڕێدا ببرێت. ئازادی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ هەردووکیان بەتەواوی دوو چەمکی بایەخدارن. بەڵام هەستئەکەم





ئیزایا بەرلین

لە رووی مێژووییەوە ئەو زیانەی لە ئازادی پۆزەتیڤی درۆزنانەوە لە دنیای ئێستادا کەوتۆتەوە، زۆرترە لە ئازادی نێگەتیڤی درۆزنانە. دیارە ئەمە جێگەی وتوێژە. بنجامین کۆنستان — بیریاریک کە زۆر ڕێزم بۆی هەیە، لە وتارێکدا بەناوی «ئازادی دێرین بە بەراورد بە ئازادی مۆدێرنەکان» باشتر لەهەر کەسێک کە ئەیناسم، باسی ئەم مەسەلەیە، واتە دوو جۆر ئازادی کردووە.

*** پرسیارەکەی من ڕێك ئەمە بوو. هەڵوێستی ئێوە لە وتوێژی نێوان کۆنستان و ڕۆسۆ لەبارەی ئازادی کۆن و ئازادی تازەوە چیە؟**

- من هاوڕای کۆنستانم. کۆنستان ئەڵێت دوو جۆر ئازادی هەیە. ئەو بەهای ئازادی بەو شێوەیەی کە لە ئەسینای دێریندا تێیئەگەیشتن، نەفی ناکات. ئازادی لای ئەسینایییەکان بەو مانایە بوو کە هەر کەسێک بتوانێت لە ئەنجومەنی نوێنەراندا شکات لەوی تر بکات. هەرکەسێک ئەیتوانی بچێتە خانوی ئەوی ترەوە. هیچکەس ڕێگە نەئەدرا ڕێ لە شکاتی هیچ کەسێکی تر — چەند ئەو شکاتە هیچ و پوچ بوایە— لە ژن یان پیاوێکی تر لە دادگا یاساییەکان بگرێت، یان ڕێگە نەدات کە تاکەکەس لەبەردەم خەڵکدا بە ئازادانە قسە بکات یان ڕەخنە بگرێت، هەرچەند کە نارەحەتیش دروستبکات. بەڵام چەمکی تازەی ئازادی تارادەیەک ڕێگەی ژیانی تایبەتی بە ئێوە ئەدات. ژیانی تایبەتی چەمکێکە کە لە سەردەمی دێرین یان لە بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بوونی نەبوو. باسکاڵ ئەیگووت «هەموو بەڵاکانی دنیا دەرئەنجامی ئەوەیە کە مرۆڤ لە ژوورێکدا بە ئارامی دانانیشێت». ئازادی تازە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم مافە.

*** بەڵام ئەمە ئازادی تایبەتیە نەك ئازادی گشتی؟**

- بەڵێ. بەڵام بەکارهێنانی بێ چەندچونی هەر یەکێک لەم دوو ئازادیە، ئەوی دی لەناو ئەبات. دیارە چەمکی ژیانی تایبەتی چەمکێکی تازەیە، تازەتر لەوەی دەرئەکەوێت. چەمکی نوێ، ئامانجی نوێ دروستئەکات. بۆ نمونە چەمکی هاوڕێیەتی لەبەرچاو بگرن. تا ئەو شوێنەی من ئەزانم هاوڕێیەتی لە سەردەمی دێریندا و تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە فەزیڵەت نەئەزانرا. بەڵام هەقیقەت بەڵی. شایەتیدانیش زۆر بە نرخ ئەزانرا، بەڵام شایەتی لە پێناوی هەقیقەتدا، نەک شایەتی لەسەر بناغەی بیروڕای درۆزنانە، یان بیروڕای نا یەقینی. هیچ یەهودی یان مەسیحیەک بیرناکاتەوە کە ئەوەی کافرەکان ئەیپەرستن، لە ڕاستیدا درۆیە، بەڵام ناکریت ئافەرینی ئەو ڕاستگۆیە نەکرێت کە بناغەکەی بیروڕای درۆیە. هیچ یەک لە خاچپەرستان نەیانئەوت کە بیروڕای موسڵمانەکان بێ بناغەیە، بەڵام لەو ڕاستگۆیییەی کە ئەبێتە هۆی ئەم فیداکاریە نابەجێیە، بەناچار توشی هەژان ئەبیت. هیچ کاسۆلیکێک بە درێژایی جەنگە مەزهەبیەکان نەیگوت پرۆتستانتەکان فێرکاری ترسناکی شەیتانن کە ڕۆحی مرۆڤەکان گەندەڵ ئەکات، و خەڵکانی ترسناکن کە ئەبێت لەبەرامبەریدا ڕابوەستین و ئەگەر پێویست بکات لەناویان بەرین، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کەسانێک کە ئەمجۆرە بیروڕایانەیان بڵاو ئەکردەوە، لەبەر پارە یان دەسەڵات یان بێ هۆ نەبوو، بەڵکو تەنها لەبەر بڕوایەکی ڕاستەقینە بوو، لەبەرئەوە بوو کە بڕوایەکی پتەویان بەوە هەبوو کە ئەیانگوت و ئامادەبوون لە پێناوی بیروڕا ترسناکەکانی خۆیاندا بمرن. ئەبێت ڕێز لەم ڕاستگۆییە بگیرێت. تەنها هەقیقەت گرنگ بوو. من

گومانم هەیە چەمکی ڕاستگۆیی تا پێش کۆتاییەکانی سـەدەی حەڤدە بە فەزیڵەت بژمێرایە. تەنانەت هەڵەیان لەسەر بناغەی ڕاستگۆیی بە مەترسی دائەنا و هیچ بەهایەکی ئەخلاقی و ڕۆحیان بۆ دانەئەنا. لە باشترین حاڵەتدا بەزەیی ئەوروژاند. هەمەڕەنگیش چەمکێکی تازەیە. وێنای کۆن ئەوەیە هەقیقەت یەکێکە و هەڵەش زۆر. بۆ هەر پرسیارێکی ڕاستەقینە ئەکرێت یەک وەڵامی ڕاست هەبێت، وەڵامەکانی تر بەناچار ڕاست نین. ئەو بیرۆکەیەی کە هەر پرسیارێک دوو ڕەهەندی هەیە و ڕەنگە دوو وەڵام یان چەند وەڵامی نەگونجاو بە یەکی هەبێت، و هەریەک لەو وەڵامانەش ڕەنگە جێی ڕەزامەندی کەسانی شەریف و عاقڵ بێت، چەمکێکی زۆر تازەیە. هەندێک کەس وا ئەزانن کە پریکلیس لە وتاری بەناوبانگی ناشتندا قسەیەکی وای کردووە. پریکلیس لەم چەمکە نزیک بۆوە، بەڵام پێی نەگەیشت. ئەگەر دیموکراسی ئەسینا باش بێت، کەوابوو سپارتا یان ئێران ناتوانن باش بن. یەکێک لە باشیەکانی کۆمەڵگای ئازاد ئەوەیە کە هەلی دەرکەوتن بە ژمارەیەکی زۆری بیروڕای ناکۆک بەیەک بە بێ فشار ئەدات. ئەمەش بێگومان تا ڕادەیەک لە ڕۆژئاوادا تازەیە.

## یەکسانی و ئازدی

*** کێشەی سەرەکی شۆڕشی فەرەنسی ئەوەبوو کە ئەم شۆڕشە بە دوو دروشمی ئازادی و یەکسانی دەستی پێکرد و پاشان بە تیرۆر و تۆقاندن گەیشت. ئایا بە بڕوای ئێوە ئەکرێت ئازادی و یەکسانی پێکەوە کۆبکەینەوە؟**

– بێگومان ئەکرێت پێکەوە کۆببنەوە. بەڵام شێوە توندڕەوەکانی ناکرێت. ئەگەر ئازادی تا دوا سنور بێت، بەهێز ئەتوانێت بێهیز لەناو ببات، ئەگەر یەکسانیش ڕەها بێت، ئەوا ئازادی نامێنێت. چونکە ئەگەر بتەوێت گورگەکان مەڕەکان نەخۆن، ئەبێت ڕێگە لە گورگەکان بگریت.

*** من زۆر سەرسامم بە وتاری «یەکسانی» ئێوە. چونکە دەگمەنن ئەو لیبرالانەی کە باسی ئەم بابەتەیان کردبێت؟**

– ئەزانم.

*** تێڕوانینی ئێوە بۆ «یەکسانی» چیە؟**

– ئەم پرسیارە گشتیە. یەکسانی هەمیشە بابەتێکی تایبەتە. نمونەیەک ئەهێنمەوە: ئەگەر دە مناڵتان هەبێت و بتانەوێت بە هـەر یەکێکیان پارچە شیرینیەک بدەن. ئەگەر بە یەکێکیان دوو پارچە بدەیت و بێ هیچ هۆیەک هیچ بە یەکێکی تر نەیەت، ئەوا بنەمای یەکسانیتان پیشێل کـردووە. مانای «بێویژدانی» هەر ئەمەیە.

*** وا باوە کە لیبرالیسم و یەکسانی پێکەوە کۆناکرێنەوە**

– لە ڕووی مێژووییەوە هەموو شتێک ڕوو ئەدات و یەکسانی ڕەهاش بەمانای سڕینەوەی ئازادی ئەو تاکانەیە کە لەوانی تر لەسەرترن. پێمگوتی کە ئەو ئەنارشیسمە مەزنە – باکۆنین– بڕوای بە یەکسانی هەبوو و ئەیویست دەرگای زانکۆکان دابخات، چونکە (پێیوابوو) بەرهەمی زانکۆکان ڕۆشنبیران بوون و لە کۆمەڵگادا لەسەرەوە بوون و ڕەنگە فەخر بەوانی تر بفرۆشن. یەکسانیخوازیش هاوڕێی ستەمکاریە. لە سەرەتاکانی حکومەتی یەکێتی سۆڤیەتدا، هەندێک لە ئۆرکستراکان ئەیانویست کە ڕابەرانی ئۆرکسترا



ئیزایا بەرلین

لاببەن، چونکە دژی هەموو جۆرێکی دەسەڵات بوون. ئازادی ڕەها ئەتوانێت ترسناک بێت و یەکسانی ڕەهاش تۆقێنەر.

*** بۆچی وا بیرئەکەنەوە کە ئازادی ئەم چۆنایەتیە تایبەتە پارادۆکسەی هەیە؟ و ئایا جیاکردنەوەی دوو چەمکی ئازادی، ئەم پارادۆکسە لەناو ئەبات؟**

- من دوو چەمکی ئازادیم تاوتوێکرد. بەڵام زیاد لە دوو چەمک هەیە. جگە لەمە من تەنها لەبارەی ئازادی سیاسیەوە نووسیومە، نەک ئازادی بەشێوەی گشتی. هەستئەکەم ئازادی شتێکە کە هەموو خەڵک خوازیارین، لێرەوە هەموو شتێکی داواکراو لە ژێر ئەم ناونیشانەدا ئەهێننەوە و هەوڵئەدەن ئازادی بەمانای هەموو ئەو شتانە بێت کە حەزیان لێیە. ئەم تێگەیشتنە بۆ ئازادی ورد نیە و ئاڵۆزیەکی ترسناک لە بیرکردنەوەدا دروست ئەکات.

*** ئایا لەبەر ئەمەیە کە دوو چەمکی ئازادیت لەیەك جیاکردەوە؟**

- خەڵک باسی ئازادی سیاسی، ئازادی ئابوری، ئازادی کۆمەڵایەتی، ئازادی ئەخلاقی، ئازادی میتافیزیکی و لەم بابەتە شتانە ئەکەن. مەسەلەکە ئەوەیە ئەم ئازادیانە لەیەک جیاوازن. لەهەندێک ڕووەوە لەیەک ئەچن و لە هەندێک ڕووی ترەوە لەیەک جیاوازن. ئازادی لە سەدەی نۆزدەدا زۆرتر بەمانای ئازادی کۆمەڵایەتی و سیاسی بوو. لە سەدەی بیستدا ئاڵۆزتر بوو، لەبەرئەوەی ئابوری ئاڵۆزتر بوو، هەروەها تێگەیشتنی ئێمە بۆ مێژوو گۆڕانی بەسەردا هات. ئێستا کەس نازانێت کە وشەی ئازادی بەوردی چ مانایەکی هەیە. یان پەیوەندی ئازادی A لەگەڵ ئازادی B و لەگەڵ ئازادی C و لەگەڵ ئازادی D دا بە وردی چیە؟ بە زیادبوونی زانین گرفتی وەڵامدانەوەیەکی ڕوون زیادی کرد. من جیاکاری لە نێوان دوو چەمکی ئازادیدا ئەکەم، چونکە هەردووکیان بەکارهێنراوە و بە بڕوای من لەیەک جیاوازن. پرسیاری جیاواز، وەڵامی جیاوازی هەیە و خەڵک تێکەڵیان ئەکەن. لەگەڵ ئەوەدا کە لادان لە هەردوو ئازادیەکە دەرئەنجامی نەخوازراوی هەبوو، بەڵام لە ڕووی مێژوویەوە یەکێک لەم دوو لادانە توندوتیژی زیاتری لێکەوتۆتەوە. بە بڕوای من ئازادی پۆزەتیڤ لادانێکی کارەساتبارتری لە ئازادی نێگەتیڤ هەبوو. بەڵام نایشارمەوە کە ئازادی نێگەتیڤیش تا دوا سنوری «ئازاد هێشتن» لایداوە کە لە دەرئەنجامدا بێدادی و ڕەنجی ترسناکی بەرهەمهێناوە. دان بەوەدا ئەنێم کە خراپ بەکارهێنانی بەدکارانەی وشەی ئازادی، لە وڵاتە تۆتالیتارەکاندا کاریگەری زۆری لەسەرم هەبووە. وڵاتە تۆتالیتارەکان خۆیان بە نیشتمانی ئازادی ڕاستەقینە لە قەڵەم ئەدا. ئەمەش کاریکاتۆری وشەی ئازادیە. کەوابوو بە خۆم گوت ئەبێت کارێک بکرێت. ڕەخنەگرانی چەپی من هیچ حەزیان لەم کارەی من نەبوو. بەهەرحاڵ ئەوەی تا هەنووکە نووسیومە لە هەردوو ڕووەوە، لە چەپ و ڕاستەوە، بە توندیەکی یەکسان ڕەخنە کراوە.

*** بەڵێ وتاری «دوو چەمکی ئازادی» لە لایەن ڕەخنەگرانەوە هێرشی کرایە سەر. هەروەها وتارێکی ترتان «حەتمیەت لە مێژوودا». بەڵام بەڕاستی چی بووە هۆی ئەوەی کە ئەم وتارە بنووسن؟**

- بانگهێشت کرام لە ساڵیادی ئۆگست کۆنتدا کە لەلایەن کۆمەڵەی پۆزتڤیسمەکانەوە بەڕێوەچوو،

وتارێک پێشکەش بکەم. بیرم لەوە کردەوە باسی حەتمیەت بکەم لە مێژوودا. بە بڕوای من کاتێک کەسانێک ئەڵێن: «من لە مێژوودا کار ئەکەم- یان ئەبێت ئەمە یان ئەوە بکەین لەبەرئەوەی مێژوو وای ئەوێت یان چین یان نەتەوە، چونکە ئەو شەقامەی پیایدا ئەڕۆین جۆریک شارێگەی پێشکەوتنە، و ئەوەش مێژووە کە ئێمە لەم ڕێگەیەدا ئەباتە پێشەوە، کەوابوو هەرچیەک هاتە سەر ڕێگەمان، ئەبێت لاببرێت». کاتێک لەم چوارچێوە زیهنیەدا گرفتار بوون، مافی مرۆڤ و بەهاکانی، ئەخەنە ژێر پێوە. پێویستە بەرگری لە مەسەلە سەرەکیەکانی مرۆڤ لە بەرامبەر ئەم بیروڕا ئاژاوەگێڕ و زۆرجار دەمارگیرانەدا بکرێت.

*** هەر لەبەر ئەمەیە ئێوە پێتانوایە پێوستی لەگەڵ بەرپرسیاریدا کۆ نابێتەوە؟**

– بەڵی کۆ نابنەوە. ئەگەر هۆی ئەو کارەی ئەیکەن مێژوو بێت، چۆن تۆ ئەتوانیت بەرپرسیار بیت؟ بە بڕوای من ئەمە «عەشقی ئەبەدی» نیتچەیە. کاتێک بـژاردەی ئەخلاقی لە ئـارادایـە، و ئێوە لەسەر پلەیەکی دینامیکی ڕاوەستـاون کە بە ئاستێکی دیاریکراو ئەجوڵێت و ڕووی ناگۆڕێت، و ئێوەش عەقڵ و ئامانج و ئەخلاقی خۆتان لەگەڵ ئەم جوڵەیەدا گونجاندووە، ئیتر بەرپرسیارێتی چ مانایەکی هەیە؟ بەڵام من بڕواموایە کە ساتەوەختی وا لە مێژوودا دێتە پێشێ کە تاکەکان و گروپەکان ئەتوانن ئاراستە(ی شتەکان) دیاری بکەن، نەک ئەوەی هەموو شتیک بتوانرێت پێشبینی بکرێت، بەڵام مرۆڤەکان لە سنورێکی تەسکدا بکەری ئازادن. سنوردارێتی هەیە، بەڵام تەنانەت لە هەمان سنوردا فەزایەک بۆ بـژاردن هەیە. تا هەڵبژاردن نەبێت کاری مرۆیی نابێت. هەموو شتیک ڕەفتارە، ڕێگەم بدەن نمونەیەکتان بۆ بهێنمەوە؛ هەستئەکەم گەر چەرچل سەرەک وەزیرانی ئینگلتەرا نەبوایە، ڕەنگ بوو نازیەکان ئەوروپا داگیر بکەن. بێگومان لەم حاڵەتەدا مێژووی ئەوروپا زۆر جیاواز ئەبوو، لەگەڵ ئەوەی مارکس پێشبینی ئەکرد. یان ئەگەر لینین لە نیسانی ١٩١٧دا بکوژرایە، شۆڕشی بەلشەفی لە ئـارادا نەبوو، ڕەنگە شەڕی ناوخۆ لە ڕوسیا ڕوییدایە و لیبرال و سوسیالیستەکان ڕووبەڕووی سەڵتەنەتخوازان ببونایەوە. بەڵام ڕژێمی بەلشەفی بێ لینین بونیاد نەئەنرا. ترۆتسکی نەیئەتوانی ئەو کارە بکات، چونکە ترۆتسکی یەهودی بوو و دیکتاتۆری یەهودیش لەوکاتەدا بەهیچ شیوەیەک وێنا نەئەکرا. کەوابوو خاڵی وەرچەرخان لە مێژوودا هەیە و تاکەکان لەم خاڵانەدا هەندێکجار ئاراستەکە ئەگۆڕن.

*** هەستئەکەم لەنێوان بیرۆکەی ئێوەدا بۆ ئازادی و بیرۆکەی ئێوەدا بۆ مێژوو، پەیوەندیەك هەیە؟**

– باشە گەرچی من فـرەگـەرم، بـەڵام بەداخەوە جۆرێک لە یەکێتی لە بیرکردنەوەی مندا هەیە. هەموو ئایدیاکانم پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە و هیچ کامیان لەوی تر جیا نین.

*** ئەگەر لە هەڵبژاردنەکان و ئامانجەکانی خۆتاندا ئازاد نەبونایە، ژیان بۆ ئێوە مانایەکی نەئەبوو...**

– بەڵی. بەڵام لەبیرتان نەچێت کە سنور هەیە. سروشتی شتەکان سنوردارمان ئەکات. هەڵبژاردنێکی زۆرمان نیە. گریمان یەک لە سەد نەک زیاتر، بەڵام هەمان یەک لە سەد ئەبێتە هۆی زۆر جیاوازی.


ئیزایا بەرلین

*** ئایا کاتێك باسی سنور ئەکەن مەبەستان تیۆرەی یاساکانە؟**

– ئەڵبەتە یاساکانی سروشت، یاسا فیزیاییەکان، یاساکانی کیمیا، زەویناسی، ئاو و هەوا، هەموو ئەو شتانەی مۆنتیسیکۆ باسیکردون، نەک یاسا مرۆییەکان. یاساکان ئەکریت بگۆڕدرێن. بەشێوەی گشتی ناتوانم پێتان بڵێم ئەم سنورانە کامانەن. ئەگەر ئێوە بتوانن دۆخی تایبەت و هەلومەرجی مومکین لەو دۆخەدا بهێننە ئاراوە، منیش ڕەنگە هۆکارە سنوردارکەرەکان پیشان بدەم.

*** ڕێگەم بدەن چەند ساتێك بگەڕێینەوە بۆ چەمکی ئازادی. ئایا هەست ئەکەن کە لەنێوان ئازادی و هاوڵاتیدا پەیوەندیەکی زەروری هەیە؟ مەبەستم ئەوەیە کە بۆ ئازادبوون ئایا ئەبێت هاوڵاتی بیت. وەك یۆنانیەکان بیریان ئەکردەوە؟**

– بەڵی ئەڵبەتە. بەمەرجێک ڕەواقیەکان و پاشان ئەنارشیسمەکان ئەژمێر نەکەین کە دەوڵەت و دوای ئەمیش هاوڵاتیان ڕەد ئەکردەوە. یۆنانیەکان بڕوایان بە یاساکان هەبوو. هیرۆدۆت بڕوای بە «ئیزومنیا» بەمانای یەکسانی لەبەرامبەر یاسادا هەبوو– واتە ئازادبوون لە دەستدرێژی فەرمانڕەوا سەرەڕۆکان. تەنانەت «ستەمکارکوژەکان» لە سەدەی یەکی میلادیشدا هەمان بڕوایان هەبوو. بڕوای منیش هەروایە. بێ ڕێسای گشتی، ناتوانرێت تاکەکان لە بەدکاری ستەمکاری و ئاژاوە بپارێزرێت. بێگومان ئازادبوونی ڕەها لە یاساکان واتە ئاژاوەی ڕەها. هەروەها بڕواموایە ئازادی واتە نەبوونی ڕێگرەکان، بەڵام جۆرێک لە چاودێری بەسەر ئازادیەوە پێویستە، و ئەمەش خۆی دروستکردنی ڕێگرەکانە.

بەهەرحاڵ من لایەنگری باکۆنین یان کروپۆتکین نیم و پڕوپاگەندە بۆ ئازادی ئەنارشیستی ناکەم. بێ بوونی هێزی ڕێگریلێکەر، ئاشتی و ئارامی لە ئارادا نابێت و ئێمە یەکتر لەناو ئەبەین. بۆ نمونە مرۆڤێکی تەنیا لە یەک دورگەدا وەک ڕۆبینسۆن کرۆزۆ بەتەواویی ئازادە، تا ئەو کاتەی جومعە ناوێک پەیدا ئەبێت. لەدوای ئەمەوە ئەرکی دوولایەنە دەست پێئەکات و مەسەلەی سەپاندن دێتە پێشێ. وەک زۆربەی دۆخەکان لێرەشدا کانت ڕاست ئەکات: ڕەنگە باڵندە وابزانێت کە لە بۆشاییدا ئازادانەتر ئەفرێت، بەڵام وا نیە، ئەکەوێتە خوارەوە. کۆمەڵگا بەبێ دەسەڵاتیکی ڕێژەیی و ئازادیەکی سنوردار، بوونی نامێنێت.

*** کەوابوو ئایا لەگەڵ ئەو قسەیەی باکۆنیندا نیت کە ئەڵێت: «من بە ئازادبوونی ئەوانی تر، بەڕاستی ئازاد ئەبم»؟**

– زۆر کەس ئەم قسەیەیان کردووە. لە ڕوویەکەوە بێمانا نیە، تەنها مانای ئەوەیە ئەگەر کەسانێک ئازاد نەبن، ئازادی ئەوانی تر کەموکوڕ ئەبێت. لە کۆمەڵگای کۆیلایەتیدا خاوەن کۆیلەکان تا ئەوکاتەی کۆیلەیان هەیە، ئازاد نین. چونکە کۆیلایەتی ژیانیان گەندەڵ ئەکات. بە گشتی دەسەڵات مرۆڤ بۆ گەندەڵی ڕائەکێشیت. «ئاکتن» ڕاستی ئەکرد کە ئەیگوت: «ئازادی دیموکراتی، دابەش ناکرێت».

*** ئایا هاوڕان لەگەڵ چارلز تایلەر کە ئازادی نێگەتیڤ وەك «چەمکی هەل» تەماشا ئەکات؟**

– لەهەندێک ڕووەوە بەڵێ. ڕادەی ئازادی نێگەتیڤ بەو مانایەیە کە چەند دەرگا بە ڕوومدا کراوەتەوە؟ ئەمەوێت لێیەوە تێپەڕم یان نا؟. ئەگەر ئەمە ناو

ئەنێن «هەل» بەڵێ ڕاستە. بەڵام ئازادی نێگەتیڤ بەتەنیا بەس نیە، چونکە بەهای تریش لەئارادایە، ئەو بەهایانەی کە بێ بوونیان، ڕەنگە ژیان شایستەی ئەوە نەبێت تیایدا بژین. من دوا کەس ئەبم کە نەفی ئەکەم. ئازادی لەبەرئەوەی پێویستی بە نیازە بنەڕەتیەکانی ترە، وەک ئاسایش، خۆشبەختی، دادپەروەری، ڕێکخستن، پەیوەستبونی کۆمەڵایەتی و ئاشتی، ئەوا ئەبێت سنوردار بێت. هەندێک لە شێوەکانی ئازادی ئەبێت سنوردار بێت، بۆ ئەوەی فەزایەک بۆ ئامانجە کۆتاییەکانی تری مرۆڤ بکرێتەوە. ئەم مەسەلەیەش وەک مەسەلەکانی تر پەیوەستە بەو دانوستانەی کە کۆمەڵگایەکی شایتەی مرۆڤ دروستی ئەکات.

*** کەوابوو ئازادی نێگەتیڤ چۆن ئەتوانێت کار بکات؟**

– ئەتوانێت کار بکات، چونکە نەبوونی پەشۆکاوی ئەهێنێت. ئازادی نێگەتیڤ واتە لادان یان نەبوونی ئەو ڕێگرانەی کە بۆ دەستگەیشتن بە بەها بنەڕەتیەکانی تری مرۆڤ پێویست نین. بێ ئەم ڕێگرانە و ئەگەری سەپاندنیان لەکاتی پێویستدا، بە پێچەوانەی ڕای «گادوین» و «کرۆپوتکین» و «ئەلیزە رکلۆ»وە ناتوانرێت سود لە ئاسایشی کۆمەڵایەتی و تایبەتی و لە دادپەروەری و بەختەوەری و زانین وەربگیرێت. بەڵام ئازادی نێگەتیڤیش بەوشێوەیەیە کە نەبوونی، بەهاکانی تر ئەڕوخێنێت، چونکە ئیتر هەلێک دەست ناکەوێت کە بەهاکان بەکار بهێنرێن. لە ئەنجامدا ئەگەر هەلەکان نەبوون، کۆمەڵە بەهاکان هەمەڕەنگ نەبن، ئیتر ژیان نامێنێت.

....

**سەرچاوە:**

ئیزایا برلین: در جست و جوی ازادی. مصاحبەهای رامین جهانبگلو با ئیزایا بەرلین. ترجمە: خجستە کیا. نشر گفتار. تهران ١٣٧١

# گفتوگۆ

## گفتوگۆ لەگەڵ تاهیر بن جەللون

سازدانی: سەعیدە شەریف
و. لە عەرەبییەوە: سەردەم



تاهیر بن جەللون

نووسەری مەغریبی تاهیر بن جەللون، بەناوبانگترین نووسەری مەغریبییە کە بە زمانی فەرەنسی دەنووسێ و لە هەموویان زیاتر بەرهەمی هەیە و لە هەموویان زیاتر لە ئەورووپا و لە مەغریبیدا دەخوێنرێتەوە. هەروەها لە هەمانکاتدا، لە هەموو نووسەرەکانی دیکە زیاتر جێگای مشتومڕ و ڕەخنەلێگرتنە، ئەمەش بە هۆی دیدگا و بیروڕاکانییەوە کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارە فەرەنسییەکاندا بڵاویاندەکاتەوە.

(الشرق الاوسط) لە مەغریب چاوی بە بن جەللون کەوت کە هاتبوو کۆمەڵە چیرۆکی (غراميات ساحرة) پێشکەش بکات، ئەو لەم چاوپێکەوتنەدا بێ دوودڵی قسە لەسەر چەندین مەسەلەی ڕۆشنبیری و سیاسی دەکات کە لەگەڵیدا وروژاندمان، لەوانەش ڕووداوەکانی ئەم دواییەی (الدار البيضاء)

*تۆ سەر بە نەوەی دووەمی ئەو نووسەرە مەغریبییانەی کە بە زمانی فەرەنسی دەنووسن و بەرهەمێکی زۆرت لە شیعر و ڕۆمان و چیرۆک هەیە. لە حاڵی حازردا دەتەوێ لەسەر نووسینی مەغریبی بە زمانی فەرەنسی چی بڵێیت؟

-من سەر بە نەوەی «عەبدولەتیف ئەللعیبی و محەمەد خیرالدین و مستەفا ئەلنیسابوری»م، ئێمە کاتێ لە شەستەکاندا دەستمانکرد بە نووسین بە زمانی فەرەنسی، لەو بڕوایەدا نەبووین نووسین بە فەرەنسی بەردەوام دەبێت. ئێمە وامان هەست دەکرد دیاردەیەکی سەیر بۆ جیهانی عەرەبی دروست دەکەین. چونکە سەرەتا هەندێک پێیان خۆش نەبوو نووسەرێک جگە لە زمانی دایک، بە زمانێکی دیکە بنووسێت کە دایک و باوکی قسەی پێ ناکەن. ئەمە لەو سەردەمەدا مەسەلەیەکی سەیر بوو، بەڵام لە هەمانکاتدا ئێمە پێویستمان بە گۆڕان بوو، باشترین ئامرازیش کە زۆر تێیدا شارەزابووین زمانی فەرەنسی بوو. لێرەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە زمانی عەرەبی بکەین و زوڵمی لێنەکەین و نەیشێوێنین، پێمان باش بوو، یان من خودی خۆم پێم باش بوو، زیاتر لە زمانی فەرەنسیدا قووڵ ببمەوە و فێری ببم، تا ئەو کارە داهێنەرانەیەی پێشکەشی دەکەم، لە ئاستی پێویستدا بێت. لە ساڵانی شەست و حەفتاکاندا، هەندێ گروپ و توێژ، بە هۆکاری نووسین بە زمانێک کە زمانی وڵاتی دایک نییە، هەوڵیاندا وامان لێ بکەن هەست بە گوناهـ بکەین. خاڵی سەرەکی لەم مەسەلەیەدا، زمان نییە، بەڵکو ئەوەیە چی دەنووسیت. ئەوەی لە کۆمەڵەی (انفاس)دا نووسیم، بێ هیچ دوو دڵییەک ڕەگوڕیشەیەکی مەغریبی هەیە، ئێمە گوزارشتمان لە واقیعی خۆمان دەکرد، گەرچی بە زمانی فەرەنسیش بوو، خوێنەرانیش پشتگیریان کردین و لە نووسین بەردەوام بووین، ئەمە سەبارەت بە قۆناغی یەکەم.

بەڵام لە قۆناغی دووەمدا کە لە فەرەنسا نیشتەجێ بووم و پیشەی نووسین، بووە کاری سەرەکیم و بە شێوەیەکی بەردەوام دەمنووسی، بینیم جیهانی خۆرئاوا چاوەڕوانی شتێکە لە جیهانی عەرەبیمان، نووسین بە فەرەنسی پرۆسەی ناسینی ئێمە و ناسینی وڵاتەکانمانی ئاسانتر کرد. ئەم ناسینەش خەسڵەتێکی







ڕەخنەگرانەی هەبوو، ئێمە کۆمەڵگای خۆمان بە شێوەی کۆمەڵگایەکی عەجایباتی و فۆلکلۆری نەخستووەتەڕوو، بەڵکو قسەمان لەو کێشە و گرفتانە کرد کە لە مەغریبدا هەبوون، بۆ نموونە وەک ئەوەی «ئیدریس ئەلشەرابی» نووسەر لە ڕۆمانە پێشەنگەکەیدا (الماضي البيسط) ئەنجامی دابوو، ئەو لە پەنجاکاندا ڕێگای لە بەردەم ئەم جۆرە نووسینەدا کردەوە. ڕەخنەی فەرەنسی هەستی کرد ئێمە لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا، ئامادەییەکی باشمان هەیە، لەبەر ئەوە دەستیکرد بە ئاوڕدانەوە لێمان و لە نووسینەکانمان. من وەک خۆم ئەم مەسەلەیەم زۆر بە جدیی وەرگرت و دەستمکرد بە نووسین لەسەر وڵاتەکەم مەغریب. من گرنگی بە ڕەخنەی پۆزەتیف دەدەم کە ڕەخنەیەکی بابەتیانە بێت، بەڵام ڕەخنەی نێگەتیف کە لەسەر سوکایەتی و قسە پێوتن بونیاد نرابێت، ئەوا هیچ گرنگییەکی پێنادەم و وەڵامیشی نادەمەوە.

*بەڵام ئەم خەسڵەتە فۆلکلۆری و عەجایباتییە، لە بەشێکی زۆری ئەو نووسینە ئەدەبییانەدا دەرکەوت کە بە فەرەنسی نوسرابوون، لەگەڵ دەرکەوتنی وایکرد ڕەخنەی عەرەبی و بە تایبەتی ڕەخنەی مەغریبی، هێرشێك بکاتە سەر هەڵگرنی ئەو جۆرە نووسینانە و بە نووسینی نارەسەن وەسفی کردن.

-سەرەتا ڕۆڵی نووسەر، ڕۆڵی توێژەرێکی کۆمەڵایەتی یان توێژەرێکی دەرونشیکاری نییە. نووسەر کاتێ چیرۆکێک، بە هەرجۆرێک بێت



تاهیر بن جەلون

دەگێڕێتەوە، ئەوە کارێکی داهێنەرانەی خەیاڵی ئەنجامداوە. من نامەوێت خۆم وا پیشان بدەم کە وێنەیەکی ڕاستەقینەم سەبارەت بە واقعی مەغریبی خستووەتەڕوو، چونکە واقع فرەڕەنگ و ئاڵۆزە و تەنها نووسەرێک بەس نییە بۆ گوزارشتکردن لێی. من گوزارشت لە سۆز و هەست و خودی خۆم دەکەم. خوێنەرانی کتێبەکانیشم فرە جۆرن، هەیانە پێیوایە کتێبەکانم بابەتە فۆلکلۆرییەکان دەخاتەڕوو، هەشیانە پێیوایە لە کتێبەکانمدا ئەو شتەی دۆزیوەتەوە کە بە شوێندا دەگەڕێت.

لێرەوە ئەو وێنەیەی پێشکەشی دەکەم و دەیخەمەڕوو، پێش ئەوەی وێنەیەکی واقیعی بێت، وێنەیەکی خەیاڵییە و لە هەمانکاتدا ڕەهەندی ڕەخنەیشی هەیە. ڕۆڵی نووسەر و شاعیر بریتی نییە لە نەمرکردنی واقیعێکی دیاریکراو، بەڵکو ڕۆڵی بریتییە لە ڕەخنەگرتن و هێنانەئارای دیدگایەک کە یارمەتی خوێنەر بدات بۆ هوشیارکردنەوەی کۆمەڵگا. خۆشبەختی و بێدەنگی و دڵنەوایی، ڕێگاکانی داهێنان ناکەنەوە، ئەوەی ڕێگاکانی داهێنان دەکاتەوە بریتییە لە کێشەکان و نەخۆشییەکان کە وڵات بە دەستییەوە دەناڵێنێت. داهێنەر دەست بۆ شتە ئاڵۆزەکان دەبات، سا سیاسی یان دەروونی یاخود کۆمەڵایەتی بێت و بە شێوەیەکی باش لە کارەکانیدا دایدەڕێژێتەوە، تاکو چیرۆکێکی خەیاڵی پشت ئەستور بە واقعێکی زانراو و هەستپێکراو، بخاتە بەردەم خوێنەر، بەڵام بانگەشەی ئەوە نەکات ئەمە لە سەدا سەد واقعێکی بابەتییە و بە تەواوی هاوشێوەی واقیعە گشتییەکەیە.

***ئایا گرنگترین ئەو دەزگایانەی بڵاوکردنەوە کە لێیانەوە کتێبەکانت بڵاودەکەیتەوە، ئەوانن وات لێ دەکەن ئەم جۆرە نووسینانە بنووسیت؟**

-نەخێر هەرگیز، من بە پێی داواکاری نانووسم، ئەو تەنها جارەی بە پێی داواکاری نووسیم، کتێبەکەم بوو دەربارەی زیندانی (تازمامارات)، ئەوەش داواکاری هاوڕێیەکم بوو. ئەو کتێبە گەرچی لەپای داواکارییەک نووسیم، بەڵام لەسەر شێوەی ڕۆمان نووسیم نەک دیکۆمێنتاری. پەیوەندی من و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، پەیوەندییەک نییە لەسەر (داواکاری و خستنەڕوو - عرض و طلب). ئەوە منم بەوپەڕی ئازادی و بەوپەڕی دڵنیاییەوە بڕیار دەدەم چیم نووسیوە و چی دەنووسم و چی بڵاودەبێتەوە. من ساڵانە بۆ ماوەی پێنج مانگ لە وڵاتەکەم مەغریب دەژیم، دەگەڕێم و دەبینم و دەبیستم، ڕۆڵی نووسەریش لێرەدایە: دیاردەکان هەست پێدەکات و ئەوەی دەیبینی و تێیدا دەژی، وەردەگرێت. وەک ئەوەی زۆرجار وتوومە، کاری هونەری نووسەر، لە دروستکردنی خانوویەک دەچێت کە چەند ساڵێک دەخایەنێت و ناکرێت لە چەند مانگێکی کەمدا دروست بکرێت. من نزیکەی سی ساڵە ئەو خانووە دروست دەکەم و هەموو بەردێکی ئەو خانووە، کارێکە لە کارەکانم و گەر خودا یار بێت ئەوا هەوڵدەدەم ئەم خانووە تەواو بکەم. من هەمیشە لەسەر مەغریب دەنووسم، تەنها لە دوو ڕۆماندا باسی ئیتالیا و مەغریبیم

پێکەوە کردووە. لە کارەکانمدا پەیوەستبوونم بە مەغریبەوە زۆر بە ڕوونی دیارە. ئەوەی سەیرە ئەوەیە ڕۆژنامەنووسە فەرەنسییەکان هەمیشە لێم دەپرسن بۆچی لەسەر مەغریب دەنووسم و لەسەر فەرەنسا نانووسم. منیش وەڵامیان دەدەمەوە و دەڵێم زۆر لەسەر فەرەنسا نووسراوە، بەڵام مەغریب پێویستی بەوەیە بڕواتە ناو ئەدەب و داهێنانەوە.

***جگە لە هەندێ ئاوەرتە، وەك تاهیر بن جەللون و عەبدالحق سەرحان و چەند ناوێکی کەمی دیکە، لە ئێستادا ڕۆمانی مەغریبی کە بە زمانی فەرەنسی دەنووسرێت، لە حاڵەتێکی خراپدایە، بە بەراورد بەو ژمارە زۆرەی لە پێشتردا هەبوو. هۆکاری ئەم پاشەکشەیە چییە؟ ئایا نووسین بە زمانی فەرەنسی دیاردەیەکی کاتییە؟**

-نووسینی ئەدەبی مەغریبی بە زمانی فەرەنسی دیاردەیەکی کاتی نییە. لە مەغریب تا ئێستاش هەندێ کتێب بە زمانی فەرەنسی، لەلایەن دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەوە، بڵاودەکرێنەوە. هەندێ هەوڵ هەیە، بەڵام ناکرێ بڵێین نەوەیەکی تازە هەیە وەک نەوەی پێشوو. تاک تاکە هەیە دەنووسن، بەتایبەتی ژنان کە لەم ساڵانەی دواییدا و لە میانەی نووسینەکانیان لەسەر کۆمەڵگای مەغریبی و کێشە سەرەکییەکانی، بوونەتە جێگای سەرنج و چەندین بەڵگەیان لەسەر ئەو بارودۆخە خستووەتەڕوو کە ژنانی مەغریب تێیدا دەژین. بەڵام لە ئێستادا ناتوانین بڕیاری ئەوە بدەین ئەو ئەدەبەی بە زمانی فەرەنسی دەنووسرێت، لە پاشەکشەدایە. چونکە دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، چ دەزگا مەغریبییەکان یان فەرەنسییەکان، بەرهەمی خانمە نووسەرە مەغریبییەکان بڵاودەکەنەوە، زۆربەی جاریش ئەو بەرهەمانە ئاستێکی باشیان هەیە.

***ئایا ئەم جۆرە نووسینەی ژنان کە لە نێوان ڕۆمان و یاداشت و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیدا، دێت و دەچێت، ئایندەی نووسینی ئەدەبییە بە فەرەنسی لە مەغریب؟**

-ناتوانم پێشوەختە حوکم بەسەر ئەم نووسینانەدا بدەم، ئەوەی دەیزانم و لێی ئاگادارم ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر لە ژنان دەنووسن و لە ڕێگەی نووسینەوە هەناسەیەک دەدەن و گوزارشت لەو کێشە و نەهامەتییانە دەکەن کە پێیەوە گرفتار بوون، ئەمەش شتێکی زۆر گرنگە. کێشە مەترسیدار و نیگەرانەکە لە مەغریب، ئەوەیە خوێنەر تابڵێی کەمە. ئەوەی تایبەت بوو بە نەوەی من، ئەوە بوو، خوێندنەوە لای ئێمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بوو، هەرگیز پیاسەیەکمان نەدەکرد بە بێ ئەوەی کتێبێکمان پێ نەبێت. لەمڕۆدا و لە مەغریبی ئێستادا دوورکەوتنەوەیەکی گەورە هەیە لە خوێندنەوە، لەوانەیە ئەم دیاردەیە، دیاردەیەکی تێپەڕبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە توانایەکی زۆر لەسەر ئاستی پەروەردە و قوتابخانە بخەینەگەڕ، تا خووی خوێندنەوە لای خەڵکی بەدەستبێنین. ئەگەر گەنجەکان دەستیانکرد



تاهیر بن جەللون

بە خوێندنەوەی کتێب، ئـەوا کاریگەرییان لەسەر دایکان و باوکانیش دەبێت و ئەوانیش دەگەڕێنەوە بۆ کتێب خوێندنەوە. وڵاتێک خەڵکەکەی نەخوێنێتەوە، لەسەر ئاستی هوشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتووری، پێش ناکەوێت. ژمارەیەکی زۆری خـاوەن کتێبخانەکان، دەردە دڵی ئەوەیانە خەڵک پێشوازی لە کتێب ناکەن و بەدەست کەمی خوێنەرەوە دەناڵێنن، گەرچی نرخی کتێبەکان گونجاوە. کێشەکە لە نرخی کتێبەکاندا نییە، بەڵکو لە هاتنی کەناڵە ئاسمانییەکانە بۆ نێو ژوورەکان کە خوێندنەوەی لەناوبرد.

***لـــە دواهـــەمـــیـــن کـــۆمـــەڵـــە چـیـرۆکـتـدا (غراميات ساحره)، شانازی بە ئافرەت و بە کۆمەڵگای ئێستای مەغریبەوە دەکەیت. ئایا دەکرێ ئەم کارەت وەك گەڕانەوەی ماف بێت بۆ ئافرەتی مەغریبی کە لە کارە داهێنەرەکانی پێشترتدا بە شێوەیەکی نەرێنی دەرکەوتوون؟**

-لە یەکەم کاری ڕۆماننووسینم کە لە ساڵانی حەفتاکاندا بە ناونیشانی (حروده) بڵاوکرایەوە، قسەم لەسەر ئافرەتی مەغریبی ساڵانی چل و پەنجاکان کردووە. نمونەی ئەو ئافرەتەی لـەو ڕۆمـانـەدا پشتم پـێ بەستبوو، ژیانی خوالێخۆشبووی دایکم بوو. ئێستا مەغریب پێشکەوتووە و گۆڕاوە، هەرچەندە بارودۆخی ئافرەتان، لەسەر ئاستی دەقە یاساییەکان نەگۆڕاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆمەڵگای ئێستادا، بارودۆخی ئافرەت لە تێڕوانین و دید و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی پیاوان و ئافرەتاندا، گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. ئافرەتی مەغریبی تێکۆشانی زۆر گرنگی ئەنجامداوە، بەوپەڕی لێهاتوییەوە ڕۆڵی خۆی بینیوە و پشتی بە یارمەتی دەوڵـەت یان یاساکان نەبەستووە. ئافرەتی مەغریبی دەستپێشخەری شەخسی زۆری هەبووە و بەشداربووە لە پێکهێنانی ئـەوەی پێیدەوترێت کۆمەڵگای مـەدەنـی و ڕۆڵێکی گرنگی تێدا گێڕاوە.

لە مەغریب تێبینی ئەوەمکردووە گەر ئازایەتی و بەرخودانی هەندێ لەو ڕێخراوانە نەبوایە کە لەلایەن ئافرەتانەوە، لە پێناو گۆڕینی بارودۆخی ئافرەتان دامەزرێنراون، ئەوا مەغریب ئەم پێشکەوتنە گرنگانەی بەخۆیەوە نەدەبینی کە لە ئێستادا دەیبینێت. ئافرەتی مەغریبی بــژاردەی تـازەگـەری و پێشکەوتنی خۆی سەپاند، هەرچەندە هەندێ گروپ و دەستە و تاقمی ئاینی، یان ئەوانەی پێیان دەوترێت ئاینی، ناڕازیبوون. من بـڕوا ناکەم ئیسلام خراپەی بۆ ئافرەت هەبێت و دژ بە ئافرەت بێت. ئەو گروپ و دەستە و تاقمانە، هەندێ شێواز بەکاردەهێنن، تاکو ئەم هەستانەوە و پێشکەوتنە بکوژن کە مەغریب بەخۆیەوە دەیبینێ.

***لـە پـاڵ بابەتەکانی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و ئافرەت کە لەم کۆمەڵە چیرۆکەی دوایتدا باستکردوون، باس لە مەسەلەی خیانەت-یش دەکەی. ئایا لەم کۆمەڵە چیرۆکەتدا شتێك لە تاهیر بن جەللون-ی تێدا نییە کە بەم دواییانە لە فەرەنسا دووچاری هەندێ کێشە هاتووە**

**و لە مەغریبیش هەندێ لە هاوڕێکانی خیانەتیان لێ کرد؟**

-بەڵێ وایە، ئەم کتێبەم بۆیە نووسی تا وەڵامی هەندێ لەو خیانەتانەی پێ بدەمەوە کە لە گۆڕەپانی ئەدەبی و لەسەر ئاستی شەخسی دووچاریان بووم. کاتێ پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاو، پەیوەندییەکی گەرموگوڕ و خۆشەویستی بێت، لەو کاتەدا هاتنی خیانەت، مەسەلەیەکی لەناکاو نابێت گەرچی شتێکی ناخۆش و بێزراوە. بەڵام کاتێ پەیوەندییەکی هاوڕێیەتی باش و دوور لە هەر بەرژەوەندییەکی مادیی و شتی لەو بابەتە، لەگەڵ کەسێکدا هەیە و تەواوی متمانەی خۆتی پێدەبەخشیت، کەچی ئەو کەسە دێت و خیانەت لەو متمانەیە دەکات، ئەوا شۆکی ئەو خیانەتە زۆر گەورەیە. نووسین بۆ من بووەتە جۆرێک لە وەڵامدانەوە دژ بەو خیانەتانە، لە میانەی نووسینەوە هەموو ئەو شتانە دەردەبڕم کە زۆر بە توندی کاریان تێکردووم. بەڵێ بە ڕاستی دووچاری کۆمەڵێ خیانەت هاتووم، شتگەلێکی وای تێدابوو دووچاری شۆکی زۆر گەورەی کردم و شتگەلێکی دیکەشی تێدابووە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان پێشبینی ڕوودانیم کردبوو. بۆ نموونە گەر لەو کۆمەڵەدا








تاهیر بن جەلون

چیرۆکی (حەمام) وەربگرین، ئەوە بەسەرهاتی کەسێک دەگێڕێتەوە کە ڕۆژانە خۆی خاوێن دەکاتەوە و خۆی پاکڕادەگرێت، کەچی هەست دەکات بۆنێکی پیسی لێ دێت. کاتێ لە شاری فاس دەڕوات بۆ حەمامی سەردەمی منداڵی، تا بە شێوەیەکی زۆرباش و قووڵ خۆی بشوات، بۆی دەردەکەوێت ئەو بۆنە بۆنێکی ڕەمزییە. چونکە ناتری حەمامەکە پێی دەڵێ: (کوڕی خۆم تۆ تێکەڵی قەومێک بوویت و دووچاری ئەو پەتایە هاتوویت،




لەبەر ئەوە پێویستە لەم ژیانەدا زۆر ئاگادار و وریا بیت).

من وەک خۆم، کەوتمە ناو تەڵەیەکی گەورەوە، چونکە هەندێ کەس هاوڕێیەتی و خۆشەویستی دەقۆزنەوە تا دواتر لە پشتەوە خەنجەرت لێدەن. وەلێ لە دواجاردا بۆم ئاشکرا بوو ئەو جۆرە کەسانە، هیچ کارێکی دیکەیان نییە جگە لە خیانەت کردن، بەداخەوە ئەوە لە مەغریبدا هەیە.

***ئایا ڕوو لە خوێنەرێکی دیاریکراو دەکەیت؟ ئایا کاتێ لە نێوان ژانرە ئەدەبییەکاندا: شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، دێیت و دەچیت، بیر لە خوێنەرێکی جیاواز دەکەیتەوە؟**

-من پێموانییە یەک خوێنەر یان خوێنەرێکی دیاریکراو هەبێت، لە سەرەتادا بیر لە خوێنەر ناکەمەوە. بەڵام بێگومان ئەوانەی لەکاتی نووسینی شیعردا، ڕوویان تێدەکەم، خوێنەری جیاواز جیاوازن، چونکە ئەوانە وەک ئەو خوێنەرانە نین کە بەڵگەنامە و دیکۆمێنتەکان یان چیرۆک و ڕۆمان دەخوێننەوە. جگە لە شیعر، ناتوانم هەرگیز خوێنەرەکانم دەستنیشان بکەم. من تێبینیم کردووە دوای بڵاوبونەوەی کتێبەکانم، خوێنەرەکانم جۆراو جۆرن. من ڕوو لە ئاپۆرەی خوێنەران دەکەم، چۆن بن و زمانیان چی بێت و بیروڕایان لەسەر نووسینەکانم هەرچییەک بێت. وەلێ ئەو نووسەرەی پێشوەخت خوێنەرەکانی خۆی دەستنیشان دەکات، ئەوا خوێنەرەکانی دیاریکراو دەبن. بۆ نمونە ئەوەی چیرۆکی

پۆلیسی دەنووسێت، خوێنەری تایبەتی هەیە و لەوانە پێکدێت کە حەز بە خوێندنەوەی چیرۆکی پۆلیسی دەکەن. من ڕوو لە سەرجەم خوێنەران دەکەم لە هەر کوێیەک بن.
لێرەدا دەمەوێ قسە لە کێشەیەکی گەورە بکەم کە نووسەرانی عەرەب بە دەستییەوە دەناڵێنن، چ ئەوانەی بە عەرەبی دەنووسن یان بە زمانێکی دیکە دەنووسن. ئەویش کێشەی چەتەگەری (قەرسەنە) و دزینە کە لە وڵاتانی وەک سوریا و میسر و لوبنان هەیە. چەندین جار هەوڵمداوە لەگەڵ هەندێ لە نووسەرە دیارەکانی جیهانی عەرەبی، ئابڕوی ئەم کارە بەد ئەخلاقییە ببەین کە بە شێوەیەکی گەورە و مەترسیدار کاریگەری خراپی لەسەر ئەدەبی عەرەبی جێهێشتووە. ئەوەی پەیوەندی بە کتێبەکانی منەوە هەیە، ئەوەیە چەند هەفتەیەک دوای دەرچوونی بە زمانی فەرەنسی، بە شێوەیەکی زۆر خراپ و بێ وەرگرتنی ڕەزامەندی بڵاوکەرەوەکە یان نووسەرەکە، تەرجەمە دەکرێت، بە تایبەتی لە سوریا. ئەوان تەنها لە سنوری چەتەگەرییەکەدا ڕاناوەستن، بەڵکو دەستکاری دەقە دەکەن و چۆنیان پێ خۆش بێت و چۆن بۆ ئەوان گونجاوبێت دەیگۆڕن و لێی لا دەبەن. ئەمە هەم کارێکی بەد ئەخلاقییە و هەم لەگەڵ ڕەوشتی کارەکەشدا ناگونجێت. لەبەر ئەوە من زۆر بێزار و نائومێدم لە مانەوەم لە جیهانی عەرەبیدا. بە هەرکوێیەکدا بڕۆم ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیان دەبینم، ئەوان پێم دەڵێن بڕێک لە کتێبەکانی منیان خوێندووەتەوە، بەڵام پێیان باش نەبووە و لەو بڕوایەدان ئەو کتێبانەم لە ئاست ئەو کتێبانەدا نییە کە بە فەرەنسی دەیانووسم. ئەم فەوزایە بە تایبەت لە سوریادا هەیە، چونکە سوریا واژۆی لەسەر یاساکانی مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە جیهاندا نەکردووە. ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر دەزگا باشەکانی بڵاوکردنەوە دەبێت، بە تایبەتی دەزگای (توبقال) لە مەغریب کە ژمارەیەک کتێبی تەرجەمەکراوی باش و زۆر جوانی منی بڵاوکردووەتەوە. ئەم دەزگای بڵاوکردنەوەیە دووچاری کێشە دەبێت، چونکە هەمان ئەو کتێبەی کە ئەو تەرجەمەی کردووە، بەنرخێکی زۆر هەرزانتر لە سوریاوە دێتە مەغریب.
بێگومان خوێنەر جیاوازی ناکات لە نێوان تەرجەمەکان و ئەوەیان هەڵدەبژێرێت کە هەرزانترە. هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی عەرەب دژ بەم کارە بەد ئەخلاقییە ڕاوەستاوون و ئیدانەیان کردووە، بەڵام کەسیان نەدۆزیوەتەوە بەرگری لە مافەکانی نووسەر بکات کە تەواو وەک مافەکانی مرۆڤ وایە. هەمو جارێ لە ڕۆژنامە عەرەبییەکاندا قسە لەم مەسەلەیە دەکەم و دەیوروژێنم، کەچی هیچ سودێکی نییە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی من لەگەڵ دەزگای بڵاوکردنەوەکەدا، نامەیەکی ناڕەزایم بۆ دەزگا سورییەکە نووسی، بەڵام دوای ماوەیەک نامەیەکی جنێوئامێزی پڕ سوکایەتیمان پێگەیشت و پێمان دەڵێن ئەوان ئامانجیان ئەوەیە بەشداربن لە بڵاوکردنەوەی



تاهیر بن جەلون

ئەم جۆرە ئەدەبەدا. ئایا ڕەوایە بەشداریکردن لە بڵاوکردنەوەی ئەدەب، لە ڕێگەی چەتەگەرییەوە بێت؟

***لای تۆ چ ژانرێکی ئەدەبی لە هەموویان لەپێشترە؟**

-من یەکەمجار بە شیعر دەستم پێکرد، چونکە شیعر دیوانی عەرەبە و یەکەم جۆری داهێنانە کە عەرەب ناسیویەتی. من تا ئێستاش هەر شیعر دەنووسم، لەوانەیە ئەمە بەهۆی کاریگەری شارستانیەتی عەرەبی و ئیسلامی، لەسەر من، هاتبێت. بەڵام ئەمە گرنگ نییە، ئەوەی گرنگ و سەرەکییە ئەوەیە لە هەموو بوارەکاندا، داهێنانێکی کەڵەکەکراوی جوان و نایابمان هەبێت.

***دوای ئەو هەژانانەی جیهان بە خۆیەوە بینی، بە تایبەت دوای ڕووداوەکانی ١١ سێپتێمبەر و جەنگی عێراق، ئایا تا ئێستاش پێتوایە ڕۆشنبیر توانای گۆڕینی واقیعی هەیە؟**

-پێم وا نییە ڕۆشنبیر دەتوانێ واقیع بگۆڕێت، بەڵام ڕۆڵی ڕۆشنبیر لەوەدایە لە کات و ساتێکی دیاریکراودا، قسەی خۆی بکات و گوزارشت لەو شتانە بکات کە دەبێ بوترێن. وەلێ هەنووکە لە خۆرئاوا یان لە ئەمریکا، گوێ لە دەنگی ڕۆشنبیرانی عەرەب ناگرن و بایەخی پێنادەن. ئێمە پێشتر لەسەر ئەوە ڕاهاتووین و ئەمە لەگەڵ سیاسییەکانیشدا ڕوویداوە. سیاسەتی عەرەبی هیچ کاتێ چ لای ئەمریکا یان لای ئەوروپا، گوێی لێ نەگیراوە و بایەخی پێنەدراوە. ئێستا گەیشتوینەتە قۆناغی دووەم کە بریتییە لە گوێنەگرتن لە قسەی ڕۆشنبیر یان ئەدیب یان بیرمەندی عەرەب، بگرە لەوەش خراپتر ئەوەیە داوای لێنەکراوە لە فلان یان فیسار کێشەدا، هەڵوێستی خۆی دەربڕێت. لێرەوە پێویستە هەمووان ئەم ڕاستییە بزانن، تا پرسیاری ئەوە نەکەن بۆچی ڕۆشنبیرانی عەرەب لە ئەوروپا بێدەنگن. ڕۆشنبیرانی عەرەب لە ئەوروپا، دەرفەتی ئەوەیان بۆ ناڕەخسێ لە هەر گۆڤارێک یان ڕۆژنامەیەکی گرنگی ئەوروپیدا بنووسن، ئەوانەشی دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت،



ڕووبەڕووی ئاستەنگێکی زۆر دەبنەوە لەوەی بتوانن بە ئازادانە گوزارشت لە بیروڕاکانیان بکەن.

*بە ئەندازەی ئەو پێشوازییەی لە لایەن خوێنەران و توێژەرانەوە، لە داهێنانە ئەدەبییەکانت دەکرێت، بە هەمان ئەندازە وتارەکانت لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا مشتومڕێکی گەورە لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری مەغریبی و عەرەبیدا دەوروژێنن. دواهەمینیان ڕەخنەی ڕۆژنامە عەرەبییەکان بوو لەو نامەیەی بە ناونیشانی (گەر من سەدام حسێن) دەبووم، ئاراستەی (سەدام حسێن)ت، کردبوو. تێڕوانینی تۆ لەسەر ئەو مشتومڕە چییە؟

–بە بڕوای من ڕۆمان لە وتار گرنگترە، بەڵام لە هەندێجاردا نووسینی وتار پەرچەکرداری زۆر بە دوای خۆیدا دێنێت، چونکە من لە وتاردا شتگەلێک باس دەکەم خوێنەری عەرەبی لەسەری ڕانەهاتووە و پێی ئاشنا نییە. لەبەر ئەوە لە جیهانی عەرەبیدا بیروڕایەکی جیاواز کە باو و بەربڵاو نەبێت، نیگەرانی لێدەکەوێتەوە. هەرچی وتاری (گەر سەدام حسێن) دەبووم، ئەوە وتارێکی خوازەییە (استعاریە) نەک وتارێکی شیکردنەوەی سیاسی. ساڵی ١٩٧٥ پێش هاتنی سەدام بۆ سەر حوکم، سەردانی عێراقم کرد و چەند وتارێکم لەسەر کۆمەڵگای عێراقی نووسی، لەو کاتەدا زۆر دڵخۆش بووم بەوەی دەوڵەتێکی عەرەبی هەیە بایەخێکی گەورە بە ڕۆشنبیری و ئەدەب و داهێنان دەدات و توانایەکی زۆری بۆ تەرخان کردووە. عێراق پێش سەدام وڵاتێکی فرە حیزب و فرە بیروباوەڕ و فرە بیرکردنەوە بوو. سەدام کە هات گەلی عێراقی تێکشکاند، ئەویش لە ڕێگەی بەرپاکردنی دوو جەنگی تاوانکاری دژ بە ئێران و کوێت، لە هەمان کاتدا بە هاوکاری ئەمریکا و ئەورووپا سودی لەو گەمارۆیە بینی کە لەبەرژەوەندی خۆیدا بوو نەک لە بەرژەوەندی میللەت. سەدام بۆ وڵاتەکەی و بۆ جیهانی عەرەبی و ئیسلامی کارەسات بوو. پێش جەنگی کوێت، داوام لێکرد پاشەکشە بکات و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دان بە تاوانەکەیدا بنێت. ئەو نامەیە دەقێکی نیمچە ئەدەبی بوو. لە هەمان کاتدا، ئەمە زۆر کەس نایزانێت، لە هەردوو ڕۆژنامەی (لۆمۆند) ی فەرەنسی و (المساء)ی بەلجیکی و لە هەندێ بەرنامەی تەلەفزیۆنی فەرەنسیدا، داوامکرد دادگایی بۆش و شارۆن بکرێت لەسەر ئەو تاوانانەی دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامیان دابوو. ئێستا دەرئەنجامی هەموو ئەوانە چییە؟ هێرش کرایە سەر عێراق و تا ئێستاش نازانین چەند منداڵ و ئافرەت و پیاوی عێراقی لەم جەنگەدا کوژراون، حەقیقەتی ئەم دەستدرێژییەشمان بۆ دەرنەکەوتووە کە قوربانییەکەی میللەتی عێراق بوو. تا ئێستاش نازانین سەدام حسین و کوڕەکانی لە کوێن (ئەم چاوپێکەوتنە پێش گرتن و لەسێدارەدانی سەدام حسین بووە – و.ک). پێویستە ئەم شتانە بە شێوەیەکی تەواو بابەتییانە ڕووبەڕووی ببینەوە، دوور لەهەر حەساسییەتێکی عەرەبی یان خۆرئاوایی. من



تاهیر بن جەلون

ئەوەی ناتوانم بە ڕاستی لێی تێبگەم ئەوەیە خوێندنەوەی خراپ بۆ قسەکانم دەکرێت، چ لە ڕۆژنامەکان یان لە گۆڤارەکان.

***دوای ڕووداوەکانی ئەم دواییەی الدار البیضاء، مەغریب چۆن دەبینی، ئایا دەکرێ بەردەوام بێت لەسەر ئەو ڕێڕەوە دیموکراسییەی کە دەستی پێکردووە و پارێزگاری لێ بکات؟**

-مەغریب پێویستە بەردەوام بێت لەسەر بەرنامە دیموکراسییەکەی و ئازادی ڕادەربڕین کە لەم ساڵانەی دواییدا دەستی پێکردووە. پێموایە باشترین وەڵام بۆ ئەو تاوانە، ئەوەیە مەغریب سووربێت لەسەر بەرنامە دیموکراسییەکەی خۆی و پاشەکشەی لێ نەکات. مەغریب ئەوەی هەڵبژاردووە ببێت بە وڵاتێکی دیموکراسی، ئێمە تا ئێستا سەرقاڵی گەڕان و زانینین دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی دیموکراسی لەم وڵاتەدا. هەروەها مەغریب ئەوەی هەڵبژاردووە کە دەرفەتی ئازادی بیروڕا فەراهەمبێت کە هەندێجار لەلایەن هەندێ مینبەری ڕاگەیاندنەوە ڕێزی لێناگیرێت، بە تایبەتی ئەو مینبەرانەی فەوزا بڵاودەکەنەوە.

لەبەر ئەوە پێویستە ڕۆژنامەکان پشت بە بابەتیبوون ببەستن و دەرفەت بۆ هەموان بڕەخسێنن تا گوزارشت لە بیروڕای خۆیان بکەن لەگەڵ ڕێزگرتن لە یاسا. ڕووداوەکانی (الدار البیضاء) شۆکێک بوو بۆ هەموو مەغریبییەکان، چونکە ئێمە بە خەیاڵماندا نەدەهات مەغریب ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێتە قوربانی دەستی تیرۆر و تاوانکاری کە هیچ ئامانج و مەبەستێکی نییە تەنها وێرانکردنی وڵاتەکە و بەها کۆمەڵایەتییەکانی وەک پێکەوەژیان و لکێبوردەیی و تێکدانی ئەمن و ئاسایشی وڵات نەبێت. ڕێپێوانەکەی دار البی×اء گوزارشتە لە ڕەتکردنەوە و ئیدانەکردنی مەغریبییەکان بۆ ئەو کارە تیرۆریستییە. ئەو وانەیەی پێویستە لەم ڕووداوانەوە فێری ببین، ئەوەیە دین لە ململانێی سیاسی دا بەکارنەهێنین. پێویستە ڕێزی دین بگرین و نەهێڵین بشێوێنرێت و بەهاکانی لەکەدارنەکەین و دین لە سیاسەت جیاکەینەوە. ئێمە بۆ یەک چرکەش چییە گومان لە ئیسلامبوونمان و عەقیدەمان ناکەین، پێویستمان بە توندڕەوی و ڕەتکردنەوەی یەکتر نییە، پێویستمان بەو ململانێ سیاسییانە نییە تێیدا ئیسلام وەک پەیژەیەک بۆ مەبەستی دیکە بەکاردەهێنرێت.

سەرچاوە:

الشرق الاوسط، ٢٩ ئاب، ٢٠٠٣

# گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد ماغوت

سازدانی ڕۆژنامەی (الوطن)ی سعودی
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

*هەندێك وایدەبینن شیعری محەمەد ماغوت، لەژێر کاریگەرییەکی گەورەی ڕەوتە جیهانییە هاوچەرخەکاندایە، بە دیاریکراویش لە ژێر کاریگەری قوتابخانەی سیمبولیزمی ڕۆمانسیدایە کە بۆدلێر نوێنەرایەتی دەکرد، تۆ دەڵێی چی؟

-ناتوانم و مافی ئەوەشم نییە دان بەوەدا بنێم من لەژێر کاریگەری بۆدلێر یان هەر شاعیرێکی تری بیانیدا بووم. ڕەنگە لە سەرەتادا سەرسامبووبم بە هەندێ شیعری وەرگێڕدراو یان بە هەندێ لە قوتابخانە ئەدەبییەکانی خۆرئاوا. بەڵام ئەو ناوانە بەلای منەوە هیچ مانایەکیان نەدەگەیاند. ئەمە سەرباری ئەوەی من چ ئەوسا و چ ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هیچ زمانێکی بیانی نازانم. لەو سەردەمەدا وەرگێڕانە عەرەبییەکان زۆر دەگمەن بوون، تەنانەت خۆ گەر زۆریش بوونایە، من پارەی تەواوم پێ نەبوو بۆ کڕینی کتێبەکان و خوێندنەوەیان. من بە ڕێکەوت کتێبەکانم دەخوێندەوە و ئاگاداریان دەبووم. هەڵوێستی من دەربارەی ئەم شیعرە یان ئەو نموونانە، وەک هەڵوێستی ئەو کەسە وایە کە لە بازاڕی گەورەی شاردایە و لە یادەوەریدا دەگەڕێتەوە بۆ شتگەلێکی زۆر کە بینیونی و بەلایەوە سەیر بووە: دەنگی سەیارە و هاتوهاواری فرۆشیارەکان، دووکانەکان.. کاڵا بڵاوکراوەکان. بەڵام کاتێ دەگەڕێمەوە بۆ خانووە لادێییە سادە و ساکارەکەم، هیچ شتێک لە بەردەممدا یان لە یادەوەریمدا نەدەمایەوە، تەنها لوورەی ڕەشەبا و خەمناکی گوند نەبێت کە لەبەردەم ئاسۆی بینینمدا درێژ ببوەوە. لێرە من نازانم چۆن و بە چ شێوەیەک کاریگەری من بەم بۆدلێرە یان بەوانی دیکە لە کوێوە هاتووە.

*لە دەنگی محەمەد ماغوتدا، تاکایەتییەك و تایبەتمەندییەك هەیە کە قورساییەکی سەنگینییان لەسەر ژیانی ڕۆشنبیریمان جێهێشتووە. بە دیدی تۆ ئەم تاکایەتییە لە کوێوە هاتووە؟

-بە ڕاشکاوانە پێت دەڵێم من ناتوانم لێکدانەوە یان پاساو بۆ ئەو بیروڕایانە بێنمەوە، هەروەها ناتوانم

تێڕوانینی ئەو ڕەخنەگرانە ڕەتکەمەوە یان هاوڕابم لە گەڵیاندا. بەڵام بڕوام وایە بەهرە یان شاعیری من لە هی ئەوانی دیکە زیاتر نییە، وەک ئەوەی هەندێک وا دەڵێن. وەلێ ڕەنگە من لەوانی تر ڕاستگۆتر و بوێرتر بم لەوەی دەیڵێم. من بە درێژایی تەمەنم بۆ خۆمم نووسیوە و بۆ جەماوەر یان خوێنەر یاخود ڕۆژنامە یان بۆ ڕەخنەگرێک یا بۆ ناوبانگ پەیداکردن نەمنووسیوە. تا ئێستاش نووسین بۆ من دڵدانەوەیەکی شەخسییە و قەرەبوو کردنەوەی هەموو ئەو شتانەیە باو و باپیرانم لە دەستیانداوە، هەروەها قەرەبووکردنەوەی هەموو ئەو شتانەیە نەتەوەکەم بە درێژایی سەدەکان لە دەستیداوە.

لە لایەکی دیکەوە کە ڕەنگە زۆرێک بێ ئاگابن لێی و نەیزانن، ئەوەیە من لەکاتی سەلام و تەوقەکردندا شەرمێکی زۆر گەورە دامدەگرێت و دەشڵەژێم، ئەی ئاخۆ لەبەردەم ڕەخنەگران و نووسەراندا دەبێ چۆن بم. ئەم هەستکردنە بە شەرم و شڵەژان، سیفەتی شاعیرێکی تێکشکاوە کە ئیعتیرافی پێ نەکراوە. ئەم هەستە لە سەرەتاکاندا وای لێکردم شێوازێکی دیاریکراو و ڕەفتارێکی دڕندانە بەرامبەر بە جیهان وەربگرم. لەوانەیە ئەمە یان ئەوە، وایکردبێت ڕەخنەگرەکان بگەنە ئەوەی پێیدەڵێن تاکایەتی لای محەمەد ماغوت.

***ئەمە بەرەو گۆشەیەکی دیکەی شیعرەکانت دەمانبات کە لێیەوە دەستت پێکردووە و پێتەوە لکاوە، ئەویش مەسەلەی غەمە، ناونیشانی یەکەم دیوانت (الحزن فی ضوء القمر) بوو، تەنانەت کار گەشتە ئەوەی نازناوی (شاعیری یادەوەرییە غەمگینەکان)ت لێنرا، ئاخۆ ئەم غەمە لە کوێوە هەڵدەقووڵێت؟**

-لە ڕاستیدا نازانم غەم، چۆن و بە چ شێوەیەک، ڕەگوڕیشەی لە شیعرەکانمدا داکوتیوە. هەموو ئەوەی لە یادمە، ئەوەیە لە ساتەوەختی نووسینی یەکەم ڕستەوە، هەر کەسێ دەیخوێندەوە یان دەیبینی، (تۆو)ی غەمێکی قووڵی تێدا بەدی دەکرد. لە واقیعدا نەمدەویست بەو ئاراستەیە بنووسم، چونکە ئەدەبی گاڵتەجاڕ نابێت غەمبار یان جدیی بێت، بەڵکو دەبێ هەزیل بێت. بە هەرحاڵ نە من دەزانم و نە هیچ کەسێکی دیکەش لە توانایدا هەیە بزانێ غەمگینی کەی لای مرۆڤ دەستی پێکردووە. بەڵام بە تەواوی هەست بەوە دەکەم غەمگینی لەگەڵ مرۆڤی عەرەبیدا لەدیک دەبێت و ستەم وەک ئەڵقەیەک بە گەردنییەوە دەبێت، وەک چۆلەکەی ناو قەفەز. چۆلەکەی ناو قەفەز لەسەریەتی لەناو قەفەزەکەیدا بجریوێنێ و بفڕێ و خەون ببینێ و قونەقوون بکات. هەندێک ئەو قەفەزە پڕ دەکەن لە گوڵ و گوڵزار، هەندێکی تر پڕی دەکەن لە فرمێسک. من سەر بە لقی دووەمم کە قەفەزەکە پڕ دەکەن لە فرمێسک. هیچ خۆشییەکی دەرەکی یان هیچ ڕەوتێک یان هیچ هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی لاوەکی، ناتوانێ ئەوەم لەبیر بباتەوە کە قەفەزێک بە گەردنمەوەیە. کێ ئەم قەفەزەی دروستکردووە؟ من دروستم نەکردووە، ئەوە مێژووە دروستی کردووە... ستمگەرەکان دروستیان کردووە... برسییەتی دروستی کردووە.

***ئایا محەمەد ماغوت -ی شاعیر لەو بڕوایەدا نییە جۆرێك لە خۆشی ئایندەیی، ببەخشێتە ئەم غەمگینییە؟**

-لەو بڕوایەدا نیم غەمگینی من غەمگینییەکی کوێر بێت، بگرە غەمگینی من غەمگینییەکی چاوساغە، ئەمە لە کاتێکدایە دیدگای ئەوانی دیکە، دیدگایەکی کوێرانەیە. ئەوە دیدگای خۆشباوەڕییە کە دیدگایەکی کوێرانەیە. دیدگای ڕەشبینی کە منی پێ تۆمەتبار دەکرێت، دیدگایەکی چاوساغانەیە، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەمەیە، ئەوەی من لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا نووسیومە، لە ئێستاشدا دەخوێنرێتەوە و وەک ئەوە



مەمەد ماغوت

وایە لەم چرکەساتەدا نووسرابن. هەر بۆ نموونە من و شاعیری کۆچکردوو نزار قەبانی، لێک عاجز ببووین، بێگومان لەبەر چەند هۆکارێکی ئەدەبی. ئەم عاجزبوونە ماوەی دە ساڵی خایاند. دوای ئەوە هات بۆ لام و ئاشتبووینەوە و پێی وتم: (تۆ لە هەمومان ڕاستگۆتر و ڕاستگۆترین شاعیری نەوەکەمان بوویت، هەنووکە خەونی من ئەوەیە بە هەمان دیدگا و بە هەمان دەروونە پاک و بێگەردە دوور مەوداکەی تۆ بنووسم کە تۆ لە پەنجاکاندا پێتدەنووسی. غەمگینی و خۆشبینیی تۆ ڕەسەن بوون، خۆشبینی و سەرسوڕمانی ئێمە بە جیهان خڵەتێنەرانە بوو).

دواتر چەند دەقێکی شیعری بۆ خوێندمەوە گریان و فرمێسکی لێ دەڕژا، پێموابێت ئەو شیعرانەی بڵاونەکردەوە. گەر شیعری من غەمگین بێت، ئەوا لەوانەیە خەسڵەتی ئەو مێژووەی تێیدا دەژین غەمگینی بێت. کەس بە غەمگینی یان بە کامەرانی یا میهرەبانی یاخود بە ڕەزیلی لەدایک نابێت. هەموو ئەو سیفەتانە لە ژینگەی مرۆڤەکەوە دروستدەبن. هەندێک پێیان وابوو ئەو کاروانەی کە تێیدا دەستمان بە نووسین کرد، مژدە بەخشە، بەڵام من پێموابوو کاروانێکی غەمهێن و ڕەشبین و پڕ لە تێکشکاندن و دۆڕاندنە.

***ماغوت بۆ ئەوەی بنووسێت چ شتێك دەیوروژێنێت... غەمی تایبەتی خۆی... یان غەمی گشتی... یاخود کاریگەرییەکانی دیکە؟**

-نووسین یان شیعر، وەک ئەوەی وێنایان دەکەم یا وەک ئەوەی مومارەسەیان دەکەم، پەرچەکرداری هەنووکەیی نین. هەروەها حەز و ئومێد نییە لە میانەی پەنجەرەیەکەوە یاخود لە پشتی مێزێکەوە داوای بکەیت. شیعر بۆ من پێویستییەکی ناوەکییە وەک هەناسەدان. لەوانەیە جەنگێکی خوێناوی بێ ئامان نەموروژێنێ و بە بای خەیاڵمدا نەیەت یا نەتوانم یەک وشەی بۆ بنووسم. لەبەرامبەر ئەمەدا بیستنی گۆرانییەک لە پەنجەرەیەکەوە یان کۆکەی مرۆڤێک لە کۆتاییەکانی شەودا، دەتوانێ ئەوەم تێدا بتەقێنێتەوە کە جەنگێکی خوێناوی نەیتوانیوە تێمدا بیتەقێنێتەوە. ئێستا جەخت لەوە دەکرێتەوە هەموو مرۆڤێک لە ئێمە، لە منداڵیدا عەمباری چەندین نەخۆشی نە دۆزراوە بووە، وەلێ دواتر دۆزراونەتەوە و نیشانەکانی دەرکەوتوون. کێشەی من ئەوە بوو هەمیشە هەستم بە نیشانەکانی ئەو نەخۆشیانە کردووە و خستومنەتەڕوو، وەلێ ئەوانی دیکە هەستیان پێنەکردووە و تەنها ڕووکەشیان بینیوە، پێکەنینە ڕەنگ زەردەکان و جلوبەرگی ئاڵوواڵای بریقەداریان بینیوە. من دوورتر و قووڵترم لەم دیکۆرە دەرەکییە دەبینی. غەمگینی سیفەت نییە، غەمگینی ژیانمانە. من تەحەدای ئەو کەسە دەکەم لە ئێستادا بێت و بڵێت ئێمە، چ نووسەران یان خوێنەران دڵخۆشین. ئەوەی دەموروژێنێ ئازارە، ئازاری مرۆڤ و غەمی هەموو مرۆڤایەتی.

***هەندێك لە ڕەخنەگران پێیان وایە پێشکەوتنێکی بەرچاو لە نووسینە سیاسی یان شانۆنامەکان یاخود ڕەخنەییەکانتدا هەیە، ئەمە لە کاتێکدایە ئەم پێشکەوتنە لە شیعرەکانتدا بەدیناکرێت؟**

-بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، دەمەوێ شاعیر بە بێژەری خوێندنەوەی هەواڵەکان بچوێنم، شیعر بریتییە لە کورتەی هەواڵەکان، کەچی شانۆ و ڕۆژنامە بریتییە لە درێژەی هەواڵەکان. شیعر وردەکارییە لاوەکییەکان لەخۆناگرێت. من وەک شاعیر لە دارستانەکەدا تەنها گەڵایەکی زەرد دەبینم و هەموو درەختە گەڵا سەوزەکانی دیکە نابینم. چونکە زۆرباش دەزانم مادام گەڵایەکی زەرد لەوێدا هەیە، ئەوا ڕۆژێک دێت هەموو گەڵا سەوزەکانی دیکە زەرد هەڵدەگەڕێن. شیعر گەر سەرقاڵی وردەکارییەکانی دیکە دەبێت، لە شیعر دەکەوێت و دەبێتە شتێکی دیکە. بەڵام شانۆ بایەخ

بە دارستان و درەختەکان، بە هۆکارەکانی زەردبوونی گەڵاکان و پەین و ئەوانی دیکە دەدات.

***لە نووسینە رەخنەییەکاندا، لە بەشە بچووکەکانەوە دەست پێدەکەیت، بۆ ئەوەی ئاوڕ لە بارودۆخە گشتییەکە بدەیتەوە؟**

-پەندێک هەیە دەڵێ بە قەد بەرەی شیعریم پێی خۆم رادەکێشم. من هیچ تێزێک یان دیدگایەکم نییە لە تێز و دیدگا گشتی و زانراوەکان بچێت، تا لێیانەوە دەست پێبکەم و لە خۆماڵییبوونەوە بگوازمەوە بۆ جیهانیبوون. ئەوەی من تێیدەگەم، ئەوەیە هیچ مرۆڤێک لەسەر گۆی زەوی نییە، بتوانێ دوور لە هەر مرۆڤێکی دیکە بژی، بەڵام تەواو باوەڕم بەوەیە هەر میللەتێک و هەر نیشتیمانێک و هەر نەوەیەک، تایبەتمەندی جیاوازی خۆی هەیە. وەڵێ سەبارەت بە شتە وردەکان و شتە گەورەکان، بە ڕاشکاوانە دەڵێم دژی ئەوەم ئەدەب باس لە کێشە گەورەکان بکات. زۆرجار ئەم کێشانە کە دەیانخوێنینەوە یان لەسەر شانۆ نمایشیان دەکەین، زۆر بچووک دەبنەوە. من لەم بەشە بچوکانەوە دەست پێدەکەم، لە ژیانی سادەی ڕۆژانەوە کە ئاوڕیان لێنادرێتەوە و ژێر پێ خراون، من لەوانەوە دەست پێدەکەم تا دەگەمە کێشە و قەیرانە گەورەکان. لەو بڕوایەدام پشتگوێخستن و ئاوڕنەدانەوەی ئەدەبی و کەلتووریمان لە بەشە بچووکەکان، ئەوە وایکردووە کێشە و قەیرانە گەورەکان لەدەست بدەین.

***ئەوەی شیعری تۆ بخوێنێتەوە، تێبینی دەکات زیادەڕۆیی و هەمان کەوتنە ناو گێڕانەوەی تێدا نییە، کە هەندێ لە شاعیرانی پەخشانە شیعر یان شاعیرانی تەفعیلە تێیکەوتوون.**

-من نووسەرێکم شەیدای زمانی عەرەبیم و کوشتەی ئەم زمانەم. وەک چۆن هەندێ خەڵک هەیە بەرامبەر بە پاکوخاوێنی یان سەرما یا گەرما وەسواسن، منیش ئاوا وەسواسم. بەڵام وەسواسی من بریتییە لە گوزارشتکردنی (دەربڕینی) باش. شیعر و هونەر و پاڵەوانییەتی و نیشتیمانپەروەری و هەموو ئەم بەهایانە بریتییە لە گوزارشتکردن لە شتێک، تا ئەم گوزارشتکردنە تازە یان داهێنەرانە بێت، ئەوا وشە شیعرییەکان زیاتر ڕوونتر و نەمرتر دەبن. گوزارشتکردن حاڵەتێکی سەیر و سەرسوڕهێنە. تەنانەت پاڵەوان گەر نەزانێ چۆن گوزارشت لە پاڵەوانییەتییەکەی بکات، هیچ دوور نییە بە ترسنۆک تۆمەتبار بکرێت و دەبەنگی ترسنۆک ئەنجامبدات. ڕەنگە کەسێک هەبێت زۆر میهرەبان بێت، بەڵام خراپ گوزارشتکردنی لە میهرەبانییەکەی، لەوانەیە ئاکامەکەی لە ئاکامی ڕەزیلی خراپتر بێت. مامەڵەکردن لەگەڵ وشە، جەوهەری داهێنانی شیعرییە.

قسەیەکی "سەعید تەقی الدین" هەیە و بەسەر شاعیردا دەچەسپێت کاتێ دەڵێ: (کەسێک دێت چیرۆکێکی بچوکت بۆ دەگێڕێتەوە کە بە ڕاستی بەسەر خۆیدا هاتووە، کەچی واتلێدەکات بخەویت. بەڵام کەسێکی دیکە دێت و هەمان چیرۆکت بە تەواوی وردەکارییەکانییەوە بۆ دەگێڕێتەوە، واتلێدەکات وریا بیت و ئامادەیت زیاد لە جارێک گوێی لێ بگریت. ئەمەیە جەوهەری ئەدەب).

*هەندێ پێیان وایە کاریگەری شیعر ئاوابووە و شیعر شوێنی خۆی بۆ ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە چۆڵکردووە، وەک ڕۆمان. ماغوت لەم بارەیەوە دەڵێ چی؟

-لەو بڕوایەدا نیم ئەم سەردەمە سەردەمی دۆڕاندنی شیعر بێت. شیعر کۆتایی نایەت، مەگەر ئەو کاتەی غەمگینی لە دونیادا نەمێنێت، پەرۆشی بۆ ئازادی نەمێنێت، ئەو کاتەی منداڵی و دڵخۆشی منداڵبوون نەمێنێت. تەنها ئەو کاتانە دەتوانین بڵێین سەردەمی شیعر بەسەرچووە.

سەرچاوە: ڕۆژنامەی (الوطن)ی سعودی

چیرۆک



# ڕۆمەن گاری

# Romain Gary

نووسەر: ڕۆمەن گاری

و. لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

لە ١٩١٤ لە ڕووسیا لەدایکبوو. لە تەمەنی ١٢ ساڵیەوە لەگەڵ دایکیدا چوو بۆ باشووری فەرەنسا و لە شاری نیس Nice و دواتر لە پاریس Paris خوێندنی تەواو کرد. لە شەڕی دوەمی جیهانیدا لە بەری «سوپای فەرەنسای ئازاد»دا تا ١٩٤٥ بەشداربوو. دواتر بە پلەی عەقید خانەنشین کرا. پاشان چووە وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی و پاشان لە ئەمریکا و ئەمریکای باشوور بوو بە سەفیری (باڵیۆز)ی ئەو وڵاتە. سەرەڕای ئەمانە سەرقاڵی ڕۆماننووسی و ڕەخنەی ئەدەبیی بوو.

ئەم ڕۆمانانەی خوارەوە بەرهەمی ئەون:

- پەروەردەی ئەوروپی ١٩٤٥
- لالە ١٩٤٦
- ڕەنگی ڕۆژ ١٩٥٢
- ڕیشەی ئاسمان ١٩٥٦ (خەڵاتی گنکۆری وەرگرت)
- مزگێنی بەیان ١٩٦٢
- ئەستێرە خۆرەکان ١٩٦٦
- سەمای چەنگیزی کۆن ١٩٦٧
- لە بەرامبەر ژیاندا ١٩٧٥

«کۆنترین داستانەکانی دنیا» ١٩٦٢ لە کتێبی سڵاو لە پێشڕەوە بەناوبانگەکانمان و لەلایەن کاوە گوڵکارەوە کراوە بە کوردی.

مردن: ١٩٨٠

# کۆنترین داستانەکانی دونیا

شاری لاپاز لە بەرزایی پێنج هەزار مەتر لە ئاستی دەریـادا بـوو. لەمە بەرزتر، ئیتر مـرۆڤ ناتوانێت هەناسە بدات. لێرەدا تەنیا لاماکان و سوورپێستەکان و دەشتی کاکی بەکاکی قاقڕ و بەفری ئەبەدی و شارە وێرانکراوەکان و هەڵۆکان دەبینرێت. لە دۆڵەکانی گەرمیانیشدا پەپوولەی گەورە و ئەو مرۆڤانەی بە شوێن زێڕدا دەگەڕێن.

شۆنێنبام بەدرێژایی ئەو دوو ساڵەی کە لە ئۆردوگای تۆرێنبێرگی ئەڵمانیادا بوو لانی کەم خەوی بە لاپاز، پایتەختی پۆلیڤیاوە ئەدی. تەنانەت کاتێک هێزەکانی ئەمریکا ئەو ئۆردوگایانەیان گرت، سەرەڕای ئەوەی چاوەڕێی نەدەکرد لە دۆزەخەکە ڕزگاری ببێت، لێ بە پێداگریەکی سەیر، وەکوو خەیاڵپەروەرێکی حەقیقی، ئەوەندەی هەوڵدا تا ناچاری کردن ڕێگای پێ بدەن لە وڵاتی پۆلیڤیا نیشتەجێ بێت.

شۆنێنبام پێشتر لە شاری وەجی لە هێشتان (پۆلۆنیا) خەریکی ئیشی بەرگدوورین بوو: کە ئەم پیشەیە، سونەتێکی مـەزن بوو کە پێنج وەچـە بەرگدووری جوولەکە جوانی و گەورەییان پێبەخشیبوو. پاش نیشتەجێبوونی لە لاپاز و پاش هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر، لە ئاکامدا توانی بە بڕێ پارە دوکانێک بکاتەوە و ناوی نا «شۆنێنبام، بەرگدووری پاریسی» بەم جۆرە توانی ڕەونەقێک بە پیشەکەی بدات. مشتەری وردەوردە ڕویان تێکرد و ئەو بە ناچاری بیری لەوە کردەوە یارمەتیدەرێک ببینێتەوە. ئەمەش سووک و سانا نەبوو. لەبەرئەوەی سوورپێستەکانی پێ دەشتەکانی زنجیرە چیای ئاند زۆر کەم حەزیان لە بەرگدووری فەرەنسیی دەکرد و دەتگوت وردەکاری دەرزی و دوورمان و تەقەڵ لەگەڵ پەنجەکانی ئەواندا تەبانەبوو. شۆنێنبام بە ناچار دەبوو کاتێکی زۆر تەرخان بکات بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی ئەو کەسە تا چاوەڕێی ئەوەبکات لە داهاتوودا، قازانجێکی باشی دەست بکەوێت.

پاش چەند جار تاقیکردنەوە و هەوڵی بێ ئاکام، ناچاربوو سـەرەڕای کاری زۆر، خۆی بە تەنیا ئەم ئیشە بەڕێوەببات. بەڵام ڕووداوێکی چاوەڕێنەکراو گرێی ئەم کێشەی بە ڕووی ئەودا بەجۆرێک کردەوە کە ئەو ئەمەی بە ئیرادەی خودا- کە بەردەوام خێر و چاکەی ئەوی ویستووە- دادەنا. چوون ئەوە بە تەنیا ئەو بوو کە لەناو سی هەزار جوولەکەی شاری وەج توانیبووی لە مردن دەربازبێت.

خانوەکەی شۆنێنبام لەسەر یەکێک لە گردە بەرزەکانی شاردابوو. هەموو بەیانییەک کاروانەکانی لاما بە بەر پەنجەرەکەی ئـەودا تێئەپەڕین. بەپێی یاسایەکی شـارەوانـی و بە لەبەرچاوگرتنی جوانکاری شار، خاوەنی ئەم ئاژەڵانە بۆیان نەبوو کە لە شەقامەکانی لاپاز هاتوچۆیان پێبکەن. بەڵام لەبەرئەوەی لە ڕێگا دوورەکان و کوێرە ڕێگاکانی کوێستانن، هیچ بەرنامەی چاکسازی لەئارادا نەبوو، لەلایەکی تریشەوە تەنیا ئەم ئاژەڵانە توانایان بوو ئەم ڕێگایە ببڕن هیچ بەربەستێک نەدەبینرا. بۆیە دیمەنی تێپەڕبوونی ئەم لامایانە، لە سپێدەدا و لە چـواردەوری شاردا، بە باری سندووق و توورەکەوە، بۆ هەموو ئەو کەسانەی ئەو وڵاتەیان دیوە تا ساڵەهای ساڵ ئاشنایە و قەت کۆن نابێت.

بەم جۆرە هەموو بەیانیەک کە شۆنێنبام دووکانەکەی ئـەکـردەوە ئـەم کاروانانەی ئەبینی. ئـەو لاماکانی خۆشئەویست و خۆشی هۆکارەکەی نەدەزانی، ڕەنگە ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی کە لاما لە ئەڵمانیا نەبوو. عادەتەن هەرچەند وەخت جارێک، دوو سێ کەسی سوورپێست، بیست سی سەر لەم ئاژەڵانەیان کۆدەکردەوە و باروبنەیەکی قورسیان لێ بار ئەکردن و بەرەو دێهاتە دوورەدەستەکانی زنجیرە چیای ئاند بەڕێ ئەکەوتن.

ڕۆژێک، لەگەڵ گزنگی خۆر، شۆنێنبام لە ڕێگەی لاپاز یەکێک لەم قافڵانەی بینی و وەکوو عادەت بزەیەک کەوتە سەر لێوی. هەر خێرا هەنگاوەکانی هێواش کردەوە و دەستی ڕاکێشا تا دەست بە پێستی یەکێک لەم ئاژەڵانەدا بێنێ. ئەو هەرگیز لە ئەڵمانیا دەستی بەسەر هیچ پشیلە و سەگێکدا نەدەهێنا و تەنانەت گوێی لە دەنگی باڵندەکانی ئەوێش نەدەگرت. بێگومان ژیان لە ئۆردوگاکانی ئەڵمانیا وای لێ کردبوو دەست بە گۆچان ڕێ بکات.

تازە سەر پەنجەی گەیشتبووە لاقەدی ئاژەڵێک، بەڵام لەناکاو چاوی بە سوورپێستێک کەوت کە بە تەنیشتیدا تێپەڕی. چاوی لێ هەڵنەدەگرت. کابرا بە گۆچانێکەوە و بە پێی خاوسی بەهێوریی ڕێی ئەکرد. شۆنێنبام لەپێشدا زۆر سەرنجی نەدا. ڕێبوارانە سەیرێکی کرد و ئەوەندەی نەمابوو کە بۆ هەتاهەتایە ئەو ڕوخسارەی لێ بزربوایە. ڕوخسارێکی زەرد و لاواز کە دەتگوت لەژێر ئازار و هەروەها سووکایەتی چەندین سەدە بۆتە ئێسقانێکی ڕەق و تەق و سواو. لێ شتێکی ئاشنا، شتێکی پێشتر نەبینراو، شتێکی ترسهێنەر لە شێوەی داوەڵ، دڵی شۆنێنبامی خستە خورپە و هەڵچوونێکی بێ سنووری لە ناخیدا دروست کرد. لێ، نەیتوانی وەبیری بێتەوە. ئەو دەمە بێ دانە و ئەو چاوە گەورە داکەوتوانە، کە لە چاوی مەڕی دەکرد و لە برینێکی ئەبەدی ئەچوو کە بە ڕووی جیهاندا کرابێتەوە و لەگەڵ ڕووی خەمناک و حاڵەتی ڕوخساری کە تژی لە پرسیار و لۆمەبوو و لە چاوانی کابرای ڕێبواردا شەپۆلی دەدا، بە جارێک دەرژایە جەستەی بەرگدوورەکە، ئەمە سەرەڕای ئەوە کە ئەم پشتی لێکردبوو نیازی وابوو ڕێگای خۆی بگرێتە بەر. لەپڕ هەژێندرا، سەری وەرگـەڕان و بە دەنگێکی نووساوەوە هاواری کرد:

– گڵۆکمان، تۆ لێرە چی دەکەی؟

بێ ئەوەی بزانێت بۆچی بە زمانی جوولەکەی ئەڵمانیا بانگی کردبوو. بەرامبەرەکەی وەک ئـەوەی گرپیان بەردابێتە جەستەی چووە کەنار جادەکە و دەستی کرد بە ڕاکردن. شۆنێنبام، بەخێرایی و بەبێ ئەوەی لە خۆی ڕاببینێت کەوتە شوێنی، لەکاتێکدا لاماکان لەسەرخۆ و مەغرور ڕێیان دەکرد، لە پێچی جادەکەدا شانی گرت و ناچاری کرد بوەستێ. خودی گلۆکمان بوو. گومانی نەبوو. تەنیا لێکچوونی ڕوخسار نەبوو. نا نا، ئەو ڕوخسار پڕ لە پرسیار و بێدەنگیە و خامۆشیە مەحاڵ بوو بیخاتە هەڵەوە.

چاوەکانی دەتگوت بە بەردەوامی دەیپرسین: ((چت دەوێ؟ لە گیانی من چیت گەرەکە؟)) لە سووچێکی بن بەستدا، پشت لە گابەردە سوورەکە، وەکوو ئاژەڵێک کەوتبێتە تەڵەوە، ڕاوەستابوو. زاری کردەوە و لێوی بەرزکردەوە و پووکەکانی دەرکەوتن.

شۆنێنبام هەمدیس بە زمانی جوولەکان هاواری کرد:

– خۆتی. ئەڵێم خۆتی!

گلۆکمان، حەپەساو، سەری بە چەپ و ڕاستدا گێڕا و بە زمانی جوولەکە کەوتە ناڵین:

– من نیم. ناوی من پێدرۆیە. من تۆ ناناسم.

شۆنێنبام، سەرکەوتوانە قیژاندی:

– کەوابوو ئەم زمانە لەکوێ فێربوویت؟ لە دایەنگەی لاپاز؟

گلۆکمان زاری کردەوە. بە ترسەوە ئاورێکی لە لاماکان دایەوە. ئەتوت داوای یارمەتیان لێ ئەکات. شۆنێنبام بە ئارامی لێی پرسی:

– ئاخر پێم ناڵێی لە چی ئەترسی، بێ بەخت؟ من هاوڕێتم. نیازت هەیە کێ تەفرە بدەی؟

گلۆکمان بە نووزە و پاڕانەوە، قریشکاندی:

– ناوی من پێدرۆیە.

شۆنێنبام بە بەزەییەوە گوتی:

– تەواو تێکچووی. باشە گریمان ناوت پێدرۆیە... ئەی بۆ ئەمەیان چی ئەڵێی؟

دەستی گڵۆکمانی گرت و سەیری پەنجەکانی کرد. تەنانەت نینۆکێکیشیان پێوە نەمابوو.
– ئەی ئەمە چیە؟ ڕەنگە سوورپێستەکان نینۆکەکانتیان دەرهێنابێت؟
گڵۆکمان خۆی بەتەواویی بە تاشەبەردەکەوە نووساند. بە ئارامی دەمی کەوتە جووڵە.
لەپڕ فرمێسک ڕژایە سەر گۆنای. زمانی ئەیگرت. سەرەنجام وتی:
– باشە نامدەی بە گرتن؟
– تۆ بدەم بە گرتن؟ بەکێ؟ بۆچی؟
جۆرێک زانینی ترسهێنەر لەناکاو بینی گرت. هەناسەی سواربوو. ئارەق بە ناوچەوانیا هاتەخوار. ترسێک هێرشی بۆ هێنا. ترسێکی پڕ لە شەرم، لەگەڵ بیرهێنانەوەی بیرەوەریی کۆنی ڤێزەون بە پانتایی زەوی. هێور بۆوە و هاواری کرد:
– لێ تەواوبوو. پازدە ساڵ، بەڵێ کۆتایی پێهات، کۆتایی!
گوێزەی ملی درێژ و باریکیی گڵۆکمان کەوتە جووڵە. پێکەنینێکی تاڵ کەوتە سەر لێوی و خێرا بزربوو.
– هەموان وائەڵێن. ئارەزوو، هیوا، لێ من بڕوام پێ نیە.
شۆنێنبام هەستی کرد هەناسەی بۆ نایەت. بە زەحمەت هەناسەیەکی هەڵکێشا: لە بەرزایی پێنج هەزار مەتردا بوون. لێ ئەمە پەیوەندیی بە بەرزاییەوە نەبوو. بە لەحنێکی سەیرەوە گوتی:
– گڵۆکمان، تۆ بەردەوام گێل و گێژبووی. بەڵام هەوڵێک بدە. ئیتر کۆتایی پێهات. نە هیتلەر ماوە، نە ئاس ئاس و نە ژووری گاز. تەنانەت ئێمە وڵاتێکمان هەیە نێوی ئیسرائیلە. ئیتر تەواو بوو. پێویست ناکات خۆمان حەشاربدەین.
گڵۆکمان بەبێ تۆزکاڵێک دڵخۆشی، کەوتە پێکەنین:
– ها... ها... ها... هەمووی کەشکە.
شۆنێنبام وەک بلوورێنێت وتی:
– چی کەشکە؟
گڵۆکمان بە دڵنیاییەوە گوتی:
ئیسرائیل. بوونی دەرەکی نیە!
شۆنێنبام پێی دا بە زەویدا و وەک هەور گرماندی:
– چۆن بوونی نیە؟ بوونی هەیە! مەگەر ڕۆژنامە ناخوێنیتەوە؟
گڵۆکمان زیرەکانە خۆی دایە گێلی و گوتی:
– ها. کە چی؟
– ئاخر لە لاپاز، ئیسرائیل کونسولگەری کردۆتەوە. هەر لەم شارە. دەکرێت ڤیزا بگری و بڕۆی بۆ ئەوێ.
گڵۆکمان بە دڵنیاییەوە گوتی:
– هەمووی درۆیە. ئەمەیش فرت و فێڵی ئەڵمانیەکانە.
هێدی هێدی مووی جەستەی شۆنێنبام سیخ دەبۆوە. ڕوخساری زیرەکانە و حاڵەتی گڵۆکمان ترسی خستە دڵی شۆنێنبامەوە. لەناکاو بیری کردەوە: ئەگەر حەق بەو بێت چی؟ ئەڵمانیەکان هەموو شتێکیان لێ دەوەشێتەوە. پێدەچێت فێڵێک لە ئارادابێت. شناسنامە و ئەو بەڵگەنامانەی کە دەیسەلمێنێت تۆ جوولەکەیت ببیە بۆ فلان شوێن تا ئەوان تۆ بە بەلاش بنێرن بۆ ئیسرائیل. خۆت دەناسێنیت. سوار کەشتیت دەکەن و لەپڕ لە ئۆردوگای مردنەوە سەر هەڵدێنیت. خودایا، بیر لە چی دەکەمەوە؟ ناوچەوانی وشک ببوو. ویستی پێبکەنێت. لێ گوێی لە قسەکانی گڵۆکمان بوو کە بە زیرەکییەوە دەیگوت:
– ئیسرائیل فێڵێکە بۆ ئەوەی هەمووومان خڕبکەنەوە. هەموو ئەوانەی توانیویانە خۆیان بشارنەوە. تا دواتر هەموویان بنێرن بۆ ژووری گاز. بیرۆکەیەکی باشە؟ وانیە؟ ئەم کارانە لە ئەڵمانیەکان دەوەشێتەوە. دەیانهەوێت هەموومان تا دواهەمین کەس کۆبکەنەوە و... دواتر... باشیان دەناسم.
شۆنێنبام، لەسەرخۆ، وەکو لەگەڵ منداڵێک قسەبکات گوتی:

– تەواو بوو. پێت دەڵێم کۆتایی هات.
گڵۆکمان بە دڵنیاییەوە گوتی:
– هەمووی درۆ و فرت و فێڵە.
شۆنێنبام دەستی خستە دەور ملی و گوتی:
– وەرە بچینەوە بۆ ماڵی ئێمە. دەبێت دوکتۆر بتبینێت.
دوو ڕۆژی خایاند تا توانی لەنێوان قسە سەیر و سەمەرەکانی ئەودا بە شتێک بگات.
گڵۆکمان پاش دەربازبوون لە ئۆردوگا، کە هۆکارەکەی کێشەی نێوان دژەجوولەکەکان بوو لە پێدەشتە بڵندەکانی چیای ئاند خۆی حەشاردابوو. چوون دڵنیابوو وەزعەکە ناگۆڕێت. لێ ئەگەر بتوانێت فریویان بدات و بڵێ لە چیاکانی سیرا کاروانچیم، ڕەنگە بتوانێت لە دەست گشتاپۆ خۆی ڕزگاربکات.
لێ هەر هەوڵ و تەقەلایەکی شۆنێنبام بۆ ئەوەی تێیبگەیەنێت کە هیتلەر مردووە و گشتاپۆ بوونی نیە و ئەڵمان داگیرکراوە بێ سوود بوو. گڵۆکمان شانی هەڵدەتەکاند و قیافەیەکی زیارەکانەی بە خۆوە دەگرت: ئەو لێزانترە و نابێت بە تەڵەوە. شۆنێنبام کە قسەی پێ نەدەما، چەند وێنەیەکی ئیسرائیلی دەردەهێنا و پێی نیشان ئەدا. لێ گڵۆکمان درووددێکی دەخوێند و دواتر بۆ ئەو قوربانیە دڵسافانەی کە فریوی دوژمنیان خواردبوو و کۆببوونەوە تا ئاسانتر بیانکوژن، دەگریا.
چەندساڵ بوو شۆنێنبام دەیزانی کە تێکچووە. دەیزانی بە نیسبەت توانای عەقڵیەوە، هێشتا جەستە باشتر بەرگەی ئەو ئەشکەنجە و ئازارانەی گرتووە. لە ئۆردوگا، هاوپتمان شۆلستە، فەرماندەی ئاس ئاس بە گڵۆکمانی ڕائەبوارد. ئەو پیاوکوژێک بوو کە فەرماندە پلەبەرزەکانی ئەڵمان بەتایبەت هەڵیان بژاردبوو و متمانەی تەواویشیان پێبوو کە بە ڕێکوپێکی ئەرکەکانی جێ بەجێ دەکات. بە هۆکاری نادیار، گڵۆکمان سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو و ئەوەندە ئازاری ئەدا کە زیندانیەکان هیچ کامیان پێیان وانەبوو بتوانێت بە زیندوویی لەژێر دەستی ئەو ڕزگاری ببێت.
ئەویش وەکو شۆنێنبام پیشەی دروومان بوو. هەرچەند پەنجەکانی بەتەواویی نەیاندەتوانی بە دەرزی ئیش بکات لێ ئەو بە لێهاتوویی خێرا بە ئاستێکی بەرز گەیشت و دوکانی «بەرگدووری پاریسی» لە ئاکامدا توانیبووی ئیشەکانی بە جوانی جێ بەجێ بکات.
گڵۆکمان لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد. لە سووچێکی تاریک لەسەر زەوی هەڵدەنیشت و بەدوور لە چاوی مشتەریەکان سەرقاڵی ئیشی خۆی دەبوو و تەنیا شەوانە سەردانێکی دەرەوەی دەکرد، بیری لاماکانی دەکرد. حەزی لێبوو دەست بەسەر پێستیاندا بهێنێت. هەمیشە لە ڕوانینیدا، بریسکەیەکی ئازاراوی دەبینرا. نوورێکی مەعریفە ئاوێتە لەگەڵ بزەیەکی فێڵاوی وەک بڵێی سەرترە و لە هەموو شتەکان تێدەگات بەخێرایی لە ڕوخساریدا دەردەکەوت. سەرلەنوێ ویستی ڕابکات.
دووجار هەوڵی ڕاکردنی دابوو: ((یەکەم جار کاتێکبوو کە شۆنێنبام بەڕێکەوت پێی گوتبوو ئەمڕۆ سێزدەهەمین ساڵیادی ڕووخانی ئەڵمانی هیتلەریە و جاری دووهەم وەختێک بوو کە سوورپێستێکی سەرخۆش لە کۆڵانەکاندا هاواری دەکرد کە بەمزووانە سەرکردەیەکی گەورە لە شاخەکان دێتە خوار و کارەکان ئەگرێتە دەستی خۆی))
تەنیا، شەش مانگ پاش ئەم چاوپێکەوتنە، لە حەفتەی «یوم التکفیر»دا بوو کە گۆڕانکاریەک لە هەڵسوکەوتی گڵۆکماندا بینرا. هەست دەکرا دڵنیایی بە خۆی زیاتربووە و وەکوو کەسێک لە کۆت و بەند ڕزگاری بووبێت تاڕادەیەک ئارام و ئاسوودەگی پێوە دیاربوو. ئیتر لە وەختی ئیشکردنیدا خۆی نەدەشاردەوە. شۆنێنبام بەیانیەک کە چووە دوکان سەیری کرد گڵۆکمان لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەڵێت. سەری سوورمابوو، گۆرانی و ئەوییش یەکێک لە مەقامە کۆنەکانی جوولەکەکانی دانیشتووی پێدەشتەکانی

رووسیا. سەری هەڵهێنا. بەخێرایی سەیرێکی هاورێکەی کرد. دەزووەکەی برد بە دەمدا و تەڕی کرد و دەرزیەکەی پێوەکرد و لەگەڵ ئەمەشدا هەروەها ئەو مەقامە کۆنە خەمناکەی دەگوتەوە.

شۆنێنبام خۆشی کەوتە دڵیەوە: ڕەنگە ئەمە سرانەوەی ئەو بیرەوەریە پڕ لە ئازار و خەمانە بوو کە ساڵەها لە مێشکیدا مابوو. عادەتەن پاش شێوکردن، گڵۆکمان خێرا دەچوو لەسەر دۆشەکی سووچی دوکانەکە ئەخەوت. بەڵام خەوی سووک بوو. چەندین سەعات لەسەر پێخەفەکەی خۆی گرمۆڵە دەکرد، بە ترسەوە سەیری دیوارەکانی دەکرد. هەرشتێک لە ژوورەکە سامێکی تێدابوو هەر دەنگێکیش لای ئەو دەبوو بە هاوار و قیژەی کاتی مردن. بەڵام شەوێک دوای داخستنی دوکان شۆنێنبام لەپڕ گەڕایەوە بۆ کلیلێک کە بەجێی هێشتبوو. سەیری کرد هاورێکەی خەریکە برێک نان و خواردەمەنی دەخاتە ناو قرتاڵەکەیەوە. بەرگدوور کلیلەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە. لێ لەبری ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵەوە لە کۆڵانێکدا خۆی شاردەوە و چاوەڕێ مایەوە. لەپڕ گڵۆکمانی بینی کە سەبەتەیەک خواردەمەنی بە دەستەوە و هاتە دەرەوە و لە تاریکی شەودا بزربوو.

شۆنێنبام زانی کە هاورێکەی هەموو شەوێک بەم سەبەتە خواردەمەنیەوە لە دوکان ئەچێتە دەرەوە و دواتر بە سەبەتەیەکی بەتاڵ و ڕوخسارێکی کراوە و گەش وەکوو کارێکی باشی کردبێت دەگەڕایەوە. بەرگدوور کەوتە گومان ویستی لە یارمەتیدەرەکەی بپرسێت کە ئەم هاتوچۆیانە لە شەودا بۆچییە؟ بەڵام چوون سروشتی ئەوی دەناسی و دەیزانی هیچ نادرکێنێت و تازە ڕەنگە سڵی لێ بکاتەوە هاتە سەر ئەو قەناعەتە پرسیاری لێ نەکات. پاش کاروباری ڕۆژانە، لە کۆڵان بۆسەی بۆ دانا و هەر کە بینی تارماییەکە بە پێ دزە لە دوکان هاتە دەرەوە و بە دزیەوە بەرەو شوێنی مەبەست دەڕوات کەوتەشوێنی.

گڵۆکمان بە خێرایی بە تەنیشت دیوارەکاندا تێدەپەڕی و هەندێ جار ئاورێکی لە پاش خۆی دەدایەوە نەوەک کەسێک بە شوێنیەوە بێت. بەرگدوورەکە ئەم هەموو حەزەر و موڵ و مۆی دەبینی سەری بەتەواویی سوورمابوو. لەپشت دەرگایەک بۆ بەر دەرگایەکی تر وەک سێبەر بە شوێنیەوە بوو هەرجارێکیش کە هاورێکەی ئاوڕی ئەدایەوە خۆی دەشاردەوە.

شەو بوو و لەبەر تاریکی، شۆنێنبام چەند جارێک شوێن پێکانی لێ بزر دەبوون. لێ هەرجارێک سەرەڕای قەڵەوی و کێشەی دڵی، خێرا خۆی لێ نزیک دەکردەوە. لە کۆتاییدا، لە کۆڵانی «شۆڕش» گڵۆکمان خۆی کرد بە حەوشەی ماڵێکدا. بەرگدوور ئیستێکی کرد و بەسەر پەنجە کەوتە شوێنی. چووە ناو حەوشی کاروانسەرایەکی گەورەی نزیک بازاڕ، کە هەموو ڕۆژێک لاماکان لەوێوە باردەکران و ڕێی کوێستانیان ئەگرتە بەر. چەند سوورپێستێک لەناو بۆگەنی شیاکە، لەسەر کا نووستبوون. لاماکان، ملی درێژیان دەرهێنابوو و سەریان ئەکرد بە ناو باروبنە و شتومەکی دوکانەکاندا. لەبەرامبەریدا کۆڵانێکی تەسک و تاریکی لێبوو. گڵۆکمان دیارنەما. بەرگدوور نەختێک ڕاوەستا، شانێکی هەڵتەکاند و ویستی بگەڕێتەوە.

گڵۆکمان، لەبەرئەوەی کەس نەتوانێت شوێن پێی هەڵبگرێت و دوای بکەوێت ڕێگایەکی دوور و درێژی گرتبوە بەر. شۆنێنبام ویستی ڕاستەوخۆ بەرەو بازاڕ بگەڕێتەوە. چووە ناو قەیسەریەکی تەنگ کە ئەیبردەوە سەر بازاڕ. لێ لەناکاو، تروسکەی چرایەکی نەوتی کەلەکونی هەواکێشی کە لە ژێرزەمینەکەوە هاتبووە دەر، سەرنجی ڕاکێشا. سەیرێکی تیشکەکەی کرد و چاوی بە گڵۆکمان کەوت. لەبەردەم مێزێکدا ڕاوەستابوو. خواردەمەنیەکانی لە سەویەکە دەرهێنا و نایە بەردەم زەلامێک کە لەسەر تەپڵەکێک دانیشتبوو

و پشتی بە کونی هەواکێشەکەوە بوو. سۆیسێک و بتڵە بیرەیەک و هەندێ نان و بیبەری لەسەر مێزەکە بۆ دانا. زەلامەکە کە شۆنێنبام نەیدەتوانی ڕوخساری ببینێت چەند قسەیەکی کرد. گلۆکمان سەبەتەکەی پشکنی و جگەرەیەکی چەڵتووکی دەرهێنا و ئەویشی نایە سەر مێزەکە. بەرگدوور هەوڵێکی زۆری دا تا ڕوخساری برادەرەکەی نەبینێت. پێدەکەنی و ترس بە سیمایەوە دیاربوو. چاوە دەرپەڕیوەکانی بڕیبووە زەلامەکە و ڕوخساری لە شتێکی سەرکەوتووی دەکرد.

لەو ساتەدا کابرا سەری وەرچەرخان. شۆنێنبام ناسیەوە. شۆلستە، فەرماندەی ئاس ئاس، پیاوکوژەکەی ئۆردوگای تۆرینبۆرگ بوو. بۆ چرکەیەک وایدەزانی خەیاڵ هەڵگیرتوە یاخود چاوی ڕێشکە و پێشکە دەکات. لێ ئەم ڕوخسارە لەوانە نەبوو هەتاهەتایە لەبیر بچێتەوە. وەبیری هاتەوە کە شۆلستە پاش شەڕ ون بووە. هەندێک دەیانگوت مردووە و بڕێک پێیان وابوو زیندووە و لە ئەمریکای باشوور خۆی شاردۆتەوە. ئێستە ئەوی لە بەرامبەر خۆیدا دەدی. دێوێکی کەتە و خۆبەزلزان بە موویەکی کورت و لوول و دەشە خەندەیە لەسەر لێوی. بەڵام لەو ترسناکتر بوونی گلۆکمان بوو. ئایا بشێ تێکچووبێت وا هاتۆتە ئێرە و لەبەرامبەر زەلامێکدا وەستاوە کە خۆی قوربانی هەڵبژاردەی دەستی ئەوبوو. هەر ئەو کەسەی کە ساڵێکی ڕەبەق هەموو جۆر ئەشکەنجەیەکی لەسەر جەستەی گلۆکمان تاقی کردەوە. ئێستا ئەمە چ شێتیەکە کە وای لێکردوە هەموو شەوێک بێتە ئێرە و نان و خواردەمەنی بۆ بێنێت لەبری ئەوەی بیکوژێت یاخود ڕادەستی پۆلیسی بکات.

شۆنێنبام هەستی کرد مێشکی خەریکە تێکدەچێت: ئەوەی دەبینی وەکوو کۆی ئازارەکان بۆی تەحەمول نەدەکرا. ویستی هاواربکات، خەڵک بێن بە یارمەتیەوە و بیان هەژێنێت. بەڵام تەنیا توانی دەمی بکاتەوە و پەنجەکانی بجووڵێنێت: دەتگوت دەنگی بە قسەی ناکات و سەرکێشی دەکات. شۆنێنبام هەر لەوێ و بە چاوی دەرپەڕیوەوە سەیری مەزڵوومێکی دەکرد کە خەریکبوو سەری بیرەکەی هەڵدەچڕی و بە هێوریی بیرەی ئەکردە پەرداخی زاڵمە ئەشکەنجەگەرەکەی. لە شوێن خۆیدا وشک ببوو. ئەو دیمەنەی بەرچاوی ئەوەندە پیس و ناشرین بوو کە ئیحساسی واقیعیەتی لێ زەوت کرابوو.

تەنیا کاتێک دەنگی هاوارێک لە نزیکەوە هاتە گوێی، بە خۆیدا هاتەوە: لەژێر تیشکی مانگەشەودا گلۆکمانی بینی. هەر دوو بۆ ماوەیەک چاویان بڕیە یەکتر: یەکیان تووڕە و سەرسووڕماو و ئەوی دی بە بزەیەکی پڕ لە فێڵ و بە دڵڕەقیەوە و بە دوو چاوەوە کە گڕی شێتی کڵپەی تێدا سەندبوو. لەم کاتەدا شۆنێنبام دەنگی خۆی هاتە گوێی و بە زەحمەت ناسیەوە:

- پێم بڵێ، ئەم کابرا ساڵێکی تەواو تۆی ئازار داوە، جەستەتی کوشتووە و بە قوڵاپدا هەڵواسیوە ئێستاش لەبری ئەوەی پۆلیس ئاگاداربکەیتەوە هەموو شەوێک نان و خواردنی بۆ دەبەیت؟ ئەمە مەحاڵە یان من خەودەبینم؟ تۆ چۆن دەتوانیت ئەم کارە بکەیت؟

مەکرێکی مەعنادار کەوتە سەر سیمای پیاوە قوربانیەکە و لە قووڵایی سەدەکانەوە دەنگێکی هەزار ساڵە هاتە دەرەوە کە مووی لەشی بەرگدوورەکەی ڕاست کردەوە و دڵی لە لێدان و خورپە کەوت:

- ئاخر بەڵێنی داومەتێ جارێکی تر لەگەڵ مندا میهرەبان بێت!.

**سەرچاوە:**

٢١ داستان لە نووسەرانی سەردەمی فەرەنسا.

چاپەمەنی نیلوفەر ٢٠١١ تاران.

لە فەرەنسیەوە بۆ فارسی: ئەبولحەسەن نەجەفی.

لا ٢١٥- ٢٢٦

ئەدەبیاتی نامە

# نامە بۆ میلنا

نووسینی: فرانز کافکا

لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد



## پراگ ۹ ژولای ۱۹۲۰ - هەینی

۱۲) بە ڕای من نووسین هەرچۆنێک بێت هەر بێ هودەییە. بەڕاستیش وایە. لەوانەیە باشترین کار بۆ من ئەوەبێت بێم بۆ ڤیەنا و تۆیش لەگەڵ خۆمدا بەرم. ڕەنگە بەم کارەیش قایل نەبیت. بەڵام من دەیکەم. لەڕاستیدا لێرەدا دوو گریمانە هەیە کە یەکێکیان لەوی تریان جوانترە. تۆ یان دێیت بۆ پراگ یان دەچیت بۆ لیبسیک١ لەکاتێکدا کە بڕوام بە ئاینی کۆنی جوولەکە نیە. دوێنێ بە دزیەوە چووم بۆ لای ژیولسکی٢. کەمێک پێش ئەوەی بڕوات بۆ لیبسیک بە گیرم هێنا. نامەکەی تۆی لابوو بۆ ئوستازا. پیاوێکی بێ وێنەیە. چالاک و ڕاستگۆ و هۆشیارە. قسە دەکا و لە هەمووشتێک دەگات و تەنانەت کەمێک زیاتر (تێدەگات). دەیویست لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڕوات بۆ لای فلورین٣ کە لە نزیک برنەو دەژی. لەوێوە بێت بۆ ڤیەنا بۆ لای تۆ. بڕیارە پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ بگەڕێتەوە بۆ پراگ و وەڵامەکەی ئوستازا لەگەڵ خۆیدا بێنێت. سەعات سێی دوای نیوەڕۆ من وادەم لەگەڵیدا هەیە دوای ئەوەیش تەلگورافت بۆ دەکەم. لەو قسە بێ سەرەوبەرانەی لە یانزە نامەی پێشوودا نووسیومن داوای لێبوردنت لێ دەکەم. نامەکان فڕێدە. هەنووکە نۆرەی ڕاستیە کە گەورەتر و چاکترە. لەم چرکەساتەدا من وای بیر لێ دەکەمەوە کە خۆشەویستیی تۆ بۆ مێردەکەت تاقە شتێکە دەبێت لێی بترسیت. تا ئەو شوێنەی باسەکە پەیوەندی بە شتێکی تازەی ترەوە هەیە و تۆ لەوبارەیەوە نووسیوتە، بێگومان کارێکی دژوارە. بەڵام ئەو هێزە بە کەم مەگرە کە من بە تۆوە دەبەستێت. هەرچەندە هەر خەوم لێ ناکەوێت، بەڵام دوای ئەوەی دوێنێ شەو دوو نامەی تۆم پێ گەیشت ئێستا زۆر لەوەی جاران بیرم لێ دەکردەوە ئارامترم. (بە ڕێکەوت ئەوکاتەی نامەکانت گەیشتن ماکس لێرەبوو. بێگومان دۆخەکە لەبار نەبوو. چونکە هەرچۆنێک بێت، ئەم کارە زیاتر تایبەتیە و پەیوەندیی بە شەخسی منەوە هەیە. ئاهـ، میلنای داماو، دیسانەوە ئیرەیی کەسێک دەستی پێ کرد کە خۆی حەزی بە ئیرەیی نیە) هەروەها تەلگورافەکەی ئەمڕۆت کەمێک دڵنەوایی و هیوریم پێ دەبەخشێت. هیچ نەبێت لەم چرکەساتەدا، بەرانبەر بە مێردەکەت ئەوەندە دوودڵ نیم کە نەتوانم خۆم بگرم. ئەرکی گەورە لە ئەستۆی ئەودابوو، ڕەنگە تاڕادەیەک شەرافەتمەندانە ئەو ئەرکەی بە ئەنجام گەیاندبێت. لەوە دڵنیانیم بتوانێت تا سەر ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت. نەک لەبەرئەوەی نەتوانێت (توانای من بەرانبەر بە توانای ئەو چی پێ دەکرێت؟) بەڵکوو لەبەرئەوە کە بەپێی ئەوەی تائێستا ڕوویداوە باری بەرپرسیاریەتی ئەو لەڕادەبەدەر قورسە و گوشارەکەی سەری گەلێک زۆرە. هەروەها لەو لایەنەیشەوە کە ئەو حەوسەڵەیەی بۆ ئەم کارە پێویستە لەوەوە زۆر دوورە. جگە لەوە دەکرێت ئەم مەسەلەیە کارەکەی ئەو ئاسانتر بکات؟٤ بۆ نابێت من نامەی بۆ بنووسم؟

**- ف -**

---

١- Libesic

٢- ڕوولفا ژیولسکی مێردی ئوستازای هاوڕێی میلنا.

٣- Josef Florian (١٨٧٣- ١٩٤١) نووسەر و خاوەن چاپخانەی دیاری کاسولیک کە یەکەم وەرگێڕ و بڵاوکەری شیعری کاسولیک بوو. ساڵی ١٩٢٩ یەکەم وەرگێڕانی ڕۆمانی (مەسخ)ی کافکای بە زمانی چیکی کرد.

٤- لە دەقە ئەسڵیەکەدا ڕستەکە خەبەریە بەڵام بە نیشانەی پرسیار کۆتایی هاتوە.

## پراگ ٩ ژولای ١٩٢٠ - هەینی

١٣) تەنیا چەند وشەیەک لە بارەی نامەکەی ئوستازاوە دەنووسم (مامم چاوەڕێمە، ئەو شتەی بۆ کاتی تر دڵگیر و بۆ ئێستا و لەم چرکەساتەدا بەڕاستیی بێزارکەرە) دەی، نامەکەی ئوستازا گەلێک هاوڕێیانە و پڕ لە خۆشەویستیە، بەڵام تاقە کەمایەسیەکی تیایە، لەوانەیە کەم و کووڕیەکی کەم یان ڕەنگە هەر ڕواڵەتی و تەشریفاتی بێت. (مەبەستم لەم قسەیە ئەوەنیە ئەو نامانەی ئەم کەمایەسیەیان تیا نیە دلۆڤانتر بن، ڕەنگە پێچەوانەکەی ڕاست بێت) بەهەرحاڵ شتێک هەیە کە ئەم نامەیە کەم و کورتیی تیابێت یان زۆریشی تیابێت. ڕەنگە ئەو شتە توانای بیرکردنەوەیەک بێت کاریگەریەکەی لە مێردەکەی ئوستازاوە هاتبێت. چونکە ئەوییش دوێنێ بەڕاستیی هەر بەو جۆرە لەگەڵ مندا دەدوا. بەڵام بۆ دەبێت من لە بارەی مرۆڤگەلێکەوە کە بەڕاستیی چاکن بەو جۆرە بدوێم؟ ئیرەیی پێ بردن. لە ڕاستیا هۆکارەکەی ئیرەییە. بەڵام میلنا، بەڵین دەدەم هەرگیز بە ئیرەیی خۆم ئازار بە تۆ نەگەیەنم. بەڵکوو خۆم و تەنیا خۆم ئازاربدەم. لەگەڵ ئەوەیشدا وادەردەکەوێت کە لە نامەکەدا بەدحاڵی بوونێک پێش هاتبێت. ئاخر تۆ نە داوای ئامۆژگاریت لە ئوستازا کردوە و نە داوات لێ کردوە بچێتە لای مێردەکەت و قسەی لەگەڵدا بکات. ئەوەی لەوکاتەدا داوات لەو کردوە شتێکە هیچ شتێکی دی جێگای ناگرێتەوە: تەنیا ئامادەبوونی خودی ئەوە و بەس. لانی کەم من وای دەبینم. هیوادارم ئەمڕۆیش هەواڵێکی تری تۆم پێ بگات. من سەرمایەدارێکم بێ ئاگام لە هەموو ئەو شتانەی کە هەمە. ئەم دوانیوەڕۆیە لە ئۆفیسەکە بێ هوودە چاوەڕێی هەواڵێکی تۆ بووم، نامەیەکیان دامێ کە کەمێک دوای دەرچوونی من لە مرانەوە گەیشتبوو. خوێندنەوەی نامەکە شتێکی سەیر و سەمەرەوە.

کافکاکەت

## پراگ ١٠ ژولای ١٩٢٠ - شەممە

١٤) ئەمە خراپە، پێرێ دوو نامەی ناخۆشم پێگەیشت و دوێنێیش تاقە تەلگورافێک (ئەگەرچی دڵنیاکەر بوو، بەڵام لەبەرئەوەی هەندێک جار تەلگورافەکان لەوەدەچێت کەمێک پینەوپەڕۆکرابێتن وایە) ئەمڕۆ هەر هیچ نامەم پێ نەگەیشتوە. تێکڕا نامەکان لە هەموو لایەنێکەوە بۆ من دڵخۆشکەر نەبوون. لەو نامانەدا باست لەوە کردبوو کە نامەی تر دەنووسیت و تائێستا هیچ. دووشەو لەمەوبەر تەلگورافێکی خێرام بۆ ناردیت و پێشەکیی پارەی وەڵامەکەیشم دا. دەبوو وەڵامەکە دەمێک بوایە بە من بگەیشتایە. وا جارێکی تر دەقەکەیت بۆ دووبارە دەکەمەوە: ((ئەوە تاقە کارێک بوو دەبوو بکرایە. لەسەرخۆبە. ماڵەکەی تۆ ئێرەیە. لەوانەیە ژیلوسکی و هاوسەرەکەی هەفتەیەکی تر بێن بۆ ڤیەنا.



من چۆن بتوانم پارە بنێرم؟)) هیچ وەڵامێکی ئەم تەلگورافەم نەدراوەتەوە. بە خۆمم وت: ((برۆ بۆ ڤیەنا، بەڵام میلنا حەزی بەم کارە نیە. تەواو دڵنیام کە حەزی لەم کارە نیە. دەبێت تۆ بڕیارێک بدەیت. ئەو تۆی ناوێت. لە گومان و دوودڵیدایە. هەر لەبەرئەوەیشە ئوستازای داواکردوە)) لەگەڵ ئەوەیشدا من دەمەوێت بجووڵێم، بەڵام حاڵم باش نیە. هەرچەندە ئارامم، ئارامیەکی رێژەیی کە لەم ساڵانەی دواییدا ئومێدی ئەوەم نەبوە وابم. بەڵام بە درێژایی ڕۆژ و هەندێک جار شەوانییش، بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێک خراپ دەکۆکم. ڕەنگە لەبەرئەوەبێت کە تازە لەسەر هەوای پراگ ڕادێمەوە دوای کۆتایی ئەو ڕۆژانەی لە مران جڵەوم لە دەست دابوو هێشتا تۆم نەناسیبوو. چاویشم نەبڕیبوە قوڵایی چاوە شینەکانت. ڤیەنا چەندە تاریک بوە و بەڵام بۆ ماوەی چوار ڕۆژ چەند ڕووناکبوو. کاتێک من لێرە دانیشتووم، کاتێک دەست لە نووسین هەڵدەگرم بۆ ئەوەی سەر بخەمە سەر دەستم. لەوێ، لە ڤیەنا چۆن بیرم لێ دەکەنەوە؟

**- ف -**

من هەر بەو جۆرەی لەسەر کورسیەکەم دانیشتووم و لە پشت پەنجەرە کراوەکەوە تەماشای باران دەکەم، گریمانەی جۆربەجۆرم بە بیردا دێت. ڕەنگە تۆ نەخۆش یان ماندووبیت. یان لەناو جێگادا کەوتبیت. یان خاتوو کوهلەر٥ ببێتە هۆکار و ئەوسا، ئای کە سەیر دەبوو، زۆر ئاسایی و بە شێوەیەکی سروشتی، دەرگا بکرێتەوە و تۆ لەوێ وەستابیت.

---

٥- Frau Kohler لە هاورێ نزیکەکانی میلنایە کە لە پانسیونێکی ڤیەنا لای ژن و مێردێک دەژیا.

## پراگ ١٢ ژولای ١٩٢٠ دووشەممە

١٥) بەکورتی، ئەم دوو ڕۆژەی تێپەڕی ڕۆژانێکی ترسناک بوون. لێ ئێستا لەوە تێدەگەم کە تۆ بەتەواویی بێ تاوان بوویت. شەیتانێکی بەدفەڕ لە ڕۆژی پێنج شەمەوە نامەکانی تۆی ڕاگرتوە. ڕۆژی هەینی تەلگورافەکەتم بە دەست گەیشت. شەمە هیچ، یەکشەممە هیچ و ئەمڕۆ چوار نامە گەیشت کە مێژووی پێنج شەممە و هەینی و شەممەیان پێوەبوو. من لەوە شەکەتترم بە چاکیی بنووسم. لەوە شەکەتتر کە ئەم چوار نامەیە، ئەم کێوی نائومێدیە، ئەم ئازار و عەشقە جیابکەمەوە. هیچ بۆ من نامێنێتەوە. هەرکاتێک کەسێک شەکەت بێت و دوو شەو و دوو ڕۆژ لە ترسناکترین بیرکردنەوەدابێت، گەلێک خۆویست دەردەچێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا– ئەمە ئەو شتەیە کە پەیوەندیی بە توانا بەخشینی ژیانی تۆوە هەیە دایکە میلنا – لەگەڵ ئەوەیشدا من، لە ماوەی حەوت ساڵی ڕابووردودا، کەمتر لە هەر کاتێکی دی، جگە لەو ساڵەی لە گوند بووم، هەست بە تێکشکان بکەم.

تائێستا لەوەناگەم بۆ وەڵامی تەلگورافە گرنگەکەی شەوی پێنج شەممەی منت نەداوەتەوە. دوای ئەوە تەلگورافێکیشم بۆ خاتوو کوهلەر نارد و ئەوییش وەڵامی نەبوو. لەو لایەنەوە کە من نامە بۆ هاوسەرەکەت بنێرم هیچ مەترسە. لەڕاستیا من حەزم لەو کارە نیە. تاقە ئارەزووم ئەوەیە بێم بۆ ڤیەنا. تەنانەت ئەگەر بەربەستێک بۆ ئەوەیش هەبێت، بۆ نموونە تۆ حەزت بەو سەفەرە نەبێت، کێشەی گوزەرنامە، ئۆفیسەکە، کۆکین. شەکەتی و زەماوەندیی خوشکم (ڕۆژی پێنج شەممە) نەبوایە ئەو کارەم هەر نەدەکرد. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، گەشت و گەڕان بۆ ڤیەنا لە دوانیوەڕۆکانی ڕۆژانی شەممە و یەک شەممەی ڕابردوو چاکترە. ڕۆژی شەممە، ماوەیەک لەگەڵ مامم و ماوەیەکیش لەگەڵ ماکسا ئەملا و لامان کرد. هەر دوو سەعات جارێک سەرم لە بەڕێوەبەریەتی پۆستە دا بەڵکوو نامەیەکم بۆ هاتبێت. عەسرەکەی باشتربوو. چووم بۆ لای لاورین و هەواڵی خراپی تۆی لانەبوو. ئاماژەی بە نامەکەی تۆ کرد و من پێ خۆشحاڵ بووم. تەلەفونی بۆ کیش٦ کرد لە بڵاوکراوەی (ئازادی نوێ) ئەوییش هەواڵی لانەبوو. بەڵام نەیدەویست لە بارەی تۆوە هیچ پرسیارێک لە هاوسەرەکەت بکات. بڕیاربوو ئەمشەو تەلەفون بکاتەوە، لەوێ لە پاڵ لاورین دانیشتم. چەندجارێک ناوی تۆی هێنا و منی سوپاس گوزار کرد.

لە لایەکی ترەوە قسەکردن لەگەڵ ئەودا نە لەبەردڵانە و نە ئاسانیشە. ئەو لە منداڵێک دەچێت، بەڵام نەک منداڵێکی زۆر وریا. ئەو لاف لێ دەدات، درۆ دەکات و وەک منداڵ گەپجاڕی دەکات. بەکورتی کاتێک لە پاڵیا دانیشتوویت و گوێ لە قسەی دەگریت. لەڕادەبەدەر هەست بە شتی پەنامەکیی دەکەیت، بە شێوازێکی بێزارکەر هەست بە ڕواڵەت بازی و تەمسیل دەکەیت. بەتایبەتیی کە ئەو هەر منداڵ نیە، بەڵکوو دەربارەی هەر شتێکی باش، بۆ هاوکاریی بۆ

٦- Paul Kisch هاوقوتابیەتی کۆنی کافکا و ئەندامی دەستەی نووسینی بڵاوکراوەی (ئازادی نوێ) Neue Freie Prees بوو.

نیازپاکی. ئامادەیی بۆ هەر هاوکاریەکی پێویست، ئەو گەورەیەکی بەخشندە و زۆرییش جیدیە. ئەم دوو هەستە جیاوازە و ڕیاکارانەیە هەرگیز پێکەوە ناگونجێن ئەگەر لە هەموو ئەو ماوەیەدا لە دڵی خۆمدا نەم وتایە: (ڤارێکی تر، تەنیا جارێکی تر دەمەوێت گوێم لە ناوەکەت٧ بێت) دەمێک بوو لەوێ نەمابووم. دەربارەی ڕۆژی سێ شەممەی زەماوەندەکەی هەر بەو زمان لووسیەی خۆیەوە دەدوا.

ڕۆژی یەکشەممە خراپتربوو. لەڕاستیا من نیازی چوونە سەر گۆڕستانم هەبوو٨. ئەمەیش کارێکی باشبوو کە دەبوو بیکەم. بەڵام هەموو ئەو پێش نیوەڕۆیەم لەناو جێگادا بەسەربرد و دەبوو پاش نیوەڕۆیش بچم بۆ ماڵی باوکی شووی خوشکەکەم کە پێشتر هەرگیز نەچووم: بوو بە سەعات ٦، گەڕامەوە بۆ ئۆفیس تا بپرسم ئایا تەلگورافێک هاتوە یان نا. هیچ نەبوو. ئەی ئێستا؟ برۆ٩ و تەماشایەکی شانۆییەکان بکە. چونکە ژیلوسکی بەپەلە و زۆر بە ڕێکەوت یاداشتی ئەوەی کردبوو کە ئوستازا دەیویست ڕۆژی دووشەممە بڕوات بۆ بینینی ئۆپیرایەکی ڤاگنەر. من دەزانم ئۆپیراکە سەعات شەش دەست پێ دەکات و بڕیارە سەعات شەشییش من و تۆ یەکتر ببینین. چ بەدبەختیەکە؟ ئەی ئێستا؟ برۆ و تەماشای خانوەکەی ئوبستاگاسە بکە. ماڵێکی هێور و بێدەنگ. هات و چۆی لەسەر نیە. بە ڕووتی لە سووچێکدا دەوەستیت، پاشان دەچیتە سووچیکی تر، هیچ. ئەم جۆرە ماڵانە لەو کەسانە ئاقڵترن کە تەماشایان دەکەن. ئەی ئێستا؟ سەرێک لە تەلاری لوسرنا بدە کە زۆربەی کارە هونەریەکان لەوێ نمایش دەکرێن. نمایش لە ئارادانیە، کەواتە سەرێک لە ماڵی ئوستازا بدە. ئەمە بڕیارێکی ئاسانە، چونکە بێ گومان ئەو لەوێ نیە. ماڵەکەی بێدەنگ و جوان و باخچەیەکی لە پشتەوەیە. قفڵێک بە دەرگاکەوەیەتی، بۆیە دەتوانیت بە دڵنیایی و بێ هیچ ترسێک زەنگ لێ بدەیت. لە قاتی خوارەوەدا کەمێک قسەکردن لەگەڵ سەرپەرشتیاری تەلارەکە تەنیا بۆ دەربڕینی وشەکانی لیبسیک و ژیلوفسکیە. بەداخەوە دەرفەتی ئەوە نیە ناوی «میلنا» بێتە بەر گوێ. ئەی ئێستا؟ ئێستا کارێک دێتەپێش کە لە هەموو ئەوانی دی گەمژانەترە. دەڕۆم بۆ کافەی (ئارکۆ) کە ساڵەهایە پێم تێ نەکەوتوە. دەڕۆم بەڵکوو یەکێک بدۆزمەوە تۆ بناسێت. خۆشبەختانە کەسی لێ نەبوو. بۆیە خێرا ئەوێم بەجێ هێشت. لەم جۆرە یەکشەموانە زۆر دەست ناکەون، میلنا؟

(لە پەراوێزی لای چەپەوە) دوێنێ نەمتوانی بنووسم. لە ڤیەنا هەمووشتێک بۆ من تاریک و نووتەک بوو.

---

٧- مەبەست ناوی (میلنایە) لە زمانی لاڤرینەوە.

٨- میلنا داوای لە کافکا کردبوو بچێتە سەر گۆڕی براکەی.

٩- لێرەدا کافکا لەگەڵ خۆیدا دەدوێت.

**سەرچاوە:** نامەهایی بە میلنا.

# کورتە چیرۆک...
# ئایا بووەتە بەشێک لە ڕابردوو؟

نووسینی: ماهر شفیق فرید
و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

یەکێک لە قسە بەربڵاوەکانی ئەم سەردەمەمان - لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا - ئەمەیە: ئەم سەردەمەی ئێستامان سەردەمی ڕۆمانە و ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە پاشەکشەیان بۆ دواوە کردووە، لەناو ئەوانەشدا کورتە چیرۆک. هۆکاری ئەوەش بۆ توانای ڕۆمان دەگەڕێتەوە، توانایەک ئەو سیفەتەی پێدەبەخشێت کە چ لە شوێن و چ لە زەمەن دا درێژببێتەوە و دەتوانێ تەواوی لایەنە جۆراوجۆرەکانی خیبرەی مرۆڤایەتی لە خۆبگرێت. هەروەها دەتوانێ شیعریەتی شیعر و درامای شانۆ و دەوشانەوەی کورتە چیرۆک و درێژداڕی وتار-یش لەخۆبگرێت.

ئەوانەی لە ڕەخنەی عەرەبیدا ڕەواجیان بۆ ئەو قسەیە پەیداکرد، بریتین لە "عەلی الراعی، جابر عصفور، سامی خەشەبە" و ئەوانی دیکە، تەنانەت وایلێهاتووە ئەو قسانەی سەبارەت بە ئاوابوونی ئەستێرەی کورتە چیرۆک دەیڵێن، خەریکە ببێتە شتێکی ڕاستەقینەی بەڵگە نەویست.

ئەو کتێبەی لێرەدا لەبارەیەوە دەدوێین و ڕانانی بۆ دەکەین، هەوڵێکە بۆ گەڕاندنەوەی ماف و پێگەی کورتە چیرۆک، ئەم هونەرە قورس و جوانە کە چیرۆکنووسان "ئەدگار ئالان پۆ" و "مۆپاسان" و "چیخۆف" و چەندانی دیکە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، گەیاندیانە ئاستێکی زۆر بەرز. سەردەمی ئێستاشمان بێ بەش نییە لە ناوی گەورەی وەک "جۆیس" و "کاسرین مانسفیڵد" و "هێمنگوای". کتێبەکە بە ناونیشانی (کورتە چیرۆک لە زمانی ئینگلیزیدا)یە و نووسەرەکەی

"ئـەدریـان هنتەر"ە کە لە زانکۆی (سترلنگی بەریتانی) وانەبێژە، دەزگای چاپخانەی کامبردج چاپ و بڵاویکردووەتەوە.
یەکێک لە تایبەتمەندییە باشەکانی ئەم کتێبە، ئەوەیە تیۆرە و پراکتیکی پێکەوە کۆکردووەتەوە و لە چوارچێوەیەکی شارستانی بەر فراواندا باس لە شکڵ و شێواز و هونەرکاری کورتە چیرۆک دەکات

و چەقی بایەخدانی خۆی دەخاتە سەر نزیکەی بیست نووسەری ژن و پیاو کە هەریەکەیان سەر بە وڵات و مەملەکەتێکن، لەوانە (جۆزێف کۆندرا کە لە پۆڵەندە لەدایک بووە، کاسرین مانسفێڵدی نیوزلەندی، ئەلیس مۆنرۆی کەنەدی کە لە لەساڵی ٢٠١٣ خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەب وەرگرت، مارجۆری برناردی ئوسترالی، تشنوا ئەتشیبی



ئەدگار ئالان پۆ



جابر عصفور

نێچیری...هتد). هەموو ئەوانە لەوەدا هاوبەشن کە بە زمانی ئینگلیزی دەنووسن، هەر بۆیە ئەوانە گەرچی هەریەکەیان سەر بە وڵات و نەتەوەیەکی جیاوازن، بەڵام ئەدەبەکەیان بە بەشێکی ڕەسەن لە ئەدەبی ئینگلیزی دادەنرێت.

ئەو بانگەشەیەی کتێبەکە دەیەوێت بیسەلمێنێت، بریتییە لەوەی کورتە چیرۆک ژانرێکی ئەدەبییە و لە بەرامبەر هەر کێبڕکێیەکدا تواناى مانەوە و خۆڕاگری هەیە و کورتە چیرۆک بە فیعلی ئەو توانایەشی سەلماندووە. کورتە چیرۆک شتێک نییە لە پاشماوەی ڕابردوو، هەروەها هیچ ژانرێکی دیکەی ئەدەبی نییە بتوانێ شوێنی بگرێتەوە. بەڵگەشمان بۆ ئەوە، دەرچوونی ژمارەیەک کتێبی ڕەخنەیی گرنگە دەربارەی ئەسڵی ئەم هونەرە و گەشەکردنەکانی، لە پێش هەموویانەوە کتێبی (کورتە چیرۆک لە زمانی ئینگلیزیدا) لە نووسینی لواتر ئالن و کتێبی (کورتە چیرۆکی تازەگەری) لە نووسینی ه. ا. بیتیس و کتێبی (الصوت المنفرد) لە نووسینی فرانک ئۆکۆنر و کتێبی (کورتە چیرۆک) لە نووسینی لالن رید و چەندانی دیکە.

دانەری کتێبەکە لە پێشەکی کتێبەکەیدا، بیروڕای خانمە چیرۆکنووسی ئیرلەندی "ئەلیزابێس باون" دەهێنێتەوە کە دەڵێت: (کورتە چیرۆک کچی سەردەمی خێراییە کە تێیدا دەژین و ڕەنگدانەوەی ڕیتمە تازەکانی ژیانە. کورتە چیرۆک وەک فیلمێک وایە بەسەرهاتەکەی خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام لە میانەی نمایشێکی دوورو درێژ نا- وەک ئەوەی هونەری ڕۆمان دەیکات- بەڵکو لە ڕێگەی زنجیرێک لە ئاماژەی نادیار و کورت و خێرا، لە ڕێگەی کۆمەڵێ دیمەنی خێرا و چرکەساتیی هەنووکەیی. کورتە چیرۆک لەبەرئەوەی خاوەنی مۆرکێکی خێرایە، بۆیە بە شێوەیەکی تایبەتی هونەرێکی ئەمریکییە - خەڵکی ئەمریکی بەشێوەیەکی خێرا قسە دەکەن و بە خێرایی دەڕۆن و بە خێرایی بیر لەوە دەکەنەوە کە دەردەکەوێت).

کتێبەکەی ئەم نووسەرە لە ڕووی زەمەنییەوە دابەش دەکرێت بۆ پێشەکییەک و چوار بەش کە بریتین لەمانە: سەدەی نۆزدەهەم، کورتە چیرۆکی تازەگەری، کورتە چیرۆکی پاش تازەگەری، کورتە چیرۆکی پاش کۆلۆنیالیزم. کتێبەکە بە کۆمەڵێ پەراوێز و لیستێک سەرچاوە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ زیاتر بزانن، کۆتایی پێدێت. دانەری کتێبەکە لە میانەی قسەکردنی لەسەر کورتە چیرۆکی تازەگەری، لای ئەدیبی ئیرلەندی (جێمس جۆیس -١٨٨٢-١٩٤١) خاوەنی کۆمەڵە چیرۆکی (خەڵکانێک لە دەبلن) ١٩١٤، ڕادەوەستێت. لە

چیرۆکی (ئیڤلین) دا، کچێک دوو دڵە لەوەی دەستبەرداری ژیانە ناخۆش و دووبارە بووەکەی ببێت و لەگەڵ خۆشەویستەکەی، کە دەیەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، ڕابکات بۆ وڵاتێکی دیکە. وەلێ لە دوا ساتدا، پێش ئەوەی کەشتییەکە دەست بە جووڵە بکات، بوێری و ئازایەتی ئەوەی نییە خۆی لەو ڕەگ و ڕیشەیە داببڕێت کە بە ڕابردوویەوە دەیبەستێتەوە، هەر بۆیە ڕاناکات و دەمێنێتەوە. ئەمە نموونەیەکە دەربارەی ڕیالیزمی دەروونی، کە تێبینییەکی ماددیی ورد، ڕەگەزێکی تازەی بۆ زیاد کردووە، ئەو ڕەگەزەش بریتییە لە بەداوایەکداهاتنی خەیاڵاتە کەسییەکان. ئەمەش ڕێگەی لەبەردەم مەنەلۆگی ناوەوە و شێوازی ئینتباعی (Impressionism) خۆشکردووە کە جێمس جۆیس لە هەردووکیاندا زۆر شارەزا بووە و لە ڕۆمانەکەیدا (یۆلیسیس) ١٩٢٢، گەیاندنییە لووتکە.

دانەری کتێبەکە لای ڕابەرێکی دیکە لە ڕابەرانی مەنەلۆگی ناوەوە ڕادەوەستێت، ئەویش خانمە چیرۆکنوس "ڤێرجینیا وۆڵف ١٨٨٢-١٩٤١"ە. لە چیرۆکێکیدا بە ناونیشانی (ڕۆمانێکی نە نوسراو)، باس لە چاوپێکەوتنی نێوان گێڕەرەوەیەک دەکات لەگەڵ پیرێژنێکدا کە لە فارگۆنی شەمەندەفەرێکدا لە بەردەمی دانیشتووە. چیرۆکنووس ناوی بۆ گێڕەرەوەی چیرۆکەکەی دانەناوە. گیڕەرەوەی چیرۆکەکە هەوڵدەدات لە خەیاڵدانی خۆیدا،



مۆپاسان

وێنەیەک بۆ مێژووی ئەم پیرێژنە بکێشێت و چی بەسەر هاتووە، وەک ئـەوەی ئەو پیرێژنە کاراکتەرێکی نێو ڕۆمـان بێت کە گێڕەرەوەکە دەیـەوێ بینووسێت. گێڕەرەوەکە لای خۆیەوە ناوێک لە پیرێژنەکە دەنێت: مینی مارش. دواتر باس لە جلوبەرگ و شێوازی ڕەفتار و هەڵسوکەوت و سیمای و پێڵاوەکانی و دەمبوسەکانی کڵاوەکەی دەکات. گێڕەرەوەکە - بە دڵنیاییەوە - پێیوایە ناڕوونی یان مەتەڵی ئەم پیرێژنەی دۆزیوەتەوە، لەمەشدا چەند سیناریۆیەکی لە خەیاڵی خۆیدا بۆ داڕشتووە، لەوانە بۆ نموونە پێدەچێت ئەم خانمە تاوانێکی ئەنجامدابێت و بەمەش دەبێتە بابەتێکی بـاس بـۆ شـیـکـردنـەوەی دەروونـــی. بــەڵام کاتێ پیرێژنەکە لـە شەمەندەفەرەکە دێتە خوارەوە و کوڕەکەی چاوەڕوانییەتی، ئەو سیناریۆیەی گێڕەرەوەکە لە خەیاڵدانی خۆیدا کێشابووی هەرەسدێنێت. چیرۆکەکە بەمە کۆتایی پێدێت: گـێـڕەرەوەکـە دان بـەوەدا دەنێت کە بابەتە تەقلیدییەکانی چیرۆک، ناتوانن بڕۆنە نێو نهێنییەکانی دڵی مرۆڤەوە و پەی بەو نهێنیانە نابەن. (ئاخۆ تۆ کێیت؟ بۆچی بە شەقامەکاندا دەڕۆیت؟ ئەم شەو لە کوێ دەخەویت و پاشان بەیانی لە کـوێ دەخـەویـت؟) ئەمانە کۆمەڵێ پرسیاربوون کە گێڕەرەوەکە لە مینی مارش-ی دەکرد و هیچ وەڵامێکیشی دەست نەدەکەوت. ئەو خانمە پیرە وەک خانمێکی ناوازە و ئاڵۆز مایەوە، ئەو لەوە ئاڵۆزتر بوو بێتە ژێر باری وردەکاری شیکردنەوەی دەروونی یان ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی یاخود چیرۆکی وروژێنەر و چاوەڕێکردن.

"کـاسـریـن مانسفێڵد ١٨٨٨-١٩٢٣" خانمە



چیخۆف

نووسەرێکی دیکەی تازەگەرە، بەوە وەسفدەکرێت کە قوتابییەکی نەجیبی "چیخۆف"ە. بەڵام توانی لەو جیاببێتەوە و ببێتە خاوەنی دەنگی تایبەت بە خۆی. لە کورتە چیرۆکەکەی: (خۆشبەختی)، پاڵەوانی چیرۆکەکە ناوی خانم (برسا ینگ) ە و خۆشبەختە بەو هاوسەرگیرییەی لەگەڵ "هاری" قسەخۆش کە پڕە لە حەماسەت و چالاکی، ئەنجامیداوە. وەلێ خۆشبەختییەکەی هەرەسدێنێت کاتێ بۆی دەردەکەوێت هاوسەرەکەی لەگەڵ خانمێکی شۆخ و شەنگ کە ناوی "بیرل فۆڵتۆن"ە، خیانەتی لێ دەکات. سروشت-یش کە لە ڕێگەی دار هەرمێیەکی پێگەیشتووەوە گوزارشتی لێدەکرێت، بایەخ بە کارەسات و نەهامەتییەکانی مرۆڤ نادات، گوێی لێ نییە مرۆڤ خۆشبەختە یان بەدبەخت.

"سامویل بێکت ١٩٠٦-١٩٨٩" کە زیاتر بە شانۆگەرییە پوچگەراییەکانی وەک (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا) و (یاری کۆتایی) و ئەوانی دیکە، بەناوبانگە. ئەویش ئەسپی خۆی لە مەیدانی کورتە چیرۆکدا تاو داوە و لەژێر کاریگەری جۆیس بووە، بێکت وەک جۆیس ئیرلەندی بووە. بەڵام بە دیدگا ڕەشبینەکەی بۆ بوونی مرۆڤایەتی و فوکاهە تاڵەکەی، بگرە تاریکەکەی جیادەکرێتەوە. بۆ نموونە تەماشای چیرۆکی (دانتی و قرژاڵی دەریا) بکە کە یەکەم چیرۆکییەتی لە کۆمەڵە چیرۆکی (وخزات اكثر مما هی ركلات) و لە ساڵی ١٩٢٤ بڵاوکراوەتەوە. چیرۆکەکە لەوێوە دەستپێدەکات کە "بلاکوا"ی پاڵەوانی چیرۆکەکە هەوڵدەدا لە هەندێ دێڕی داستانی (کۆمیدیای ئیلاهی) دانتی تێبگات، لە دێڕەکاندا "بیاتریش" لە سرودی دووەمی (فیردۆس) هۆکاری ئەوە ڕووندەکاتەوە بۆچی مانگ چەند پەڵەیەکی تاریکی تێدایە. لەو پەرەگرافەدا وشەی (بەزەیی-شفقه) هەیە. دواتر لە هەمان ڕۆژدا



جۆیس



هێمنگوای

"بلاکوا" پرسیار لە مامۆستاکەی دەکات کە زمانی ئیتاڵی پێدەڵێتەوە و داوای مانای لێکدانەوەی ئەو پەرەگرافەی لێدەکات. مامۆستاکەی پێی دەڵـێ ئـەوە جێگای مشتومڕ و جیاوازییە و دەبێ پەیوەندی بە سەرچاوەکانی دیکەوە بکات و پاشان وەڵامی پرسیارەکەی دەداتـەوە. پێش ئەوەی چیرۆکەکە کۆتایی پێبێت، "بلاکوا" دەڕوات بۆماڵی مامۆژنی، لەوێ دووچاری شۆک دەبێت کاتێ دەبینێ مامۆژنی قرژاڵێکی دەریا لێدەنێ و بە زیندویی دەیکوڵێنێ و تەنها سی چرکەی لە ژیان ماوە. ئیدی چیرۆکەکە بەم شێوەیە کۆتایی پێدێت: (باشە - بلاکوا ئاوا بیریکردەوە - ئەوە مەرگێکی خێرایە، دەبێ سوپاسی یەزدان بکەین، بەس نییە ئەم بەو جۆرە نییە). بەم شێوەیە وشەی (بەزەیی) کە بلاکوا بیری لێ دەکردەوە، مانایەکی تازە وەردەگرێت و لە گاڵتەجاڕییەک دەچێت. چونکە لێرەدا هیچ بەزەییەک نییە، بگرە بوونی مرۆڤایەتی بەزەیی نازانێ. لە جیهانی مرۆڤەکاندا، وەک جیهانی ماسییەکان، بەهێز بێهێز دەخوات.

دواجار پوختەی ئەوەی لەم کتێبەی "ئەدریان هنتەر" بەدەستی دەهێنین، ئەوەیە کورتە چیرۆک نەمردووە و نامرێت. ئەو ژانرێکی ئەدەبییە و پارێزگاری لە جەوهەری خۆی دەکات: چرکەساتێک کە دەلالەتێکی هەیە بۆ ساتەوەختێکی کورت لە تاریکستانی هۆشدا، دەدرەوشێتەوە و بینینی زیاتر بە ئێمە و بە ئەوانی دیکە دەبەخشێت.

سەرچاوە:

الشرق الاوسط، لاپەڕەی ڕۆشنبیری، ٣٠ تشرینی دووەم، ٢٠١٣



# سەرخەویێک بشکێنە یوسف !

## شانۆنامەیەکی کورت

نووسینی: رەسوڵ یۆنان
و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر

**مرۆڤەکان:**
**یوسف**
**پیرەمێرد**
**شانۆکە:**
**جێگەیەك لە رۆخی شەقامێکی لاوەکی لە دەرەوەی شار.**
**کات:**

ئێوارەیەکی پاییزی
کتوپڕ دەنگی ستۆپ گرتن و خشانی تایەکانی ئۆتۆمبیلێک لە سەر قیرەکە دەبیستریێ و پاشان دەنگی بەرکەوتنی هەمان ئۆتۆمبیل بە ماتۆڕسکیلێک دەگاتە گوێ. تۆزێک دواتر کاتێک پەردە هەڵدەدرێتەوە لە بەشی ڕاستی شانۆکە ماتۆڕسکیلێکی سەرەونگووم بوو دەبینرێت کە لەسەر گەڵا وەریوەکانی پاییز لە کاتی سووتاندایە. ئێستا دەنگی چەخماخە دەبیستریێ و بە دوای ئەویشدا شانۆکە ڕووناک و تاریک دەبێت و پاشان دایدەکاتە باران.
بێدەنگی.
لەم ساتەدا دەنگی هەڵکردنی ئۆتۆمبیلەکە و دوورکەوتنەوەی دەبیستین. بڵێسەی ئاگرەکە وردە وردە دادەمرکێتەوە. ئێستا لە بەشی چەپی شانۆکە لە ڕووناکییەکدا پیاوێکی گەنج بە سەروچاوێکی خوێناوی و قوڕاوی تا نیوەی چاڵەکە خۆی هەڵدەزنێ.
یوسف. من ناوم یوسفە، یانی یوسف بوو، لەوەیشە دیسان یوسف بێت! هێشتا نازانم کاتێک مرۆڤ دێتە دنیاوە ناوەکەی دەگۆڕێت یا نا. هێشتا ئەم دنیایەم نەناسیوە و ئەسڵەن نازانم لێرە مرۆڤ بە ناوەکەیەوە بانگ دەکەن یا بە ژمارە! لە سەردەمی سەربازیدا کۆدەکەم یازدە (١١) بوو، ئەگەر لێرە کۆدم بدەنێ نازانم چەند ژمارە دەبێت! کاتێک ناوت نییە واتا بوونت نییە. هەندێک کات هەموو شتێک لە وشەیەکەوە دەست پێدەکات!
(بارانەکە خۆش دەکاتەوە)
من کرێکاری چاپخانەم. واتا کرێکار بووم. چاپخانەکە لە شارە. ماڵەکەم لە گوندە. هەڵبەتە مەودای نێوان ئەم دووە زۆر نییە. هەموو ڕۆژێک بەیانیان بە ماتۆڕسکیل دەهاتم بۆ شار و خۆرئاوایان دەگەڕامەوە بۆ ئاوایی! کاتژمێرێک پێشتریش دەچووم بۆ ماڵەکەم کە ئۆتۆمبیلێکی ڕەش تامپۆنی کرد لەگەڵم و بووە هۆی ئەوەی ماتۆڕسکیلەکەم لە جادەکە لابدات. سەرەتا تێنەگەیشتم چی بووە نها کە هۆشم هاتۆتەوە تازە تێدەگەم چی ڕوویداوە! قاچەکانم شکاوە و سەرم بەر بەرد کەوتووە! ئێدی لەشم لەژێر کۆنترۆڵی خۆمدا نییە! لەو خوارەوە، چاڵێکی قووڵە. کەوتنە چاڵەوە خەماوی نییە! خەماوی ئەمەیە کە ئیدی نەتوانی لە چاڵەکە بێیتە دەرێ! کاتێک هیچ کەسێک نەتوانێ یارمەتیت بدات، واتا مردوویت!
(دەنگی ڕۆیشتنی ترێلەیەک کە تۆزێک لەولاتر تێدەپەڕێت)
کاتێک ژنم هێنا تەمەنم بیست و پێنج ساڵ بوو. لە حەڤدە ساڵییەوە عاشقی مریەم بووم، واتا هێشتاش هەر عاشقم، بەڵام ئیدی نازانم ئەم خۆشویستنە بە کەڵکی دێت یا نا؟ بە هەزار زەحمەت ئەوم بە دەستهێنا.
ڕۆژانە کارم کرد و شەوانیش خوێندم. دواجار بڕوانامەی دیبلۆمم وەرگرت و باوکیم ڕازی کرد و ئەسڵەن تێشنەگەیشتم ئەم بڕوانامەی دیبلۆمە بۆ باوکی بە کەڵکی چی هات!؟ نزیکەی پێنج ساڵ بوو کە لە مانای ژیان تێدەگەیشتم کە ئاوهای لێهات! بێگومان دەبوو وای لێبهاتایە. ناڕەزاییم نییە تەنها تۆزێک نیگەرانی مریەمم! خۆزێ زیاترم خۆشدەویست تا هەر لە سەرەتاوە سوپاسی ئەو فرمێسکانەم بکردایە کە بڕیارە بۆم بڕێژێ.
(دیسان بارانەکە دادەکاتەوە)

بە دڵنیاییەوە ئێستا زۆر نیگەران و شڵەژاوە و وەک هەمیشە هاتۆتە پشت پەنجەرەکە و خەریکە سەیری شەقامەکە دەکـات. کاتێک چـاوەڕوانـی کۆتاییەکی نەبێت دەگـۆڕێـت بۆ کارەسات. ئەو ئێستا وەک هەمیشە چاوەڕێیە بەڵام ئەگەر ڕاستییەکە بزانێ، وێران دەبێت. هێز لە دڵیدا نامێنێ. هـەر لە ئێستاوە من درەوشانەوەی فرمێسکەکانی لە سەر ڕوومەتی دەبینم. دەنگی گریاناوی دەبیستم. بریسکەی چاوە جوانەکانی لە دەست دەچێت.

(سەیری لای چەپی خۆی دەکات، واتا رووەو ئەو گوندەی کە بڕیار بوو بچێت)

ماڵئاوا مریەمە شۆخەکەم!

(سەر ڕووە و بینەران دەسووڕێنێ)

من هیچ کارێکم لە دەسـت نایە. بەڵام خۆزێ دەمتوانی تەنانەت بۆ ساتێکیش گەر بووە مریەم ببینم و ڕازیی بکەم کە مردن ڕاستییەکە و دەبێت قبووڵی بکەیت.

(بە چرپە)

خۆشویستن شتێکی سەیروسەمەرەیە. خودا بکات بتوانم لە بیری بکەم، هەروا ئەویش.

(بێدەنگی)

ژیان وەک چیرۆکێک وایە. هەوراز و نشێوی هەیە. تاڵی و شیرینی هەیە. ڕێک لەبەرئەمەیش سەرنجڕاکێشە. ئێستا من هیچ چارەیەکم نییە جگە لەوەی خۆم ڕازی بکەم کە من و مریەم پاڵەوانی یەک چیرۆکین. بەم شێوەیە باشترە.

(بارانەکە خۆش دەکاتەوە)

کاتێک زیندوو بووم کتێبم زۆر دەخوێندەوە. گەر کرێکاری چاپخانە بیت بتەوێ و نەتەوێ ژیـانـت بـە کتێبەوە گـرێ دەدرێــت. زۆربـەی نووسەران دەناسم لە سێرڤانتسەوە بیگرە تا ئەرنست هەمینگوای و مارکیز و هی تریش. هەروا بێتەوە ئاشنای بیروباوەڕ و بۆچوونی زۆرێک لە فەیلەسووفانم. نازانم ئەو شتانەی کە لەو دنیا خوێندم لێرە بە کەڵک دێت یا نا!

لەبەرئەوەی هەر جۆرێک بیربکەیتەوە ئێرە جیاوازە لەوێ. چما دیوارێک لەم ناوەڕاستەدا هەیە. ئەو شتانەی یا ئەو مرۆڤانەی کە لە هەردوو بەر هەن ئایا دەتوانن پێکەوە پەیوەندی دروست بکەن؟ ئەمە بۆ خۆی پرسیارێکی بێ وەڵامە. بەڵام من پێموایە هەموو پرسیارەکان وەڵامیان هەیە.

بەگشتی کاتێک ئێمە وەڵامی پرسیارەکە نازانین دەڵێین وەڵامـی نییە و خۆمان قوتار دەکەین. زۆربەی کاتەکان ئێمە بۆ ئاسوودەیی خۆمان پرسیارەکان بێ وەڵام دەهێڵینەوە. باشە هەندێک کات دۆزینەوەی وەڵام زۆر سەختە و ئەمەیش بۆ خۆی کارێکە وەک پڕکردنەوەی چاڵی هەڵکەندراو یا نازانم وەک ئاودانی بنجە گیایەک کە زۆر تینووە و ئەشێ هەر ساتێک لە ناو بچێت و تۆ هیچ ئاوێکت لە بەر دەستدا نییە. هەندێک کات وەڵام بەردەوامی پرسیارەکەیە. خۆ وتم من کرێکاری چاپخانەم. دەزانم زۆر لەم قسانە بکەم.

(ئامبوڵانسێک بە هەراوزەناوە دێت و تۆزێک ئەولاتر لە جادەکەوە تێدەپەڕێت)

شتێک هات بە مێشکمدا. بـەردەوام بوون یا نەبوونی شتێک. من پێموایە هەموو شتێک بـەردەوامـی هەیە، مەگەر ئـەوەی بیبڕنەوە. هەڵبەتە هەندێک لە شتەکانیش ئەشێ بەردەوام نەبن، وەک ڕۆمانی بێنەوایان. ڤیکتۆر هۆگۆ ئەگەر دەیتوانی بەرگی دووەمی ئەم ڕۆمانەی دەنووسی. گەر نەینووسی تەنها وەڵامێکی هەیە. نەیدەتوانی. هۆکارەکەیشی زۆر سادەیە. ئەو لە بەرگی دووەمدا دەیتوانی بەردەوامی بە بێنەوایی بدات نەک ژان ڤاڵژان. لەبەرئەوەی ژان ڤاڵژان لە کتێبی یەکەمدا مردووە.

لە ڕۆمانەکاندا، ڕاستییەکان، مردن و ژیان ڕۆڵێکی شیاو دەگێڕن.

من بەو جۆرە کە دەبێت ناتوانم لەبارەی ئەم دنیایە و هەروا بێتەوە ئەو دنیایە، واتا مردن و ژیانەوە قسە بکەم. میشێل فۆکۆ باوەڕی وایە زمان، ڕاستینەی جیهان نالێ بەڵکو ڕەنگدانەوەیەکە لە ئەزموونی تایبەتی تاک.

ئەگەر وشەی جیهان لەم قسەیەی فۆکۆ لابەین و ڕستەکەی بەم شێوەیە بڵێین کە زمان، ڕاستی نالێ بەڵکو ڕەنگدانەوەیەکە لە ئەزموونی تایبەتی تاک، ئەوسا مەبەستەکەم باش و تاڕادەیەک بە شێوەیەکی تەواو دەوترێ. ڕەنگیشە نەوترێ. نازانم. ئاخر دەزانن لەم بارەیەوە تیۆرەکان زۆر زۆرن.

(ڕۆدەچێتە فکرانەوە)

بە وتەی ژاک دێریدا دەستەواژەکان هەڵگر و بەرهەمی مانا نین. دەستەواژەکان تەنها ئاماژەن بۆ دەستەواژەی دی. مانا پەیوەستە بە وەرگرەوە نەک تێکست.

(دیسان دەکەوێتە بیرکردنەوەوە)

دەبێت من زیاتر بیرکەمەوە. ڕاستییەکەی لەبەرئەوەی سەرم بەر بەرد کەوتووە بە جۆرێک مێشکم باش کار ناکات! سەرئێشەیەکی سووکیشم هەیە. ئەشێ ئەم پرسیارە قوت بێتەوە کاتێک تۆ لە جەستەت هاتییە دەرێ چۆن ئەشێ هەست بە ئازار بکەیت!

دەبێت لە بەرسڤی ئەم پرسیارەدا بڵێم جەستە و ڕۆح تەنانەت ئەگەر پێکیشەوە نەبن کاریگەری لە سەر یەکتری دادەنێن، ڕۆح سێبەری جەستەیە، کاتێک جەستەت سەری نەبێت ڕۆحیشت سەری نابێت.

(وەڕزە و ماندوێتی لە سەروچاوی دەبارێت)

چما خەریکم وڕێنە دەکەم. من دەبێت تۆزێک پشوو بدەم، زۆر هیلاکم.

(ڕووناکی سەر شانۆکە دەکوژێتەوە. ئیدی کابرا نابینرێت)

لەم ساتەدا لە پێشەوە و تاڕادەیەک لە ناوەڕاستی شانۆکەدا پیرەمێردێک لە تاریکوڕوونەکەدا تا ناوقەد خۆی لە چاڵەکە بەرز دەکاتەوە و پاشان جگەرەیەک دەخاتە سەر گۆشەی لێوی و دایدەگیرسێنێ.

پیرەمێرد: دکتۆر وتوێتی نابێت جگەرە بکێشم، هەڵبەتە وتبووی، بەڵام من ناتوانم ئەم خووە تەرک بکەم! بەردەوام لەم فکرەدام کە دوای کێشانی دوایین جگەرە چی دەکەم. لەبەرئەوەی خەریکە جگەرەکانم تەواو دەبێت، تەنها دوو پاکەتی ترم پێیە! تاڕادەیەک هەفتەیەک لەمەوبەر پێموانەبوو ڕۆژێک هێندە جدی بیر لە شتێک بکەمەوە کە زۆر بایەخی نییە!

زۆرێک نازانن ئەم دنیایە هەیە. منیش نەمدەزانی بەڵام نها دەبینم هەیە! کاتێک بڕیارە لە جێگەیەکەوە بچیتە جێگەیەکی دی واتا جێگەیەکی دی هەیە! ئێستا ئەم جێگەیەی دی کابینەی جگەرە فرۆشی هەیە یا نا ئەمە باسێکی جیاوازە.

(دەکۆکێ)

ئەگەر ئەم کۆکە کۆکە بیهێڵێ قسەم زۆرە بۆ وتن. نازانم بۆچی هەر کاتێک دەمەوێ قسە بکەم. کۆکە دەمگرێت.

(دەکۆکێ)

پێمباشە قسەیش نەکەم و نەیش کۆکم.

(ڕۆدەچێتە چاڵەکەی خۆیەوە. با هێواش هێواش هەڵدەکات. ئێستا گەڵا وەریوەکانی پاییز لە سەر شانۆکە لەنجەولاریانە)

پەردە دادەدرێتەوە.

## سەرچاوە:

شوکران، ٤٥،٤٦
دوو ماهنامه ادبی
سال یازدهم، بهمن نودویک، ویژه نامه رسول یو نان.

# ئەدەبی ئینگلیزی و یەکەم خەڵاتی نۆبڵ

وەرگێران و ئامادەکردنی: عەبدولکەریم عوزێری

کاتێک لە ساڵی ١٩٠٧دا، خەڵاتی نۆبڵ لە بواری ئەدەبدا بەخشرا بە ڕودیارد کیپلینگ Joseph Rudyard Kipling، سکرتێری گشتی ئەکادیمیای سویدی وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ئەم خەڵاتە ڕێزلێنانە لە کیپلینک و سێ سەدە لە ئەدەبی بەرزی ئینگلیزی.

لەڕاستیدا ئەم ئەدیبە، تاوەکو ئێستاش، لە مێژووی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب، گەنجترین ئەدیبە ئەو خەڵاتەی پێبەخشراوە و یەکەم ئەدیبیشە کە بە زمانی ئینگلیزی نووسیبێتی و ئەو خەڵاتەی وەرگرتبێت. بێگومان لە جیهاندا چەندین وڵات هەیە کە بەم زمانە دەیاننووسی و دەنووسن (هەر لە نیوزلەندە و ئوستورالیاوە بۆ وڵاتی هیندستان تا دەگاتە ئەمریکا و کەنەدا و بە هەر پێنج وڵاتەکەی بەریتانیا خۆیەوە، نابێت باشوری ئەفریکاشمان لە یاد بچێت)

بێگومان ئەدەبی ئینگلیزی زۆر لەو ماوە زەمەنیە کۆنترە کە "کارل داڤید" ئەمینداری گستی ئەکادیمی سویدی باسی دەکات، ئەدەبی ئەنگلۆ-ساکسۆن بە شێوەی هەڵبەستی زارەکی لە ساڵی ٤٥٠ی زاینی بۆ ١١٠٠ بوونی هەبووە و بە قۆناغی کۆن ناسراوە. بۆیە پێی وتــراوە ئەنگلۆ-ساکــۆسۆن چونکە ئەمە هەوێنی زمانی ئینگلیزی کۆنە و خەڵکی لە ئەڵمانیاوە هاتوون بۆ ئینگلتەرە و شیعری ئەڵمانیان خوێندوەتەوە. "ساکسۆن بە واتای ئەڵمانی دێت".

قۆناغی دووەمــی ئەدەبی ئەنگلۆ - ساکسۆن لە ١١٠٠ەوە بۆ ١٥٠٠ زاینی خایاندوە، ئەدەبی ئەم قۆناغە بە ئاستە ناسکەکەی ناسراوە. بە ئەدەبی ئەرستۆکراتیش ناوبراوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری زمان و داب و نەریت و ژیانی بۆرجوازیانەی فەرەنسیەکان.

هەر لەم قۆناغەشدا ئەدەبیاتی ئاینی مەسیحیەت پەرەی سەندووە و تەورات و ئینجیل وەرگێڕدراون و سرودی ئاینیش دانراوە و لە بۆنەکاندا وتراونەتەوە.

لەم قۆناغەدا (ویلیام لانگلاند و چێفری چاوسەر) دەرکەوتن.
ئەگەر سەرنجی خەڵاتەکانی نۆبڵ بۆ ئەدەب بدەین، دەبینین:
١. ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا و فەرەنسا پێش ئینگلتەرا کەوتوون.
٢. ئینگلیزەکان بەو هەموو وڵاتە (زمان ئینگلیزیەوە)، شەش پاداشت دواکەوتن.
٣. خەڵات بەخشێنەکە لە سەرەتادا لەوەدەچوو تایبەت بێت بۆ ئەوروپیەکان.
٤. ساڵانێکی زۆر بەسەر بەخشینی ئەم خەڵاتەدا تێپەڕی ئەوساکە تاغوری هیندی ئەم ڕێزلێنانەی بەرکەوت. ئەویش ڕەخنەگرانی ئەم پرۆسەیە دەڵێن، لەبەر خاتری نووسینە ئینگلیزیەکانی بوو نەک زمانی دایکی.
کیپلینگ وەک گەنجترین و یەکەم بەریتانی خاوەن خەڵاتی نۆبڵ، شایستەی ئەوەیە بە خوێنەرانی هاوچەرخ بناسرێ. وێڕای ئەم دوو هۆکارە سەرەکییە چەندین خەسڵەتی دیکە لەم کەسایەتیەدا هەبووە کە کاریگەریان کردۆتە سەر فراوانکردنی ساباتەکانی، لەوانە: لە گەلێ وڵاتانی سەر ئەم زەویەدا ژیاوە و تام و چێژی هەمەڕەنگی چەشتوە. ئەم نووسەرە لە بومبای لە تەلاری سەرۆکایەتی بەریتانیا، لە ساڵی ١٨٦٥ لەدایک بووە. دوای ئەوەی پێنج ساڵی یەکەمی ژیانی لە هندستان بەسەربردوە، کەسوکاری بردویانەتەوە بۆ ئینگلتەرا، لەوێ خستویانەتە بەر خوێندن. جارێکی دیکەش گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونی و بە هەڵبەست وەسفی بومبای کردوە. هەر بە منداڵی حەزی لە ئەدەب و نووسین کردوە، کاتێک بۆ گەشت و گوزار سەردانی ئەمریکای باشور دەکات وەک پەیامنێری گۆڤاری ماگازین کاردەکات و چەندساڵێک لەوێش دەمێنێتەوە.
وێڕای هەندێ وڵاتی تری ئەوروپا، لە ئەمریکای باکوریش ژیاوە. لەبەر شێوازی بەهێزی نووسینی، گەلێک لە حیزبە سیاسیەکانی ئەو وڵاتانەی کە تێیدا ژیاوە، لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا هانایان بۆ بردوە و سوودیان لە بانگەوازەکانی وەرگرتووە.
کیپلینگ، وەک ئەبیسیک، بۆتە جێگەی ئیهتیمامی ئەهلی قەڵەم لە سەردەمی خۆیدا و لە ئێستاشدا. هینری جێمس گەورە نووسەر و ئەدیبی ئەمریکی کە زۆربەی ژیانی لە بەریتانیا بردۆتە سەر، لە جوزیف کیپلینگەوە نزیک بووە، لە وەسفیدا دەڵێ: "تائێستا بلیمەتێکی وەک ئەم نووسەرەم نەبینیوە، هەمیشە ناخم دەبزوێنێ". ڕەخنەگری ئەدەبی دۆگلاس کیر Douglas Kerr دەڵێ پێگەی ئەدەب و کولتوری ئەم ئەدیبە، هەمیشە لە هەڵچووندایە و ئارامی بە خۆیەوە نابینێ.
گەورە سیاسەتمەدار و یەکەم سەرەک وەزیرانی هیندستان جواهیر لال نەهرۆ وتوویەتی کە هەمیشە کتێبەکانی دەخوێنێتەوە. نەهرۆ لەکاتێکدا ئەم گوزارشتەی داوە کە گەلێک ڕۆشنبیری هندی "ڕودیارد"یان بە ناسیونالیست وەسفکردوە، بێگومان ئەمانیش مافی خۆیانە کە بەو شێوەیە تەماشای بکەن، چونکە زۆربەی زۆری شیعرەکانی ئەم شاعیرە لەبارەی سەربازەکانەوە بووە، ئەو

سەربازانەی کە وڵاتی هیندیان داگیر کردبوو. کەس چارەی داگیرکەری ناوێت، بەتایبەتی ڕۆشنبیران. هەر لە هەمان سۆنگەوە هەوادارانی شاعیر بە (پێغەمبەری ئیمپریالیەت وەسفیان کردووە).
پێدەچێت خۆشەویستی ئەم پیاوە ئەدیبە بۆ سەربازەکانی وڵاتەکەی لەسەر حیسابی گەلی هیند نەبووبێت. بەڵگەش لەسەر ئەم بۆچوونە هەیە. کیپلینگ بومبای خۆشویستوە و هەڵبەستی لەسەر داناوە. لە چەند دێڕێکدا دەڵێ:

دایکی شارەکانی بۆ من
چونکە من لە دەروازەکەیدا هاتوومەتە دنیاوە
لەنێوان دارخورما و دەریادا
لە هاڵاوی کەناری کۆتایی جیهاندا

کیپلینگ هەروەکو باوک و دایکی، خۆی بە (ئەنگلۆ – هیندی) ناسیوە، هۆگری خەدەم و حەشەمی هیندیەکان بووە، گوێی لە ئاوازە خۆشەکانیان گرتووە و چێژی لە خەوی پاش نیوەڕۆ گەرمەکانی بۆمبای وەرگرتوە. ئەم خۆشەویستیە لە بەرهەمەکانی ئەم بلیمەتەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ "داستانی جەنگەڵ" باس لە کۆمەڵە چیرۆکێک دەکات کە لە سروشتی هیندەوە سەرچاوەیان گرتووە. یەکێک لە هەڵبەستە ناسراوەکانی بە ناوی گەنگادین "Gungadin"ی هیندیەوەیە. هەرچەند کیپلینگ لە گەلێ وڵاتی دیکەدا ژیاوە، بەڵام هیچیان وەک هیندستان لە کارەکانیدا ڕەنگیان نەداوەتەوە.
ڕودیارد کیپلینگ سوارچاکی کورتە چیرۆکی ئینگلیزیە و بە پێشەوای کورتە چیرۆک دادەنرێ. بە هەمان شێوە توانای خۆی لە ڕۆمان نووسیندا نیشان داوە. لە دانانی شیعر و پەخشانیشدا زۆر دەست ڕەنگین بووە. ساباتی هۆنراوەی دەوڵەمەند بووە، وەکو: ماندەلای، گەنگادین و ئەرکی سەختی پیاوی سپی پێست.
کیپلینگ بەهرەمەندی خۆی لە زۆربەی کارەکانیدا خستۆتە ڕوو. ئەزموونی ژیانی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ئەوروپا و باشوری ئەفریکا، ئاوێتەی بەرهەمەکانی کردوە. کاتێک کە لە هیندستانەوە لە ڕێگەی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ئەمریکا دەکەوێتە ڕێ، بە چەند دەریایەکدا تێپەڕدەبێ و لێرەدا شیعری لەم دەریاوە بۆ ئەو دەریا دادەنێ From sea to sea"".
کاتێ کە دەگاتە ئەمریکا، چاوی بە گەورە نووسەری ئەمریکی "مارک توەین" دەکەوێ. ئەم چاوپێکەوتنە زۆر خۆشحاڵی دەکات و دەبێتە هاوڕێ و سەرچاوەی ئیلهام.
یەکێک لە شیعرەکانی جۆزێف رودیارد کیپلینگ بە ناوی If""وە هاتوە کە بە مانای ئەگەر دێت، ئەم هەڵبەستە بەناوبانگەی لە ساڵی ١٩١٠ نووسیوە.

"ئەگەر"
ئەگەر هۆشت لای خۆت بێت
لەکاتێکدا هەموو کێشەکان ڕوودەکەنە تۆ
ئەوانی دیکە گللەیی لە تۆ دەکەن
ئەگەر تۆ باوەڕت بە خۆت بێت
کاتێک هەموو پیاوەکانی دیکە لێت دەکەونە گومانەوە

بەڵام تۆ خۆت لە گومان بەدەر دەکەیت
ئەگەر تۆ بتوانیت ئارامگیر بیت و کۆڵ نەدەیت
کاتێک ناڕاستگۆیی یەخەت دەگرێ
بەڵام تۆ مامەڵەی ناڕاستگۆییانە ناکەیت
دەتبوغزێنن...
وەلێ تۆ خۆت ڕادەست بوغزاندن ناکەیت
ڕەنگە زۆرباش نەدەیت بە چاوەوە
بەڵام دانایی لە دەست مەدە
ئەگەر ئاوات و خواست و خەونەکانیان لە دەست دایت
ئەگەر بیرت کردەوە و نەیان هێشت بە ئامانج بگەیت
ئەگەر سەرکەوتنت بەدەستهێنا
یان ئەگەر تووشی کارەسات بوویت
ئەگەر ناپاکیان لەگەڵت کرد
بەڵام تۆ مامەڵەی خۆتت نەگۆڕی
بەڕاستگۆیی مایتەوە و
لە ڕێگە لایان نەدایت
ئەگەر بەردەوام بویت لە بونیادنانی ژیاندا
ئەگەرچی ئامێرەکانت لەکارکەوتبوون
ئەگەر هەموو دەستکەوتەکانت کۆکردەوە و
لەناکاو هەموویانت لە دەست چوو
و جارێکی دی سەرلەنوێ دەستت پێکردەوە
بە وشەیەکیش باسی زەرەرەکانت نەکەیت
ئەوە جارێکی تریش ڕۆڵی تۆ دێتەوە

ئەوانە هەموو دەڕۆن لەناودەچن

ڕودیارد، لە دواساڵەکانی تەمەنیدا، لە ئینگلتەرە لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی جێگیر دەبێ و هەندێ لە بەرهەمەکانی دەفرۆشێ و خانوویەک بۆ خۆی دەکڕێ. لەوێدا ژیانێکی هێمن دەباتە سەر و بەردەوامی بە کاری نووسین دەدات.
ڕودیارد قسەکانی پڕ نەستەق بووە: جارێک گۆڤاری London magazine (کە پشکداری مانگانەی تێدا هەبووە) بە هەڵە و بە سەروتارێکی گەورە دەڵێ: کیپلینگ کۆچی دوایی کرد! کیپلینگ کە ئەم هەواڵە دەخوێنێتەوە، نامەیەکیان بۆ دەنووسێ و دەڵێ: لەبەرئەوەی من کۆچی دواییم کردوە... ئیدی زەحمەت مەکێشن مانگانە ژمارەی گۆڤارەکەتانم بۆ بنێرن.
بەهەرحاڵ ئەم ئەدیبە بەناوبانگە لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦دا کۆچی دوایی کردوە و تەمەنی ٧١ ساڵ بووە.

**سەرچاوەکان**

www.rudyardkipling.com
www.helium.com
www.tomasjames.com
کۆمەڵی سەرچاوەی خەڵاتەکانی نۆبڵ.



# چاوە شینەکان

نووسینی: پۆل سیرۆ

و. لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵڵا

کە لە خەو هەستام سەرتاپام لە ئارەق هەڵکشا بوو, هەڵمێکی گەرم لەو گۆرەپانەوە بەرز دەبوەوە کە بە خشتی سور دروست کرابوو. کە بەم دواییە ئاورشێن کرا بوو- پەپوولەیەکی خۆڵەمێشیی لە دەوری ڕووناکی گڵۆپە زەردەکە دەسوڕایەوە, لەسەر جۆلانەکەمەوە بازم دا و بە پێی پەتی و بەهێوری بە ژوورەکەمدا ڕۆیشتم نەکا پێ بەو دووپشکەدا بنێم کە بۆ هەوا گۆڕکێ لە کونەکەیەوە هاتبوە دەرەوە- چوومە لای پەنجەرە بچووکەکەوە و هەندێک هەوای دەرەوەم هەڵمژی, مرۆڤ دەتوانێت گوێبیستی هەناسەی شەو, و خۆشی و ناخۆشیەکانی بێت, گەڕامەوە بۆ ناوەڕاستی ژوورەکە و گۆزەیەک ئاوم ڕۆکردە ناو تەشتێکەوە و خاولیەکەم پێ تەڕکرد- لە سنگ و قاچیشم دا, تۆزێک خۆم وشک کردەوە- جلەکانم لەبەرکرد پاش ئەوەی دڵنیابووم کە مێشوولە لە قەدەکانیا نییە, بەخێرایی بە پلیکانە سەوزەکاندا هاتمە خوارەوە, لەبەر دەرگاکە بەر پیاوە کوێرەکەی خاوەن ماڵەکە کەوتم, کە بە بێدەنگیی لەسەر کورسیە تەختەکەی دانیشتبوو کە لە لقی دارخورما دروست کرا بوو, جگەرەی دەکێشا و

چاوی نیوە نوقاو بوو, بە دەنگێک لە حیلەی ئەسپ دەچوو پرسیاری کرد:
-»بۆ کوێ دەچیت؟»
-»تۆزێک پیاسە دەکەم.... کەش و هەوا زۆر گەرمە»
-»ئمم, هەموو شتێک ئێستا داخراوە - شەقامەکان تاریکن - باشتر وایە بمێنیتەوە».
بێ بایەخانە شانم هەڵتەکاند، بەگلەییەوە وتم:
-»خێرا دەگەڕێمەوە». پاشان چوومە تاریکییەکەوە. لە سەرەتادا هیچ شتێکم نەدەبینی, بەنێو شەقامە چەو و بەرد ڕێژکراوەکەدا ڕێگەم گرتە بەر, جگەرەیەکم داگیرساند, لەناکاودا مانگ لە پشت هەورێکی ڕەشەوە دەرکەوت, دیوارە سپیە داخوراوەکە و بەشە لەت و پەتەکانی ڕۆشن کردەوە, وەستام, تروسکاییەکم بینی, سروەی بایەک دەهات کە بۆنی تەمر هیندی دەدا, هەراوزەنای شەو پڕ بوو لە خشەخشی درەخت و دەنگی مێرووەکان, دەنگی سیسرک لەنێو گژوگیاکەدا خۆیان شاردبووەوە, وام بەبیردا هات کە دنیاکەی دەوروبەرم لە سیستمێکی مەزنی ئامەژەکان پێک هاتووە، قسە و گفتوگۆ لەنێو بونەوەرە زەبەلاحەکاندا, هەڵچوونەکانم, نیگای سیسرکەکان, بریقەی ئەستێرەکان, چ نەبوو بێجگە لە برگەی پەرت و بڵاوی ئەو گفتوگۆیە, ئەو وشەیە چییە کە من تێیدا تەنها برگەیەکی بچووک بووم, کێ وتوویەتی؟ جگەرەکەم فڕێدایە سەر شۆستەکە, وێنەیەکی ئاگرینی درەوشاوەی دروست کرد, وەک ئەستێرەیەکی کلکدار هەندێک پریشکی لێکەوتەوە.
بە هێواشی دەڕۆیشتم. هەستم بە سەربەستیەکی زۆر دەکرد, بە دڵنیاییەک لەنێو ئەو لێوانەوە کە لەو چرکەساتەدا بە خۆشیەوە دەیدواندم. شەو بوو بە باخچەیەک لە چاو, هەر کە لە شەقامەکە پەڕیمەوە گوێم لە تەپەی پێی یەکێک بوو بەدوامدا دەهات. ئاوڕم دایەوە هیچ شتێکم نەدی, خێرا ڕۆیشتم, پاش چرکەساتێکی کەم گوێم لە هەنگاوەکانی سۆلێک بوو بە قورسی دەخرایە سەر بەردە گەرمەکانی شۆستەکە. نەمدەویست ئاوڕبدەمەوە بۆ دواوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم کرد سێبەرەکە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا نزیک دەبێتەوە. هەوڵمدا ڕابکەم، نەمتوانی, لەناکاودا بۆ چرکەساتێک وەستام, پێش ئەوەی بەرگری لەخۆم بکەم, هەستم بە نوکە چەقۆیەک کرد لە پشتمدا, دەنگێکی ناسک وتی:
-»بەڕێز مەجوڵێرەوە، ئەگینا چەقۆکە دەکەم بە پشتتدا».
بێئەوەی ئاوڕ بدەمەوە پرسیارم کرد:
-»چیت دەوێت؟»
دەنگە ناسکە هێمنەکە وەڵامی دایەوە: چاوەکانت بەڕێز.
-»چاوەکانم، بۆچیتە؟ گوێبگرە هەندێک پارەم پێیە, زۆر نییە بەڵام شتێک دەکات، هەرچیم

هەیە دەتدەمێ گەر بیەڵیت برۆم. مەمکوژە».
-»مەترسە بەڕێز ناتکوژم, تەنها چاوەکانت دەردێنم».
پرسیارم کرد: «چاوەکانی منت بۆچییە؟»
-»بـۆ هـاوڕێ کـچـەکـەم, ئـەو حـەزی لە کۆکردنەوەی چاوی شینە, دۆزینەوەی لێرە کارێکی گرانە».
-»چاوەکانم بەکەڵکت نایەن, قاوەیین، شین نین».
-»بەڕێز هەوڵمەدە هەڵمخەڵەتێنیت. من دەزانم چاوەکانت شینن».
-»پیاوێکی وەک تۆ چاوەکانم دەرناهێنێت. شتێکی ترت دەدەمێ«.
بەڕەقییەوە وتـی: «ڕۆڵـی قەشەم لەگەڵدا مەبینە, ئاوڕ بدەرەوە». ئاوڕم دایەوە. کوڕێکی بچووکی ڕیوەڵە بـوو، پەرچەمەکەی نیوەی دەموچاوی داپۆشیبوو, شقارتەیەک بە دەستی ڕاستیەوە بوو لەبەر ڕۆشنایی مانگەکەدا بە چاکی دەردەکەوت.
-»بـا ڕووت ببینم». دەنـکـە شقارتەیەکم داگیرساند و لە دەمـوچـاوم نزیک کـردەوە. ئاگرەکە وای لێکردم زۆر بەخێرایی چاوم بتروکێنم و تەنانەت بەزۆر چاوەکانم بکەمەوە. بە دەستێکی بەهێز پێڵوەکانی کـردمـەوە, نەیتوانی بە باشی ببینێت, لەسەر پەنجەی قاچەکانی وەستا و بەشڵەژاویەوە لە چاوەکانم ورد بوەوە. ئاگرەکە پەنجەکانی سوتاندم, بۆیە دەنکە شقارتەکەم فڕێدا, چەند چرکەساتێک تێپەڕی
-»ئێستا بڕوات کرد کە شین نین؟»
-»زۆر زیرەکی، وا نییە؟» وەڵامـی دایـەوە: «بابببینین. دەنکە شقارتەیەک داگیرسێنە».
دەنـکـە شقارتەیەکی تـرم داگیرساند و لە چاوەکانم نزیک کردەوە
قۆڵی ڕاکێشام و بە شێوازێکی فەرمانەوە وتی:
-»لەسەر ئەژنۆکانت چۆک دادە». چۆکم دادا دەستێک قـژی بەقایمی گرتم و سـەری بۆ دواوە ڕاکێشام. زۆر بە فزولی بە سەرمدا نوشتایەوە, لەکاتێکدا دەنکەشقارتەیەک لە دەستەکەی تریدابوو بە هێواشی لە چاوەکانمی نزیک دەکردەوە، بە پێڵومەوە چزا. چاوەکانم داخست. وتی: «بیانکەرەوە». چاوم کردەوە, ئاگرەکە برژانگەکانی سوتاندم. لەناکاودا بە قایمی پاڵی پێوەنام و بەرەڵای کردم.
-»باشە کەواتە بردتەوە». دیارنەما, پاڵم بە دیوارەکەوە دا. سەرم لەنێو دەستەکانمدا بوو. جەستەم کەوتە سەر زەوی. هەستام و خۆم کۆکردەوە, شڵەژابووم, بە چەند هەنگاوێکی شێواو نزیکەی کاتژمێرێک بە شەقامە چۆڵەکانی شاردا ڕام کرد. کاتێک گەیشتمە ئەو گۆڕەپانەی کە تێیدا دەژیـام. سەیرم کرد هێشتا خاوەن ئوتێلەکە لەبەر دەرگاکە دانیشتووە, چوومە ژوورەوە بێئەوەی یەک وشە بڵێم. لە ڕۆژی دوایدا شارەکەم جێهێشت.

## پۆل سیرۆ

پـۆل سیرۆ ساڵی ١٩٤١ لە ماتساشوسیتس لـەدایک بـووە , یـەکـەم ڕۆمـانـی (والـدۆ) لە ساڵی ١٩٦٧دا بـڵاوکـردەوە. پاش ئـەوە زۆر ڕۆمانی تر, لەوانەش (ماڵی ڕەش, کۆگای خێزان, کەناری مێشوولە, ژیانەکەی دیکەم) ئەم کتێبانە لەگەڵ کتێبەکەی تریدا (مێژووە نهێنیەکەم) زۆرترین تیراژیان لێفرۆشراوە.

سیرۆ دەڵێت: هەرگیز کەس نامبینێت کاتێک دەنووسم. یەکێک لە سەرکەوتنەکانی چیرۆک ئەوەیە لە تاریکیدا دەخولقێت. بە بەرگێکی سپیەوە کە خەڵتانی خوێن نییە لە ماڵەکەم دەچێتە دەرەوە, چیرۆکەکانم وەک من نین, تەندروستن و قابیلی لەناوچوون نین.

خـوێـنـەری نـووسـیـنـەکـانـی سـیـرۆ لـە گشت چیرۆکەکانیدا جەوهەری نووسەرەکە دەبینێت. ماوەی بیست و پێنج ساڵ چیرۆکی نووسیوە, ئەکتەرەکانی لە سەرانسەری جیهاندا دەژین, گشتیان باس لە بەختیاری و هەڵاتن دەکەن. زەمینەی چیرۆکەکانی لە لەندەنەوە دەست پێدەکات بۆ باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا, لە بۆستۆنەوە بۆ پاریس, ئەفەریقیا, خۆرهەڵاتی ئەوروپا, مۆسکۆ, بۆ هێڵی یەکسانی, وێنای سـەربـاز, کـۆچـەر, دبـلـۆمـاسـی, قوتابی, نـووسـەر, ئەکادیمیی و مـنـداڵان دەکـەن, زۆربـەیـان دەکـەونـە هەڵوێستی سـەیر یان پەیوەندییە وشکەکانەوە, یان لەو بەرکەوتنە ڕۆشنبیریانەدا تێکدەشکێن کە لـە خۆیان گەورەترە, بۆیە چیرۆکەکانی پڕن لە گومان و ئاگاداری, هەندێکیان توند و ڕەقن, بەڵام گشتیان خەمێکی باڵایان تێدایە.

**سەرچاوە:**
قصص عالمیە معاصرە
وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: فدوا فازیل

# دەربارەی توندڕەوی

نووسینی: علی سالم
و. لە عەرەبییەوە: فرمێسک

توندڕەوی لە گۆشەیەک لە گۆشەکانییەوە، بریتییە لەوەی واقیعی دەوروبەرت بە تەواوی ڕەتکەیتەوە، واقیعێک خەڵکانێک بە درێژایی چەندین سەدە دروستیان کـردووە. ئەو واقیعەشیان لە پێناو ئەوەدا دروست کردووە تا لەو واقیعە نەچێت کە تۆ دروستی دەکەیت، چونەکە ئەوان هیچ شتێکی دیاریکراو لەسەر ڕوخسار یان بنەماکانی ژیان لەو واقیعەی تۆ دەتەوێ دروستی بکەیت، نازانن.

گەر هەموو بیرمەندە ڕیفۆرمخوازەکان، لە تەواوی قۆناغەکانی مێژوودا، کاریان لەسەر گۆڕینی واقیعی دەوروبەریان کردبێت، بە هیوای ئەوەی واقیعی خۆیان بەرەو باشتر و چاکتر و دادپەروەرانەتری ببەن، ئەوا لە پێناو بەدیهێنانی ئەوەدا، ئیدانەی هەموو کۆمەڵگایان نەکردووە، بگرە تەنها ئیدانەی چەند بەشێکی ئەو کۆمەڵگایەیان کردووە. بەو مانایەی ئەوان ئیشیان لەسەر فراوانکردنی پانتایی چاکە و کەمکردنەوەی پانتایی خراپە تا نزمترین ئاست کە دەکرێ پێی بگەیت، کردووە. واتە ئەوان تیشکی زیاتریان خستووەتە سەر ئەو بەشەی عەقڵ و دەرونی مرۆڤ کە چاکەخوازە، ئەمەش لەپێناو ڕازیکردنی خەڵک بەوەی ئەو بەشە چاکەخوازەی عەقڵ و دەرونیان بپارێزن و دوور کەونەوە لەو فیکرە هەڵە و ڕەفتارە زیانبەخشانەی ئەو بەشە خراپ دەکـات. لێرەوە دەبینین ئەوانە تەواوی واقیع ئیدانە ناکەن و نایانەوێت لە ڕەگوڕیشەوە هەڵیکەنن، بەڵکو لە ڕێگەی لابردن و بۆ زیادکرن، کار بۆ بەهێزکردن و پاکڕاگرتنی دەکـەن، تا بەهێزتر و دادپەروەرتر و خۆشگوزەرانتر بێت.

بەڵام توندڕەوی زەمینی یان ئاسمانی، پێکهاتە دەروونییەکەی وای لێدەکات تەواوی واقع وەک

خراپەیەکی ڕەها ببینێت کە دەبێ لەناوببرێت و لە جێگایدا واقیعێکی ئایدیالی تازە بێتەئاراوە کە هیچ خراپەیەکی تێدانەبێت و تەنها چاکە بەرهەمبێنێت، لەم واقیعەدا مرۆڤەکان خەسڵەتە فریشتەییەکان وەردەگرن. بەڵام هەم لە ڕێگەی ئەزموون و هەم لە ڕێگەی خیبرەی مێژووییەوە، دەبینین کاتێ توندڕەوێک لەو هەوڵەیدا سەرکەوتوو دەبێت، ئەوا تەنها لەوەدا سەردەکەوێت کۆمەڵگا لەسەر زەوی نەک ناکاتە بەهەشت، بەڵکو دەیکاتە پارچەیەکی گڕگرتوو لە دۆزەخ.

هەموو سەرکردەیەک لە سەرکردە توندڕەوەکان، ئامرازی فیکری تایبەت بە خۆی هەیە کە کاریان پێدەکات و لە ڕێگەیەوە ئاپۆرایەکی زۆری جەماوەر کۆدەکاتەوە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دیاریکراوەکەی کە بریتییە لە خێری ڕەها یان دادپەروەری ڕەها یان نەمری ڕەها، وەک ئەو حاڵەتەی لە حکومەتی ڕایخی سێیەم لە ئەڵمانیای نازی ڕوویدا. سەرۆک لە ڕێگەی فیکرە جوان و ئەفسوناوییەکانییەوە، دڵت دەبات و عەقڵت داگیردەکات، لەوانە تۆ مەزنترین هاوڵاتی سەر گۆی زەویت، تۆ سەر بە مەزنترین ڕەچەڵەکی مێژوویت، سەر بە مەزنترین نەتەوەیت، کەواتە دەی دوامکەوە تا هەموو ئەوە بۆ جیهان بسەلمێنین، بۆ هەموو جیهانی دەسەلمێنین ئەڵمانیا لەسەروی هەموانەوەیە. فیکرەی نازی بەم شێوەیە کەوتەڕێ و جەنگێکی ترسناکی بەرپاکرد تێیدا دەیان ملیۆن کەس کوژران، ئەم جەنگە خوێناوییە بە داگیرکردنی ئەڵمانیا و هاتنی پۆستاڵی سەربازەکان لە هەموولایەکی جیهانەوە بۆ سەر خاکی ئەڵمانیا و دابەشکردنی ئەڵمانیا بۆ دوو بەش و لەدەستدانی سەروەری وڵات بۆ نزیکەی نیو سەدە، کۆتاییهات.

لێرەدا دەگەینە تێگەشتن لە ترسناکترین ڕەگەز لە پێکهاتەی دەروونی کەسی توندڕەودا، ئەویش بریتییە لە شپرزەیی هێستریائامێز، ئەو شپرزەییە وا دەکات کەسی توندڕەو ناتوانێت هەست بە ئارامی و دڵنیایی بکات، ناتوانێت هەست بە ڕازیبوون بکات. لێرەوە ئارەزوی بۆ لەناوبردنی واقیع، سەرچاوەکەی ترسە لە واقیع و هەستکردن بەوەی نامۆیە بەو واقیعە و ناتوانێت خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێت و لە دروستکردنیدا بەشداربێت. ئەو بەردەوام هەست بە ئازارێکی کاریگەر دەکات، ئازارێک هیچ شتێک لەسەر زەوی نییە بتوانێ ئەو ئازارە یان ئەو شپرزەییەی کەمکاتەوە، ئەو ڕێگایەکی گرتووەتەبەر و بەسەریدا دەڕوات کۆتایی نییە.

بەم شێوەیە گروپە شۆڕشگێڕە توندڕەوەکان، خۆیان لە لایەک دەبینن و تەواوی جیهانیش لە لاکەی تر، مەحاڵە خاوەن فیکرە زەمینی و ئاسمانییەکان، پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەبێت. لەوانەیە لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا هاوپەیمانی ببەستێت، بەڵام ئەوە تەنها بە ئامانجی دەستدرێژیکردنە سەر لایەنی سێیەمە.

**سەرچاوە:**

الشرق الاوسط، ٢٩/ ١/ ٢٠١٤

# توندوتیژی دیکتاتۆریەت

نووسینی: فازل ئەلسولتانی
و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ



برتۆڵد برێشت

لە ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردوودا، دوای سەرکەوتنی نازیەت لە ئەڵمانیا، کۆچکردنی نووسەرانی ئەڵمانیا، بە گەورەترین کۆچکردنی ڕۆشنبیری دادەنرێت لەو سەدەیەدا. بەڵام ئەم نووسەرانە: برتۆڵد برێشت، تۆماس مان، کلاوس مان، ڕۆبەرت مۆسیل، ستیفان زفایج و دەیان نووسەری دیکە، لەو کات و ساتەدا ئەدەبێکیان بەرهەمهێنا، تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بە گرنگترین ئەدەبی هیومانستی دادەنرێت.
بەداخەوە لەو هەموو بەرهەمە ئەدەبییە، تەنها ژمارەیەکی کەمی گەشتووەتە دەستمان، تەنانەت ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ خودی ئەدەبی کلاسیکی ئەڵمانی، دەبینین هێشتا وەک پێویست نییە. ژمارەیەکی باشی شانۆگەرییەکانی برێشت و هەندێ لە ڕۆمانەکانی ستیڤان زڤایج کراون بە عەرەبی، لەوە زیاتر هیچی ئەوتۆ نەگەشتووەتە دەستمان و ئێمە شتێکی ئەوتۆ لەسەر ئەزمونی ئەدەبی ئەڵمانی لە تاراوگە نازانین. هەروەها هیچی ئەوتۆ لەسەر ئەدەبی ئەڵمانی لەناوەوە و پێش ئەو کۆچکردنە گەورەیە نازانین، بەتایبەتی ئەو بەرهەمە

ئەدەبییەی باس لە دیاردەی نازییەت و سەرکەوتنی و شێوازی سەرکوتکردنی دەکات کە شێوازێکی بە بەرنامە ڕێکخراو بوو. ئەمە سەرەڕای ئەو ئەدەبەی باس لەو بارودۆخ و کەشوهەوا ناوخۆییانە دەکات کە یارمەتی گەشەکردن و سەرکەوتنی دیاردەی نازییەتی دا، لەوانە (غافڵبوونی- غفلە) جەماوەر کە هەرگیز لێخۆشبوونی نییە.

وەک زانـــراوە هێتلەر بەشێوەیەکی دیموکراسی



هیتلەر

هەڵبژێردرا و هاتە سەر حوکم، ئەو لەسەر پشتی تانک و زرێپۆش نەهات. بەڵام ئاخۆ غافڵبوونی جەماوەر چۆن و لە کوێوە دێت؟ تۆماس مان لە ڕۆمانی (ملکەچی) دا ئەو میکانیزم و ئالییەتانە شیدەکاتەوە کە مرۆڤ دەگەیەننە ئەو ملکەچییە. یەکەم میکانیزمیش بریتییە لە دەستگرتن بەسەر عەقڵ و ویژدانی جەماوەردا لە ڕێگەی چەواشەکاری و درۆکردنەوە، خۆ ئەگەر ئەوە سودی نەبوو، ئەوا لە ڕێگەی هێزەوە ئەو کارە دەکەن. تا ئەو کاتەی خەڵکی ناچار بە ملکەچی دەکەن و ملکەچی بە تێپەڕینی ڕۆژگار لە نەستیاندا جێگیر دەبێت.

بەڵام هاوڕێ و هاوسەردەمەکەی تۆماس مان، "ستیڤان زڤایج" لە کتێبەکەیدا: (کاستیلۆ دژ بە کاڵفن، یان ویژدان دژ بە توندوتیژی) ئەم ملکەچییە لە ڕووکارە فیکرییەکەوە شیدەکاتەوە. ستیڤان ئەم کتێبەی دوای سێ ساڵ لە هاتنە سەر حوکمی نازییەکان نووسییوە. بەداخەوە ئەم کتێبە پێشەنگە تەنها ماوەیەکی کەمە گەشتووەتە دەست ئێمە، ئەویش لە ڕێگەی نووسەر و ڕۆژنامەنووس و وەرگێڕی لوبنانی "فارس یواکیم"ەوە، واتە ئەم کتێبە نزیکەی هەشتا ساڵ دواکەوتووە! فارس یواکیم بۆ وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ناونیشانێکی جـیـاوازی دانـــاوە کـە بریتییە لـە (تووندوتیژی دیکتاتۆرییەت).

ستیڤان زڤایج خـاوەنـی ڕۆمـانـی (نامەیەک لە ئافرەتێکی نادیارەوە) و (یاری شەترنج) و دەیان ڕۆمـان و کورتە چیرۆک و شانۆگەری و کاری وەرگێڕان، کاتێ ئەو کتێبەی سـەرەوەی نووسی: (ویژدان دژ بە توندوتیژی) لە تەمەنی پەنجا و دوو ساڵیدا بوو، جارێ هێشتا هەر لە نیشتیمانەکەی خۆیدا بوو. ئەو لەو ساتەوەختەدا و لەبەرامبەر ئەو سەرکوتکردنە بە بەرنامەکراوەی نازییەکاندا کە هەموو لایەنێکی ژیانی گرتبووەوە، هیچی بۆ نەکرا

ئەوە نەبێت خۆی بشارێتەوە و لەبەرچاو نەمێنێت. نووسەر لەو کتێبەیدا، لە ڕووکاردا وا دەردەکەوێت کە دەگەڕێتەوە بۆ چوار سەدە لەوەوبەر و باس لە ژیانی کاڵفن دەکات. (کاڵفن کەسێکی ستمگەر بووە، خاوەنی مەزهەبی کاڵفینی بوو کە بە ناوی ئاینەوە ژیانی لە هاوولاَتیانی وڵاتەکەی تاڵ کردبوو). وەک لە کتێبەکەدا باسکراوە، ستمگەری کاڵفن دادگاکانی پشکنینی کاسۆلیکی تێپەڕاندووە، دادگاکانی پشکنین لە هەموو بارودۆخێکدا، کاتێ ستەمیان لە کەسێک دەکرد کە لەلایەن سیخوڕ و بەرکێگیراوەکانەوە ڕاپۆرتیان لەسەر دەنووسی. بەڵام لەسەردەمی کاڵفن دا، هەمو مرۆڤەکان وەک کەسێکی خراپەکار تەماشا دەکرا و هەموو کەسێک پێشوەختە بە گوناهبار تۆمەتبار دەکرا، ئەمە وایکرد خەڵکی و پیاوانی ئاینی هەمویان لە دەورەی کاڵفن کۆببنەوە! بگرە تکایان لێکرد بۆ هەتاهەتایە لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە.
هیچ کەسێک لەبەرامبەر کاڵفن دا ڕانەوەستا، تەنها پیاوێک نەبێت، ئەویش کاستیلۆ بـوو. کاستیلۆ ڕۆشنبیریەکی گەورەی هەبوو، یەکێک بوو لە لایەنگران و هەوادارانی کاڵفن. بەڵام دوای ئەوەی نەیتوانی چیتر بەرگەی زوڵم و ستەمی کاڵفن بگرێت، لە دژی ڕاپەڕی. لە کتێبەکەی ستیڤان زڤایج دا کاڵفن هیچ نییە جگە لە دەمامکێک، چونکە لە هەموو لاپەڕەیەکی کتێبەکەدا لە پشتی ئەو دەمامکەوە هێتلەر دەبینین، هەروەها هەموو ستمگەرە کۆن و تازەکان دەبینین، لەگەڵ گۆڕانی دیکۆردا. ئەگەر کاڵفن بەرگێکی ئاینی کردبێت بە بەر ستمگەرییەکەیدا، ئەوا هێتلەر و ستەمگەرەکانی دواتر، بەرگێکی نەتەوەییان کرد بە بەریدا.
ستیڤان زڤایج، وەک تۆماس مان پێیوایە میللەت لە بارودۆخێکی تایبەتدا و لە دروستکردنی دیکتاتۆردا، بەرپرسیارییەتێکی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام گەر لەناو ئەو میللەتەدا، تەنها یەک کەس بمێنێت، یان تەنها یەک ویژدانی زیندوو بمێنێت، ئەوا دیکتاتۆر ناتوانێت بە ئاسودەیی چاو لێکبنێت. هەر ئەوەش بوو بەسەر کاستیلۆدا هات، لەسەر دەستی کاڵفن ئازار و ئەشکەنجەدرا و پاشان دوورخرایەوە. لەسەر دەستی هێتلەر هەمان شت بەسەر ستیڤان زڤایج دا هات. تا ئێستاش هەر کەسێک بڵێ (نەخێر) هەمان شتی بەسەردا دێت، گەرچی ئەو کەسە بە تەنها هەر خۆشی بێت.

**سەرچاوە:**
الشرق الاوسط، ٢٠١٣/٩/٩


تۆماس مان

# تارماییەکانی باوک

نووسینی: خەلدون ئەلنبوانی
و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

لێرەدا تەنها دەمەوێ بیرۆکەی (باوک)ی مردوو و زیندوو نزیکبکەمەوە کە هەر یەکە لە شکسپیر لە شانۆگەری هاملێت و فرۆید لە هەردوو کتێبەکەی (تەوتەم و تابۆ) و (نیگەرانی شارستانیەت) و دێریدا لە تێکستی (لەبەردەم یاسا)دا پێشکەشیان کردووین.

کەواتە سەرەتا لە شانۆگەری (هاملێت)ەوە دەست پێدەکەم کە تێیدا شەکسپیر وادەکات تارمایی باوک لە جیهانی مردووەکانەوە بگەڕێتەوە. باوکی هاملێت دوای کوشتنی، لە ڕێگەی تارماییەکەیەوە دەگەڕێتەوە و بەردەوامی بە ژیانی دەدات. ئەم بەردەوامییە لە میانەی هاملێتی کوڕیەوە بەرجەستە دەبێت کە دەکەوێتە شوێن وەسیەتەکانی تارمایی باوک و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی. گەر بە قووڵی لەم وێنەیەی تارمایی باوک بڕوانین، بۆمان دەردەکەوێت کە بە ڕاستی و دروستی نەمردووە، تارماییەکە جۆرێکە لە ژیان یان جۆرێکە لە ئامادەگییەکی زیندووانەی مردوویەک. (یان جۆرێکە لەو حاڵەتەی ڤیلیپ. ک. دیک لە ڕۆمانەکەی (ئۆبیک) وەسفی دەکات: نیوە ژیان و نیوە مردوو).

لە شانۆگەریەکەی شکسپیردا، هاملێتی باوک نەمردووە، گەرچی کوژراوە و کۆتایی پێهاتووە. چونکە ژیانی هاملێتی باوک، لە میانەی کوڕەکەیەوە بەردەوام دەبێت و کوڕەکەی ئەو کارانە تەواو دەکات کە ئەگەر باوکی زیندوو بوایە تەواوی دەکرد. کوڕ فەرمانەکانی باوک جێبەجێ دەکات، لێرەوە ژیانی هاملێتی کوڕ، دەگۆڕێت بۆ بەشێکی تەواوکەر لە ژیانی هاملێتی باوک، باوکێکی زیندووی مردوو، یان مردووی زیندوو.

دووەم بیرۆکە کە دەمەوێ بەخێرایی باسی بکەم، بیرۆکەی فرۆیدە دەربارەی پەیدابوونی شارستانیەت کە لە دەرئەنجامی کوشتنی باوکەوە هاتووەتە ئاراوە. ئەم بیرۆکەیە لای فرۆید، بەشێوەیەکی سەرەکی لە کتێبی (تەوتەم و تابۆ) پاشان لە کتێبی (نیگەرانی شارستانیەت) بەدیارکەوت. ئەم



لێرەدا تەنها دەمەوێ بیرۆکەی (بـاوک)ی مردوو و زیندوو نزیکبکەمەوە کە هەر یەکە لە شکسپیر لە شانۆگەری هاملێت و فرۆید لە هـەردوو کتێبەکەی (تەوتەم و تابۆ) و (نیگەرانی شارستانیەت) و دێریدا لە تێکستی (لەبەردەم یاسا)دا پێشکەشیان کردووین. کەواتە سەرەتا لە شانۆگەری (هاملێت)ەوە دەست پێدەکەم کە تێیدا شەکسپیر وادەکات تارمایی باوک لە جیهانی مردووەکانەوە بگەڕێتەوە. باوکی هاملێت دوای کوشتنی، لە ڕێگەی تارماییەکەیەوە دەگەڕێتەوە و بـەردەوامـی بە ژیانی دەدات. ئەم بەردەوامییە لە میانەی هاملێتی کوڕیەوە بەرجەستە دەبێت کە دەکەوێتە شوێن وەسیەتەکانی تارمایی باوک و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی. گەر بە قووڵی لەم وێنەیەی تارمایی باوک بڕوانین، بۆمان دەردەکەوێت کە بە ڕاستی و دروستی نەمردووە، تارماییەکە جۆرێکە لە ژیان یان جۆرێکە لە ئامادەگییەکی زیندووانەی مردوویەک. (یان جۆرێکە لەو حاڵەتەی ڤیلیپ. ک. دیک لە ڕۆمانەکەی (ئۆبیک) وەسفی دەکات: نیوە ژیان و نیوە مردوو).

لە شانۆگەریەکەی شکسپیردا، هاملێتی باوک نەمردووە، گەرچی کوژراوە و کۆتایی پێهاتووە. چونکە ژیانی هاملێتی باوک، لە میانەی کوڕەکەیەوە بەردەوام دەبێت و کوڕەکەی ئەو کارانە تەواو دەکات کە ئەگەر باوکی زیندوو بوایە تەواوی دەکرد. کوڕ فەرمانەکانی باوک جێبەجێ دەکات، لێرەوە ژیانی هاملێتی کوڕ، دەگۆڕێت بۆ بەشێکی تەواوکەر لە ژیانی هاملێتی باوک، باوکێکی زیندووی مردوو، یان مردووی زیندوو. دووەم بیرۆکە کە دەمەوێ بەخێرایی باسی بکەم، بیرۆکەی فرۆیدە دەربارەی پەیدابوونی شارستانیەت کە لە دەرئەنجامی کوشتنی باوکەوە هاتووەتە ئاراوە. ئەم بیرۆکەیە لای فرۆید، بەشێوەیەکی سەرەکی لە

کتێبی (تەوتەم و تابۆ) پاشان لە کتێبی (نیگەرانی شارستانیەت) بەدیارکەوت. ئەم بیرۆکەیە لای فرۆیدا بە کورتی و بە پوختی لەسەر ئەم فیکرەیە دامەزراوە: باوک لە شارستانەیتی کۆندا، سەرجەم ژنانی خێڵی تەنها بۆ خۆی دەبرد، بەمەش ڕێگەی نەدەدا هەموو نێرینەکانی خێڵ لە ژنەکان نزیکببنەوە، بەو پێیەی تەنها موڵکی خۆی بوون. بەپێی گێڕانەوەکەی فرۆیدا، حەز و ئارەزووە سێکسییەکانی کوڕەکان کە لەلایەن باوکی دەسەڵاتدار و باڵادەستەوە کەبتکرابوون، گۆڕا بۆ ڕق و کینەی کوڕەکان بەرامبەر بە باوک. لێرەوە لای کوڕەکان حەزێکی گەورە بۆ کوشتنی باوک و ڕزگاربوون لێی، بەردەوام لە گەشەکردندا بوو. چونکە کوڕەکان پێیانوابوو باوک بەربەستە لەبەردەم ئەوەی چێژ لە ژنانی خێڵەکەیان وەربگرن، سا ئەو ژنانە دایکەکانیان یان خوشکەکانیان یان پورەکانیان یا مامۆژنەکانیان...هتد بن.

هەر ئەمەش بوو ڕوویدا، ڕق و کینەی کوڕەکان بەرامبەر بە باوک ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبووندا بوو، تا ئەو کاتەی هەستان بە کوشتنی باوک. بەڵام، بەپێی لێکدانەوەی فرۆید، کوڕەکان ڕاستەوخۆ دوای کوشتنی باوک، هەستیان بە پەشیمانی کرد لەوەی باوک کە سیمبولی خێڵ بوو، کوشتویانە. ئا لەو کاتەدا کوڕەکان هەستیان بە گرێی تاوان کرد، بۆیە بڕیاریاندا خۆیان لە تاوانەکەیان پاکبکەنەوە، بەوەی سزای خۆیان بدەن و خۆیان لە ژنانی خێڵەکەیان بێبەش بکەن، چونکە هۆکاری ڕاستەقینەی پشت کوشتنی کوڕەکان بۆ باوک، ئارەزووە سێکسییەکانی ژنانی خێڵ بوو. لێرەوە کوڕەکان کەوتنە گەڕان بە دوای ژنانی دەرەوەی خێڵ، ژنانێک لە دەرەوەی چوارچێوەی خیڵەکەیان. بەمەش چوارچێوەی خێڵ تێکشکێنرا و مەسەلەی ژنهێنان هاتەئارەوە. (زۆرجار ئەم ژنهێنانە لە ڕێگەی فڕاندنەوە یان دیلکردنەوە ئەنجامدەدرا، ئەم حاڵەتە تا ئێستا لە گۆرانییەکانی ژنهێنانی لای ئێمە ئامادەیی هەیە). لێرەوە کرانەوەی خێڵەکان بەسەر یەکتردا، بووە هۆکاری پەیدابوونی شارستانیەت.

دێریدا لە تێکستە قووڵەکەیدا (لەبەردەم یاسا)، قسە لەسەر پەرەگرافێکی فرۆید دەکات کە لە کتێبی (تەوتەم و تابۆ)دا هاتووە، فرۆیدا لەو پەرەگرافەدا دەڵێ: (هیچ یەکێک لە کوڕەکان نەیتوانی ئارەزووە غەریزەییەکەی بێنێتەدی و شوێنی باوک بگرێتەوە). دێریدا پێیوایە ئەم دەربڕینەی فرۆید، تەنها ئاماژەیەک نییە بە هەستی تاوانباربوون و حەزی ئەوەی کوڕەکان سزای خۆیان بدەن، وەک ئەوەی فرۆید پێیوابووە. بەڵکو ئەو پەرەگرافە ئاماژەیە بۆ ئەوەی باوک لە بنەڕەتدا نەمردووە، هەر ئەم هۆکارەشە وادەکات هیچ یەکێک لە کوڕەکان نەتوانن بڕۆنە شوێنەکەی. بە مانایەکی دی، ئەو یاسایەی باوک لە (کاتی ژیانیدا) سەپاندبووی و بەپێی یاساکە کوڕەکانی بۆیان نەبوو چێژ لە ژنانی خێڵەکەیان وەربگرن، یاساکە دوای مردنی باوک، هەر مایەوە و لەکارنەکەوت و کوڕەکان هەر وەک جاران بێبەشبوون لە چێژوەرگرتن لە ژنانی خێڵ.

دێریدا پێیوایە، لە شانۆگەری (هاملێت)یشدا، دیسانەوە باوک نەمردووە. بگرە باوک دوای (مردنیشی) تەواوی دەسەڵاتەکانی بەکاردەهێنێت. ئەو مردوویەکی زیندووە یان زیندوویەکی مردووە و سەرجەم دەسەڵاتە دیکتاتۆریەتەکەی و یاساکانی، لە میانەی دەسەڵاتە میراتگرەکەی کوڕەکەیەوە، دەسەپێنێت. کوڕەکەی بە تەواوی ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانەیە کە لەلایەن تارمایی باوک، کە لە مردن گەڕاوەتەوە، دەردەچێت.

**سەرچاوە:** الاوان، ١٨ /٩/ ٢٠١٣

# کتێبی "ژنی سەرکردەکان.. نساء الزعماء" باس لە چی دەکات؟

و. لە عەرەبییەوە: سەردەم



ئەم کتێبە باس لە چیرۆکی خۆشەویستی سەرۆک و پادشاکانی عەرەب دەکات بۆ هاوسەرەکانیان. دانەری کتێبەکە "موئمن ئەلمحەمەدی" لە سەرەتادا باس لەوە دەکات "عەلی عەبدوڵڵا ساڵح" شوانی مەڕ بووە و حەزی لە کچێکی شوان کردووە و ساڵی ١٩٦٤ لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا ئەو کچە شوانەی هێناوە. بەڵام ئەم هاوڕێی گەنجییەی لە ساڵی ١٩٧٩ بە ڕووداوی هاتوچۆ دەمرێت و پێنج کچ و دوو کوڕی بۆ بەجێدەهێڵێت. پاشان ساڵح دوو جاری دیکە ژن دەهێنێت، بێ ئەوەی دەموچاویان ببینێت، تەنها لە شەوی زاوایەتیدا نەبێت.

دواتر دانەر باس لە چیرۆکی ژنهێنانی "جەمال عەبدولناسر" دەکات، لێرەدا باس لەوە دەکات عەبدولناسر زوو زوو سەردانی ماڵی "عەبدولحەمید"ی هاوڕێی کردووە، کیژۆڵەیەکی ناسک و شۆخ و شەنگ کە ناوی "تحیە" بووە، هاتووەتە ژوورەوە و (چا) ی لەبەردەم داناوە. جەمال بۆ یەکەمجار کە ئەو کیژۆڵەیە دەبینێ، پێی سەرسام دەبێت، "تحیە" لەو کاتەدا کچۆڵەیەکی بچوک و هێمن و ناسک بووە، ئەم کچۆڵەیە کەس نەبووە تەنها کچی "عەبدولحەمید"ی هاوڕێی نەبێت.

دوای چەندین سەردانی دیکە، جەمال تا بێت زیاتر شەیدای ئەو کچە منداڵکارە دەبێت، بۆیە بە باوکی کیژۆڵەکە دەڵێت کە دەیەوێت بیخوازێت و ببێت بە هاوسەری. هەرچەندە باوکی کچەکە "عەبدولحەمید" و براکانی، لەبەر وەزیفە سەربازییەکەی جەمال عەبدولناسر کە تەنها موچەیەکی زۆر کەمی هەیە، دوو دڵ دەبن لەوەی ڕازیبن. وەلێ "تەحیە" کارەکەی یەکلایکردەوە و دەرگای دوودڵی داخستووە، کاتێ جەمال پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی بزانێ ئایا تەحیە ڕازییە یان نا، تەحیە بێ هیچ دوو دڵ و ڕاڕاییەک ڕازی بووە. ئیدی پرۆسەی مارە بڕین ئەنجامدەدرێت و دوای دوو مانگ کیژۆڵەی ناسک گواستراوەتەوە. ئەم کچە چ پێش ئەوەی عەبدولناسر ببێت بە سەرۆک و چ دوای ئەوەی بوو بە سەرۆک، وەک خانمێکی سادە و خاکی مایەوە و ژیانی تەرخانکردبوو بۆ خزمەتکردنی هاوسەرەکەی و منداڵەکانی: هدی و منی و خالد و عەبدولحەمید و عەبدولحەکیم.

پاشان نووسەری کتێبەکە دێتە سەر باسی چیرۆکی هاوسەرگیری "عومەر ئەلبەشیر" لەگەڵ "ویداد" و دەڵێ سەرۆکی سودان، کاتێ دەکەوێتە داوی خۆشەویستی خانمێکی سودانی خانەدان و ڕۆشنبیر "ویداد بابکر" ژنی هەبووە. ئەم خانمە توانیویەتی بە کەسایەتییە بەهێزەکەی دڵی عومەر بەشیر بەلای خۆیدا ڕاکێشێت. ئەم خانمە پێشتر هاوسەری لیوا "ابراهیم شمس الدین ئەحمەد" بووە کە لە ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی هەلیکۆپتەردا کوژراوە. "ویداد" خان زۆر بە خێرایی توانی نازناوی خانمی یەکەم وەربگرێت، ئەمەش لە میانەی ئەو یارمەتی و کۆمەکانەوە بوو کە پێشکەشی ئاوارە و لێقەوماوانی دارفۆڕ ی کرد. بەڵام دوای ئەوەی ڕەخنەیەکی زۆر لە عومەر ئەلبەشیر گیرا، بەوەی ژنەکەی بۆ جوانکردنی وێنەی خۆی لەبەردەم جیهاندا بەکاردەهێنێت، ویداد لە گۆڕەپانەکەدا پاشەکشەی کرد و دیار نەما. هەرچی ژنی یەکەمی عومەر ئەلبەشیرە، کەس هیچ شتێکی لەبارەوە نازانێت.

لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا، نووسەر قسە لەسەر چیرۆکی خۆشەویستی نێوان "یاسر عەرەفات" و "سوها" دەکات. یەکەم ترپەی خۆشەویستی دڵی یاسر

عەرەفات بۆ سوها، ساڵی ١٩٨٩ بووە لە پاریس کە بۆ یەکەمجار سوها-ی بینیوە. لەو کاتەدا سوها قسەزان و زمان پاراو بووە، ڕوخسارێکی گەشاوەی هەبووە، قژی بەسەر شانیدا هاتبووە خوارەوە و وەرگێڕی ڕاستەوخۆی یاسر عەرەفات بوو لە کۆبوونەوەکانی لەگەڵ حکومەتی فەرەنسیدا. کاتێ عەرەفات داوای لێدەکات لەگەڵیدا بڕوات بۆ تونس، ئیدی بە تەواوی دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ئەم خانمەوە. سەرەتا بە هۆی شارەزایی سوهاوە، عەرەفات لە بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی پەیوەندییە گشتییەکانی ڕێخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی، پەنای بۆ بردووە و پرس و ڕای پێکردووە. دواتر هێندەی نەبرد بوو بە ڕاوێژکاری عەرەفات بۆ مەسەلە ئابورییەکان. بەڵام بە پێی قسەی دانەری کتێبەکە، عەرەفات ساڵی ١٩٩٠ بە نهێنی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجامدابوو، دوای ئەوە بە دوو ساڵ هاوسەرگیریەکەیان ئاشکرا کردووە و ڕایانگەیاندووە، عەرەفات لەو کاتەدا تەمەنی ٢٧ ساڵ بوو. سوها وەک ڕێزێک بۆ هاوسەرەکەی، پێش ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری ببوو بە ئیسلام.

دانەر سەبارەت بە "حوسنی موبارک و سۆزان" دەڵێ یەکێک لە خوێندکارەکانی موبارەک، لە کۆلیژی سەربازی، بە هۆی دەرچوونییەوە، لە ماڵی خۆیان حوسنی موبارەک-ی بانگهێشتی ئێوارە خوانێک کردووە، لەوێدا چاوی بە سۆزان دەکەوێت و لە ساڵی ١٩٨٥ پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجامدەدات. موبارەک لە ڕێگەی برایەکی سۆزان-ەوە سۆزان دەناسێت، ئەم برایەی ناوی "مونیر سابت"ە، کە بۆ خوێندنی فڕۆکەوانی، پەیوەندی بە ئەکادیمیای (ئاسمانی- جەوی) کردووە. ئەو کات موبارەک لەو ئەکادیمییەدا مامۆستا بووە. بەم جۆرە موبارەک ئاشنایەتی لەگەڵ ئەندامانی ئەم خێزانە پەیدا دەکات و سۆزان دەناسێت. موبارەک لەکاتی مارە بڕیندا، لە هێزی ئاسمانیدا، مولازمی دوو نەجمەی فڕۆکەوانی بووە. سۆزان لە ساڵی ١٩٨٥ تەمەنی تەنها ١٧ ساڵ بووە و دەرچووی ئامادەیی بووە لە قوتابخانەی (سان کلێر).

نووسەر دواتر سەبارەت بە "ئەنورە سادات و جیهان" دەڵێ ئەنوەر سادات دوو جار ژنیهێناوە، یەکەمیان (ئیقبال) کە سێ کچی لێی هەبووە: ڕوقیە، ڕاویە، کامیلیا، پاشان تەڵاقی داوە و ساڵی ١٩٤٩ "جیهان ڕەووف صفوەت"ی هێناوە و سێ کچ و کوڕێکی لێی هەبووە: لوبنی، نهی، جیهان، جەمال. دانەر باس لەوە دەکات جیهان لە ساتی یەکەمەوە دەکەوێتە داوی خۆشەویستی ئەنورە سادات-ەوە، بەڵام دایکە ئینگلیزەکەی جیهان هەر کە گوێی لەوە دەبێت ڕازینابێت. بەڵام ئەوە هیچ لە ورە و پێداگری جیهان، بۆ بەرگریکردن لە خۆشەویستییەکەی، کەمناکاتەوە. بە دروستی هەر ئەوەش ڕوویدا، دوای تێپەڕینی چەند مانگێک بەسەر تەڵاقدانی سادات بۆ ژنی یەکەمی، جیهان دەهێنێت.

دواتر دانەر باس لە چیرۆک و بەسەرهاتی خۆشەویستی و هاوسەرگیری نێوان "محەمەدی شەشەم و سەلما" دەکات، باس لە نهێنی یەکەم بینین دەکات کە پاشای مەغریبی لەگەڵ کچێکی هەژاردا کۆکردووەتەوە. ئەو یەکتر بینییە لە ساڵی ١٩٩٩ لە ئاهەنگی کۆمپانیایەکدا بووە کە خێزانی پاشایەتی مەغریب خاوەنی کۆمپانیاکە بوون و سەلما-ش وەک ئەندازیارێک کاری لەو کۆمپانیایەدا کردووە.

سەرچاوە: پاشکۆی ڕۆژنامەی المدی، ٢٠١٤/٢/١١

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

دەزگای سەردەم وەک کاری هەرە سەرەکی خۆی کە بریتییە لە چاپکردنی کتێب و گۆڤارەکان و دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی، لە ماوەی دوو مانگی ڕابـردوودا، جگە لە دەرچوونی گۆڤارەکان کە بریتین لە گۆڤاری مانگانەی منداڵی سەردەم، گۆڤاری سەردەم، گۆڤاری زانستی سەردەم، گۆڤاری ئەدەبی سەردەم، چەند کتێبێکی بە چاپ گەیاندووە و بڵاویکردوونەتەوە. لە خوارەوە هەندێ لەو کتێبانە بەسەر دەکەینەوە و تاڕادەیەک ناوەڕۆکی کتێبەکان بە خوێنەری گۆڤارەکە و تەواوی خوێنەرانی دیکە ئاشنادەکەین.




## پیاوێكی تێكشكاو

ئەم كتێبە یەكێكە لە ڕۆمانە جوان و بە پێزەكانی نووسەری مەغریبی/ فەرەنسی تاهیر بن جەللون. ئەم نووسەرە كە ساڵی ١٩٤٤ لە شاری فاس لەدایكبووە، سەر بە نەوەی دووەمی ئەو نووسەرە مەغریبیانەیە كە بە زمانی فەرەنسی دەنووسن. یەكێك لە كێشەكانی ئەم نووسەرە ئەوەیە كە خۆی بە نووسەرێكی فەرەنسی دەزانێت نەك مەغریبی، هەرچەندە فەرەنسییەكان ئەدەبەكەی بە ئەدەبێكی فەرەنسی دانانێن. لە فیستیڤاڵی جیهانی (زمان و مەنفا) كە ساڵی ٢٠١٠ لە لەندن سازكرابوو، تاهیر بن جەللون زۆر بەوە دڵگران بوو كە بینی كتێبەكانی لە بەشی كتێبخانەی فەرەنسیدا، لە خانەی (ئەدەبی بیانی) دانرابوون. ڕاستە ئەم نووسەرە بە زمانی فەرەنسی دەنوسێت و خەڵاتی (كۆنگۆر)ی فەرەنسی لەسەر ڕۆمانی شەوی قەدر وەرگرتووە. بەڵام جیهانی نێو ڕۆمانەكانی و كارەكتەرەكانی، بەشێكن لە جیهانی عەرەبی و گوزارشت لەو كێشانە دەكەن كە لە وڵاتانی عەرەبیدا بەرقەرارن. هەر بۆ نموونە تەواوی ڕووداوەكانی ڕۆمانی پیاوێكی تێكشكاو، لەمرۆی وڵاتی مەغریب دا ڕوودەدات. ڕۆمانەكە باس لە پەتای گەندەڵی دەكات كە وەك دەردێكی كوشندە لە بەشێكی زۆری وڵاتانی عەرەبی بە تایبەتی و وڵاتانی خۆرهەڵاتدا بە گشتی بڵاوبووەتەوە.

كارەكتەری سەرەكی ڕۆمانەكە كە ئەندازیارە و ناوی (موراد)ە، سەرەتا دەیەوێ وەك مرۆڤێكی پاك و بێگەرد و دوور لە پەتای گەندەڵی، كار و فرمانەكانی جێبەجێ بكات. وەلێ ئەم خۆ بەدوورگرتنە، تاسەر نابێت و لە ڕێگەی گەلێك فاكتەرەوە، دەكەوێتە نێو زەریا گەورەكەی گەندەڵییەوە، زەریایەك هاتووە و هەموان تێیدا مەلەدەكەن و كەسێك نەماوە لە دەرەوەی ئەو زەریایەدا بێت و بە پاكی مابێتەوە. بەڵام ئەم پیاوە، وەك ئەوانی دیكە نییە و بەرگەی ئەو پەتایە ناگرێت، پێیناخۆشە كەوتووەتە نێو ئەو زەریای گەندەڵییەوە، هەر بۆیە لەگەڵ یەكەم وەرگرتنی پارەی گەندەڵیدا، باری دەروونی




## ئەندرێ تاراکۆڤسکی..
## ڕۆژانە یاداشتەکان

ئەم کتێبە بریتییە لە نووسینەوەی یاداشتە ڕۆژانەکانی دەرهێنەر و ئەکتەر و نووسەر و تیۆرسازی سینەمای ڕووسی "ئەندرێ تاراکۆڤسکی"یە. ساڵی ١٩٣٢ لە شاری (زفراجییە)ی ڕووسیا لە دایک بووە، کوڕی شاعیری ڕووسی "ئارسینی تاراکۆڤسکی"یە. دوای ئەوەی دایک و باوکی لەیەکتر جیادەبنەوە، ئەدرێ و خوشکێکی لەگەڵ دایکی دەمێننەوە، دایکی بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی خۆی و دوو منداڵەکەی، بە ناچاری لە چاپخانەیەکدا کاری هەڵەچنی دەکات. تاراکۆڤسکی بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە، واز لە خوێندنی سەرەتایی دێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی بۆ لای دایکی، بەڵام لەکاتی جەنگەکەدا، ئەم خێزانە ناچار دەبن

تێکدەچێت و پێستی دووچاری سووربوونەوە دەبێت و لە هاوسەرەکەی جیادەبێتەوە و ماوەیەک لەگەڵ سۆزانییەکاندا کات بەسەر دەبات.

کاراکتەرەکە لە نێوان ئەوەی پاشگەزبێتەوە و لەو زەریایە بێتەدەرێ یان زیاتر ڕۆبچێتە ناوی و وەک دەوترێ گۆم تا قووڵ بێت مەلەی خۆشە، دێت و دەچێت. خوێنەری کورد هەست دەکات ئەم ڕۆمانە باس لە کۆمەڵگای کوردی دەکات، کۆمەڵگایەک لە ئێستادا یەکێک لە نەخۆشییە هەرە کوشندە و بێ چارەسەرەکانی، پەتای گەندەڵییە کە وەک تۆڕێ جاڵجاڵۆکە تەواوی جومگەکانی ژیانی تەنیوە. هەر بۆ نموونە با پێکەوە ئەم پەرەگرافە بخوێنینەوە کە لە لاپەڕە ٢٠٤ هاتووە: (لەم وڵاتە وێرانەدا، ئەوەی دز بێت، ژیانی پارێزراوە، ئەوەی گەندەڵ و بەرتیلخۆر بێت، دەستخۆشی لێ دەکرێ، ئەوەی پاک و شەریفیش بێت، هەڕەشەی لێ دەکرێ و سووکایەتیی پێ دەکرێ). تەماشا دەقا و دەق دەڵێی باسی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان دەکات!

خاڵێکی جوانی دیکەی ئەم ڕۆمانە، بریتییە لەو وەرگێڕانە نایاب و جوانەی کە لە لایەن کاک ئازاد بەرزنجی-یەوە ئەنجامدراوە. وەرگێڕانێک دووچاری هەناسەبڕکێ یان تێنەگەیشتن یاخود ناڕوونیت ناکات و بە زمانێکی کوردی بێ گرێ و گۆڵ داڕێژراوە. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ٢٤٢ لاپەڕەی قەبارە بچووکە، تیراژی ١٠٠٠ دانەیە و نرخی ٤٠٠٠ دینارە.

ماڵەکەیان بە جێبێڵن و تاماوەیەک بڕۆن بۆ لای خزمەکانیان.
ساڵی ١٩٥٨، واتە لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا، یەکەم کاری سینەمایی خۆی پێشکەش کرد کە بریتی بوو لە فیلمێکی کورت بە ناونیشانی (بکوژەکان) و لە کورتە چیرۆکێکی ئارنست هیمنگوای-یەوە وەریگرتبوو. ئەم دەرهێنەرە، لەم کتێبەیدا بە دوور و درێژی باس لە چۆنیەتی کارکردنی لە سینەما و ئەو کێشانەی دەکات کە لە کاتی بەرهەمهێنانی فیلمەکاندا هاتوونەتە سەر ڕێی. کتێبەکە باس لە یاداشتی ڕۆژانەی نۆ ساڵی ئەم دەرهێنەرە ڕووسییە دەکات کە یەکێکە لە دەرهێنەرە هەرە مەزن و نایابەکانی بواری سینەمای جیهانی و خاوەنی چەندین فیلمی جوان و دەگمەنە، لەوانە (ئەندرێ ڕۆبیلیف) و (منداڵی ئیڤان) و (ئاوێنە) و (سولاریس)، ئەم فیلمەی دواییان فیلمێکی خەیاڵی زانستییە و لە ڕۆمانی ڕۆماننوسی ڕووسی "ستانیسلاف لیم"ەوە وەریگرتووە کە هەمان ناونیشانی ڕۆمانەکەیە و باس لە کەشتییەوانێکی ئاسمانی دەکات ژنەکەی ونکردووە، بەڵام لە کۆمەڵێ ڕووداوی سەیر و سەرنجڕاکێشدا لەو هەسارەیە دەیدۆزێتەوە کە بۆی ڕەوانە کراوە.
ئەم دەرهێنەرە هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (ڕیتم- ئیقاع- ڕەگەزی سەرەکییە بۆ دروستکردنی سینەما). ئەمە جگە لە کۆمەڵێ ڕەگەزی دیکە، لەوانە زەمەن و ئەوەی لەسەر شتەکان و ڕۆحی کارەکتەرەکان جێیدەهێڵێت. فیلمی ئاوێنە کە ساڵی ١٩٧٥ بەرهەمی هێناوە، بە وەرچەرخان دادەنرێت لە بواری کارکردنی لە گێڕانەوەی (سرد) سینەمادا، لە لایەنی بیرۆکە و بونیادی درامییەوە، بە ئاڵۆزترین فیلمی دادەنرێت. چونکە پاڵەوانی فیلمەکە "ئەلکسی" لەسەر شاشەکە دەرناکەوێت، بەڵام ئێمە دەنگی دەبیسین و تەنها یەک جار دەستی دەبینین. لێرەدا ژیان تاریک و ناڕوونە، وەک ئەوەی ژیان کۆپلەیەک بێت لە ڕۆمانی (گەڕان بە شوێن زەمەنی ونبوودا)ی مارسێل برۆست. لێرەوە ونبوون چەقی کارکردنی تاراکۆفسکی-یە و تەوەرەی سەرەکی فیلمەکانی لە دەوری گەڕاندنەوەی زەمەنی لەدەستچووە و تۆمارکردنی ئەو زەمەنەیە.
تاراکۆفسکی لەم کتێبەیدا بە درێژی باس لە فیلمی ئاوێنە و فیلمەکانی دیکەی دەکات. ئەم کتێبە بە زمانێکی کوردی جوان و ڕەوان، لەلایەن کاک دلاوەر قەرەداخی، لە سویدییەوە کراوە بە کوردی و خوێندنەوەی دەتباتە جیهانی سینەما و چۆنیەتی بەرهەمهێنانی فیلم و گرفتەکانی. لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە بۆمان دەردەکەوێت، فیلم هەر ئەوە نییە ئێمە لە هۆڵەکانی سینەمادا بە ئیسراحەت و بێ ماندووبوون تەماشای دەکەین، بەڵکو فیلم تا دەگاتە هۆڵەکان و کاتی نمایشکردنی، دەیان و سەدان گرفت و بەربەست دێنەڕێی و پیشەسازییەکی تاقەپڕوکێنەرە و کارێکی زەحمەتە. ئەم کتێبە ٣٧٥ لاپەڕەی قەبارە گەورەیە، تیراژی ٥٠٠ دانەیە و نرخی شەش هەزار دینارە.




## جیهانی دووەم... دەسەڵات و دەستڕۆیشتن له سیستمی نوێی جیهانێدا

ئەم کتێبە هەر لە ناونیشانەکەیەوە، وادەکات حەز بە خوێندنەوەی بکەیت و بزانی جیهانی دووەم بە کوێ دەوترێت و چ وڵاتگەلێک دەگرێتەوە. ئایا مەملەکەت و سەرزەمینەکانی وڵاتانی جیهانی دووەم چین و بۆچی ئەو ناوەیان بەسەردا براوە؟ ئاخۆ جیاوازییەکانی نێوان جیهانی دووەم و جیهانی یەکەم و سێیەم لە چیدایە؟ ئایا خاڵی هاوبەش و جیاواز لە نێوان ئەو سێ جیهانەدا هەیە کە تەواوی وڵاتانی دونیای بەسەردا دابەشکراون. باشە سنوری جیهانی دووەم لە کوێوە دەست پێدەکات و بە کوێدا تێدەپەڕێت و لە کوێدا کۆتایی پێدێت؟ ئایا جیهانی دووەم سەرزەمینێکی چەق بەستووی جێگیرە یان لە گۆڕانکاریدایە. واتە ئایا ئەو وڵاتانەی دەکەونە سنوری جیهانی دووەمـــەوە، هەر لەو سنورەدا دەمێننەوە، یان دەکرێ پێشبکەون و گەشە بکەن و بڕۆنە ڕیزی وڵاتانی جیهانی یەکەمەوە، یا ئەوەتا پاشەکشە دەکەن و دەدەنە دواوە و دەکەونە ڕیزی وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە.

ئـەوە کۆمەڵێ لـەو پرسیارانەیە کـە لـە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا، وەڵامەکانیمان دەست دەکەوێت. ئەم کتێبە پڕە لە زانیاری و دەکرێ وەک ئینسایکلۆپیدیایەک تەماشا بکرێت. خوێنەر لە گۆشەیەکی ماڵەکەی خۆیدا دانیشتووە و گەشتێکی بێ کۆتایی پڕ زانیاری لە نێو هەندێ لە وڵاتانی ئەم گەردونەدا دەکات و لە نزیکەوە لە چۆنیەتی دروستبوون و کەلتوور و فەرهەنگیان شارەزادەبێت. ئاشانی ئەوە دەبێت وڵاتانی وەک کازاخستان و ڤێتنام و لیبیا و ئۆزبەکستان و کۆلۆمبیا و چەندین وڵاتی دیکە، چۆن و بە چ شێوەیەک سیاسەتی بەڕێوەبردنی وڵات و ئابوری و فەرهەنگیان دادەڕێژن. تا لاپەڕەکانی ئەم کتێبە زیاتر هەڵبدەیتەوە، زیاتر لەو قەیران و کێشانە تێدەگەیت کە لە مرۆڤدا بەرۆکی زۆرێک لەو وڵاتانەی گرتووە. لە دووتوێی لاپەڕەکاندا تێدەگەیت، سێ زلهێزەکەی جیهان، واتـە ئەمریکا و ئەورووپای خۆرئاوا و چین، چۆن و بە چ ڕێگایەک، توانا زەبەلاحە ماددیی و سەربازی و ئابورییەکانی خۆیان، بۆ ڕاکێشانی وڵاتانی جیهانی سێیەم، خستووەتە گەڕ و دەیانەوێ بیانهێننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئەگەر وڵاتانی جیهانی یەکەم بریتیبێت لە وڵاتانی سەرمایەدار و پێشکەوتوو و کۆمپانیا زەبەلاحە فرە ڕەگەزەکان، هەروەها ئەگەر وڵاتانی

جیهانی سێیەم بریتیبێت لە وڵاتانی دواکەوتوو یان ئەو وڵاتانەی تازە لەسەر ڕاستە ڕێگای گەشەکردن و پێشکەوتنن، ئەی ئاخۆ دەبێ وڵاتانی جیهانی دووەم چ جۆرە وڵاتگەلێکبن و زیاتر لە کام لەو دوو جیهانەی دیکەوە نزیکترن؟ بە پێی دیدگای نووسەری کتێبەکە، وڵاتانی جیهانی دووەم لە نێوان ئەو دوو جیهانەی دیکەدا دێن و دەچن.
نووسەری ئەم کتێبە پاراگ خان کە لە هندستان لەدایک بووە و یەکێکە لە نووسەرە گەنجەکانی ئەم سەردەمەمان و ئەم کتێبەی لە ساڵی ٢٠٠٨ پڕ فرۆشترین کتێب بووە. گۆڤاری (Esquire) لە لیستێکدا ناوی ٧٥ کەسی نووسیووە کە کاریگەریان لەسەر سەدەی بیست و یەک هەبووە، یەکێک لەو ناوانە پاراگ خانا بووە. ئەم کتێبە لەلایەن کاک هەڵکەوت عەبدوڵڵا سەرکەوتووانە کراوە بە کوردی. لە ٥٥١ لاپەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووە، تیراژی ٦٠٠ دانەیە و نرخی هەشت هەزار دینارە.

## ڤیکۆنتی دوولەتبوو

ئەم ڕۆمانە یەکێکە لە کارە دانسقە و نایابەکانی ڕۆماننوسی ناوداری ئیتالی (ئیتالۆ کالڤینۆ)، کالڤینۆ یەکێکە لە بەناوبانگترین نووسەرەکانی سەدەی بیستەم، ساڵی ١٩٢٣ لە کوبا و لە شاری هاڤانا لەدایکدەبێت و هەر بە منداڵی لەگەڵ خێزانەکەیان دێنە ئیتالیا. ماوەی گەنجییەتی لە شاری سان ریمۆی ئیتالی بەسەردەبات، لەو کاتەدا بەشداری جەنگی ڕزگارکردنی ئیتالیا دەکات دژ بە فاشیزم و نازیزم. لە ژیانیدا چەندین سەفەر و گەشتی ئەنجامداوە و وڵاتگەلێکی زۆری دیوە، بەڵام هەمیشە دڵی بە ئیتالیا کراوەتەوە، ساڵی ١٩٨٥ لە




شاری سینای ئیتالیا کۆچی دوایی دەکات. بایەخ و گرنگی ئەم نووسەرە دوای جەنگی جیهانی دووەم دەردەکەوێت و دەبێتە ناوێکی پرشنگداری دونیای ئەدەب و نووسین.
ئەم ڕۆمانەی بەسەرهاتی جەنگێک دەگێڕێتەوە، بەڵام لەم گێڕانەوەیەدا باس لە کوشت و بڕین وماڵوێرانی ناکات، باس لە دەنگی تۆپ و گرمەی ناپاڵم و تەقەی چەک و چۆڵ ناکات، باس لە کەوتنەوەی ئاگر و سوتاندن و ئاوارەبوونی دەیان و سەدان هەزاران کەس ناکات کە لە جەنگەکانی دیکەدا ڕوودەدەن. لەم جەنگەدا پاڵەوانی ڕۆمانەکە "ڤیکۆنت مێداریۆ تێرئالبا" دەڕوات بۆ بەشداریکردن لە جەنگی دژ بە تورکەکان، هەر کە دەگاتە گۆڕەپانی جەنگەکە، بە هۆی موشەکێکەوە، بە درێژی، واتە لە تەوقی سەریەوە

بۆ بنی پێی، دەبێت بە دوو لەتی یەکسانەوە و هەر لە تەی بەلایەکدا دەڕوات. لێرەوە زەمەنی ڕۆمانەکە و ڕووداوەکانی، باس لە گەشتی ئەو دوو لەتە دەکەن، لەتێکیان گوزارشتە لە خێر و چاکە و ئەوی دیکەیان گوزارشتە لە خراپە و شەڕانگێزی. ئاخۆ ئەم دوو لەتە چۆن و بە چ شێوەیەک مامەڵە لەگەڵە لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەدا دەکەن؟ ئایا ئەوانی دیکە، واتە مرۆڤەکانی دیکە، دەتوانن خۆیان لەگەڵ مرۆڤێکی لەتدا بگونجێنن؟ ئایا ئەم حاڵەتە فەنتازییەی لەتبوونی مرۆڤێک، دواجار چی لێ دێت و چۆن کۆتایی پێدێت؟ ململانێی نێوان ئەم دوو لەتە بە کوێ دەگات و لە کوێدا تەواو دەبێت؟ ئایا ئەم دوو لەتە دواجار یەکدەگرنەوە و مرۆڤە تەواوەکەی پێشتر دروست دەکەنەوە، یان هەر وا بە لەتکراوی دەمێننەوە و هەریەکەیان بە جیا لەوی دیکەیان ژیانی دەگوزەرێنێ؟

لە ڕاستیدا ئەوانە کۆمەڵێ پرسیارن، لەکاتی خوێندنەوە و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەدا دەپەڕنە خەیاڵی خوێنەر، بەڵام تەنها لە کۆتایی ڕۆمانەدا و لەگەڵ خوێندنەوەی دواهەمین دێڕی ڕۆمانەکەدا، وەڵامی تەواوەتیت دەستدەکەوێت. کاتێ لە خوێندنەوەی تەواو دەبیت، هەست دەکەیت لە نێو دونیا و واقیعێکی پڕ فەنتازیا و خەیاڵدا بوویت، وەلێ فەنتازیا و خەیاڵێک کە هیچ دوور نییە لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەکانەوە. کرۆکی سەرەکی ڕۆمانەکە باس لە ئینسانی ئەم سەردەمە دەکات کە لە ناوەوەی خۆیدا، لە قووڵایی ناخیدا، دابەش بووە، دابەشبونێکی کوشندە کە تەنها بەشوێن بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیدا ڕادەکات، لەم پێناوەشدا ئامادەیە نەک دوو لەت، بگرە خۆی بکات بە چەندین لەتەوە و هەر لەتەش بە جۆرێک ڕەفتار بکات. دواجار ماوەتەوە بڵێین ئەم کتێبە لە دەقە فەرەنسییەکەیەوە و لەلایەن وەرگێڕی بە توانا "ئەحمەدی مەلا"وە سەرکەوتوانە و بە بە زمانێکی پاراو کراوە بە کوردی. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ١٧٠ لاپەڕەی بچووکە، تیراژی ١٠٠٠ دانەیە و نرخی سێ هەزار دینارە.




## ڕوونبێژی لە شیعری (مەحوی)دا

ئەم کتێبە کە لە بنچینەدا نامەی ماستەرە لەسەر ڕەوانبێژی لە شیعری (مەحوی)دا. بێگومان مەحوی یەکێکە لە شاعیرە هەرە ناودارەکانی نەتەوەکەمان و یەکێکە لەو شاعیرە کلاسیکییە دەگمەنانەی لە ئێستاشدا ئامادەییەکی گەورە و بەرچاوی هەیە و

شیعرەکانی پڕن لە زیندوویەتی و پڕن لە جوانی و لە سەرسوڕمان. گەرچی زیاد لە دوو سەد ساڵ بەسەر شیعرەکانی ئەم کەڵە شاعیرەدا تێپەڕیووە، کەچی تا بێت گەشتر و جوانتر دەردەکەون و تابێت خوێنەری زیاتر و زیاتر دەبێت و تابێت زیاتر لە کاری گۆرانی و میلۆدیدا بەکاردێت.

ئەم زیندوومانەوەی شیعری مەحوی، ئەوە وایکردووە خوێندکارانی زانکۆ ئاوڕی لێ بدەنەوە و کاری لەسەر بکەن و بیکەنە بابەتی تێزی دەرچونیان. ئەم کتێبەی بەردەستمان هەوڵێکی هێجگار جوانی بەڕێز "هەژار فەقێ سلێمان حسێن"ە کە یەکێک لە لایەنە قورس و زەحمەتەکانی شیعری مەحوی گرتووە، ئەویش مەسەلەی ڕەوانبێژییە. دانەری ئەم کتێبە بۆ دەرخستنی ڕەوانبێژی لای مەحوی، گەشتێکی گەورەی بە نێو ئەو تیۆرە و چەمکانەدا کردووە کە پەیوەستن بە رەوانبێژییەوە، ئا لێرەوە بەشی یەکەمی کتێبەکەی بۆ مەسەلە تیۆرییەکان تەرخان کردووە، ئەمەش کارئاسانییەکی باشە بۆ خوێنەر تا سەرەتا لە زاراوەی ڕوانبێژی و مێژووی سەرهەڵدانی لە دونیای شیعری عەرەبی و بیانیدا تێبگات، پاشان بڕواتە نێو دونیای ڕەوانبێژی لە شیعری کوردیدا بە گشتی و لە شیعری (مەحوی) دا بە تایبەتی.

کتێبەکە دەوڵەمەندە بە شیکردنەوە و لێکدانەوەیەکی وردی مەسەلەی ڕەوانبێژی لە شیعری ئەم شاعیرە کلاسیکییە نەمرەماندا. لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبەکە، تابێت گەورەیی و شارەزایی و دەستڕەنگینی مەحوی-مان بۆ دەردەکەوێت و زیاتر ئاشنای جیهانی پان و بەرفراوانی شیعری ئەم شاعیرە دەبین. ناساندنی باشتری مەحوی لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە، خاڵی هەرە سەرەکی کتێبەکەیە و دەرخستنی هونەری نووسینی شیعرە لای مەحوی. ئەم کتێبە دەروازەیەکی زۆر باشە بۆ ئاشنابوون بە جیهانی ئەم شاعیرەمان کە یەکێکە لە لووتکە بەرزەکانی شیعری کوردی.

ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ٢١٨ لاپەڕەی بچوکە، تیراژی ٥٠٠ دانەیە و نرخی سێ هەزار دینارە.